# موعتەزیلە

سەرهەڵدانیان - گروپەکانیان - بیروڕا و تێڕوانینە فیکرییەکانیان



سەلاح ئەبو سعود

وەرگێڕانی
شاهۆ عومەر عارف

# موعتەزیلە

**سەرهەڵدانیان – گروپەکانیان – بیروڕا و تێڕوانینە فیکرییەکانیان**

**صلاح ئەبو سعود**

**وەرگێڕانی**

**شاهۆ عومەر عارف**

چاپی یەکەم

٢٠١٩

**لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما**

زنجیرە ٨٥٤



ناسنامەی کتێب

# ئەو موعتە زیلە

- نووسینی: صلاح ئەبو سعود
- وەرگێڕانی: شاهۆ عومەر عارف
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- دیزاینی و بەرگ: فواد کەولۆسی
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم
- ساڵی چاپ: ٢٠١٩
- شوێنی چاپ: چاپخانەی گەنج
- تیراژ: ١٠٠٠

**لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە سپاردن: (٢٧١٣)ی ساڵی ٢٠١٩ی پێدراوە.**

---

**ناونیشان**

**سلێمانی ــ سابوونکەران ــ نێوان گەراجی عوسمانی تەمین و شوقەکانی تەکیە رووتە.**

**ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣) (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)**

# پێڕست

**پێشەکی** ........................................ ٩

بەشی یەکەم

**مەبەست لە موعتەزیلە و هۆکارەکانی ناولێنانی چییە؟** ........................ ١٣

بەشی دووەم

**دەرکەوتنی موعتەزیلە و ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی دەرکەوتنی** ........ ٣٥

**پێشەکی** ........................................ ٣٧

بەشی سێیەم

**پێنج بنەمایەکە** ........................................ ٧٧

**پێشەکی** ........................................ ٧٨

بەشی چوارەم

**موعتەزیلە و کایەی سیاسی** ........................................ ١٨١

**پێشەکی** ........................................ ١٨٣

بەشی پێنجەم

**هەڵسەنگاندنی موعتەزیلە** ........................................ ٢١٧

**پێشەکی** ........................................ ٢١٩

**سەرچاوەکان** ........................................ ٢٤١

## موعتەزیلە...

دەستە و تاقمێکی ئیسلامییە بە دید و فیکرێکی نوێوە هاتە مەیدان.. لەپێناو عەدالەت و یەکتاپەرستی خودای گەورەدا بەرگریکرد. بەم دید و فیکرەوە کەوتە مشت و مڕ لەگەڵ نەیارەکانی ئیسلامدا و بەڵگەکانیان پوچەڵکردنەوە و ئاینی ئیسلامیشیان لەسەر ڕووی زەویدا بڵاوکردەوە، سەرباری ئەوە، بڕیار درا بەسەریاندا کە ئەوانە تاقمێکی بیدعەچی و گومڕان.. لەم کتێبەدا بە بیروباوەڕەکانی موعتەزیلە ئاشنا دەبیت، بۆ ئەوەی ببینیت و بزانیت ئایا ئەو بڕیارەی پێشوو دروست و ڕاستە یان ئەوەتا گروپێك بوون و پڕوپاگەندەیان بە دەمەوە هەڵبەستراوە؟!



**پێشکەشە بە:-**

- هـــەموو خوێنـــدکارانی بـــواری فەلســـەفە و زانســـتە ئیسلامیەکان.
- هاوسەری بەوەفا و خۆشەویستم، کـە هەمیشـە هانـدەرم بووە و خۆم بە قەرزداری دەزانم.
- بەو مامۆستایەی سەرەتا دەستی گـرتم و فێـری وانـەکانی ژیانی کردم.
- بەهەموو ئـەو مامۆسـتا و ئازیزانـەی کـە بـە ئامۆژگـاری و تێبینییە بەسودەکانیان هاوکار و هاندەرمبوون.
- گـەنج و لاوانـی خوێنگـەرمی نیشـتیمانەکەم کـە شـەیدای زانستی نوێن.

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ خودا و درود و سلاو بۆ سەر پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) وە بۆ سەر یار و یاوەرانی و شوێنکەوتوانی تا ڕۆژی دوایی.

لەڕاستیدا مەرگی موحەممەد (درودی خودای لێبێت) بۆ موسڵمانەکان تەنها مەرگی ڕێبەر و پێشەوایەکی سیاسی و کۆمەلایەتی نەبوو، بەڵکو مەرگی پەیوەندی بەردەوامی ئەوان بوو لەگەڵ خودا و نیگای خوداییدا، چونکە بە مەرگی ئەو ئیدی وەحی و نیگا کۆتایی هات و کەسێك نەما کە لە ڕووی ئاینییەوە قسەی ئەو ڕاسترین قسە بێت، بۆیە موسڵمانەکان ناچاربوون کە ڕێباز و بیرکردنەوەی جیا پەیڕەو بکەن بۆ یەکلاکردنەوەی ئاریشە و پرسیار و ململانێکانی خۆیان. بۆیە بە مردنی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) موسڵمانان لەوە تێگەیشتن کە چەندین پرس و کێشە هەیە کە بە ئالۆزی بەجێ هێڵراوە، ئەمە جگە لەوەی کە کێشەی تازە و نوێ دێنە ئاراوە و ئەمان دەبێت خۆیان چارەسەری بکەن و بیری لێبکەنەوە.

**خوێنەری ئازیز:** ئەم کتێبەی کە لەبەر دەستدایە باس لە سەرهەڵدانی گروپ و دەستەیەکی ئیسلامی دەکات کە بە گەورەترین گروپی ئەقڵی و کەلامی لە مێژووی ئیسلامیدا هەژمار دەکرێت، هاوکات ڕێبەر و پێشەوایانی ئەقڵگەرایین لەنێو ئەو کلتورەدا، جا باسکردن لە گروپگەلێکی وەك موعتەزیلە بۆ

ئاشنابوونی زیاتره بەو ماجەراییەی کە لەنێو دنیای ئیسلامدا لەو دەمەدا هەبووە، ئەوەی کە لێرەدا شوێنی باسی ئێمەیە، ئەو ژینگەیەیە کە موعتەزیلەی تێدا سەر هەڵ دەدات، ئەو ژینگەیەش بۆ خۆی دوو لایەنی هەیە، یەکەم خودی ئیسلام، واتە "ئایەتەکانی قورئان و بیروباوەڕە ئیسلامیەکان"، هەروەها لەگەڵ ئەو ژینگە کلتوورییە ناوخۆییەی کە موسڵمانەکان تێیدا دەژیان و کاریگەری ئەم ژینگەیە لەسەر دروستبوونی مشتومڕ سەبارەت بە بیروباوەڕە ئاینیەکان ... هتد. لایەنی دووەمیش ئاینی ئیسلام لەبەرامبەر ئاین و بیروباوەڕەکانی دیکە و موسڵمانەکان لەبەرامبەر خاوەن ئاین و بیروباوەڕەکانی تردا.

هەرچی لایەنی یەکەمە ئەوا موعتەزیلەکان مانا و لێکدانەوەی جودایان بۆ ئایەتەکان هەیە و تەواوی ئایەتەکانی قورئان لە ڕێگەی ئەقڵەوە ڕاڤە دەکەن و تەئویلیان بۆ دەهێننەوە، لێرەوە لەگەڵ پەیڕەوانی سەلەف کەوتنە دەرگیری یەکتر و لێرە و لەوێ هەندێ جار تۆمەتیشیان دەدایە پاڵ یەکدی. سەبارەت بە لایەنی دووەمیش مشتومڕی موسڵمانان بوو لەبەرامبەر ئاین و بیروباوەڕە جۆر بە جۆرەکاندا، بە تایبەت کاتێك کە فتوحاتی ئیسلامی هێدی هێدی گەشەی دەکرد و تا دەهات ناوچە و وڵاتی دیکە دەهاتنە ژێر ڕکێفی سوپای موسڵمانانەوە، ئەوەندەیان زانی تێکەڵ بە چەندین کلتور و بیروڕا و ئاینی جیاواز بوونەتەوە، جا بەهۆی ئەوەی کە مشتومڕ لەگەڵ ئەو جۆرە مرۆڤانەدا ئەنجامێکی ئەوتۆی لێنەکەوتەوە، چونکە ئەوان هەر لەڕێوە بڕوایان بە بەڵگەی نەقڵی ـ قورئان و فەرموودە ـ نەبوو، وە ئینکاری قورئانیشیان دەکرد، بگرە ئینکاری پێغەمبەرایەتی موحەممەدیشیان (درودی خودای لێبێت) دەکرد، پێویست بوو موسڵمانان بەهەمان چەکی ئەوان کە پشتیان پێ بەستبوو

ڕووبەڕوویان ببنەوە، ئەویش میتۆدی فەلسەفە بوو، چونکە خاوەن ئایدیاکانی دی شارەزابوون لە زانستەکانی فەلسەفە و دەیانزانی چۆن مشت و مڕ لەگەڵ بەرامبەردا ئەنجام بدەن. بۆیە موعتەزیلەکانیش بەو ڕۆحیەتەوە دەستیاندایە خوێندنی زانستە فەلسەفیەکان و بەهەمان ئەو چەکەی ئەوان بەکاریان دەهێنا ڕووبەڕوویان وەستانەوە، لەو پێناوەشدا چەندین دیدار و ڕووبەڕووبوونەوەیان لەگەڵدا ئەنجامدان و توانیان زۆر ژیرانە هەموو ئەو بەڵگانەی ئەوان دەیانهێناوە پووچەڵ بکەنەوە، ئەمەش وایکرد هەزاران کەس لە ئاین و بیروباوەڕە جوداکان بێنە ناو ئاینی ئیسلامەوە و موسڵمان بوونی خۆیان لەسەر دەستی ئەواندا ڕاگەیەنن. تەنانەت بۆ پارێزگاریکردن لە ئاینی ئیسلام لەلایەك و بڵاوکردنەوەی بیری موعتەزیلە لەلایەکی ترەوە، چەندین پیاویان نارد بۆ ناوچە جیاوازەکانی خاکی ئیسلام، بۆ ئەوەی مەزهەبەکەیان بڵاوبێتەوە.

ئەوەی لەم پێشەکیەدا دەمەوێت بیڵێم ئەوەیە چی مەزهەب و بیروڕاو ئایدیا هەیە خاڵ نییە لە چەوتی و خەوش و خاڵ، چونکە کەماڵ و بێ خەوشی تەنها بۆ زاتی پەروەردگارە، لێرەوە موعتەزیلەش وەك هەر گروپ و دەستەیەکی تر پشکی لەو خەوشانەدا هەبووە، ئەوەبوو هەر زوو لەنێو خۆیاندا بوونە چەند بەشێك و لێرە و لەوێ قوتابخانە و گروپی دیکەیان دروست دەکرد و بڕوای سەیر و سەمەرەیان دەهێنایە گۆڕێ، تا گەیشتە ئەوەی هەندێ جار لەنێو خۆیاندا تەکفیری یەکتریان دەکرد.

**خوێنەری ئازیز:** ئەم کتێبەی کە لە بەردەستدایە باس لە سەرهەڵدانی بیری موعتەزیلەکان دەکات و لە پێنج بەش پێکهاتووە، هەموو بەشێکیش پێشەکی تایبەت بە خۆیی هەیە:

له بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا نوسەر باس لە سەرەتای ناو و ناونانی موعتەزیلە دەکات و لەڕووی مێژووییەوە پۆلێنیان دەکات، دواتر ڕای پەسەند لەو بارەوە دەخاتە ڕوو، لەبەشی دووەمیشدا باس لە دەرکەوتنی موعتەزیلە دەکات لەگەڵ ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی دەرکەوتنی بیری موعتەزیلە، هەرچی بەشی سێهەمیشە ئەوا باس لە پێنج بنەماکەی موعتەزیلە دەکات کە لەسەری دروست بووە، کە بریتین لە بنەماکانی " التوحید، العدل، الوعد و الوعید، المنزلة بین المنزلتین، الأمر بالمعروف و النهي عن المنكر" لەگەڵ چەندین مەسەلەی تایبەت کە پەیوەندیان بەو بنەمایانەوە هەیە، سەبارەت بە بەشی چوارەمی کتێبەکە، باس لەچوونە ناوەوەی موعتەزیلەکان دەکات بۆ نێو کایەی سیاسی، ئەمەش لە پێناو زووتر بڵاوبوونەوەی مەزهەبەکەیاندا، ئەمەش بۆ خۆی هۆکاری پووکانەوە بوو کە بەسەریاندا هات، دوایین بەشیش کە بەشی پێنجەمی ئەم کتێبەیە نوسەر ـ کە وەك لایەنگیری بیری موعتەزیلە تیایدا دەبینرێ ـ هەڵسگاندن بۆ بیری موعتەزیلەکان دەکات و چەند پرسێك لەو بارەوە شەن و کەو دەکات.

لەکۆتاییدا ئەمەوێت ئەوە بڵێم بە پێویستم زانی لە بارەی کەلامەوە بەرهەمێك پێشکەش بەو خوێنەرانە بکەم کە دەیانەوێت زیاتر شارەزابن لە بواری فەلسەفە و زانستە ئیسلامیەکاندا، هاوکات بە لە خۆبردنیشەوە خزمەتێك بێت بە کتێبخانەی کوردی، بەو هیوایەی توانیبێتم سوودێك بە هەمووان بگەیەنم.

شاهۆ عومەر عارف

٢٠ / ٨ / ٢٠١٧

هەڵەبجە

پێش ئەوەی بچینە نێو ناوەڕۆکی باسەکەوە، پێویستە ئەوە بزانین موعتەزیلە کێن و لە کوێی ئەم باسەدان، هەندێك دەڵێن موعتەزیلە ئەوانەن کە خۆیان جیاکردەوە و بەشدارییان لەو ئاشوب و فیتنەیەدا نەکرد کە لەنێوان عەلی کوڕی ئەبو طالب "خودای لێ ڕازی بێ" و نەیارەکانیدا ڕوویدا، هەندێکی دیکەش مەبەستیان پێی موعتەزیلەی کەلامیە - کە ئەمەش باس و خواستی ناوەڕۆکی ئەم بابەتەیە کە باسی لێوە دەکەین - ئێستاش تیشك دەخەینە سەر هەردوو بۆچوونەکە.

## • موعتەزیلەی فیتنە:

لە زۆربەی کتێبە مێژووییەکاندا ناوی موعتەزیلە هاتووە، بەڵام ئەم ناوە لەو کاتەدا بۆ ئەوە بەکار نەهاتووە کە موعتەزیلە وەك مەزهەبێکی دینی بناسێنێت کە یاسا و ڕێسای تایبەت بە خۆی هەبێت، بەڵکو لەبەرامبەر ئەو کەسانەدا بەکار هاتووە کە هەڵوێستیان لەبەرامبەر ئەو دوو دەستە و تاقمە جەنگکەرەدا نەرێنی بوو[1].

دیارترین نمونەش لەسەر ئەم هەڵوێستە نەرێنی یە ئەو کۆمەڵە بوو کە بەیعەتیان بە عەلی کوڕی ئەبو طالب نەدا "خودای لێ ڕازی بێ" و ڕەتیانکردوە لەگەڵیدا بەشداری بکەن لەهەر دوو جەنگی جەمەل و صففیندا[2].

---

[1]- بڕوانە أحمد أمین - فجر الإسلام - ل ٤٥٩ - دار النهضة المصریة - القاهرة - ١٩٨٨.

[2]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

پاش ئەوەی بەیعەت درا بە عەلی کوڕی ئەبو طالب، ناردی بە دوای سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص و عەبدوڵلای کوڕی عومەر و موحەممەدی کوڕی مەسلەمەدا و وتی: پێم گەیشتووە کە وتوتانە بەیعەت نادەین، سەعد وتی: ڕاستیانکردووە، بەیعەتت پێ نادەم و لەگەڵیشت دەرناچم، هەتا شمشێرەکەی خۆتم نەدەیتێ و پێم نەڵێی کامیان بڕوادارە و کامیان بێباوەڕ، ئیبن عومەریش پێی وتووە: سوێندت دەدەم بەخودا و بەو ڕەحمیانەتەی کە لەنێوانماندا هەیە زۆرم لێنەکەی لەسەر شتێ کە نازانم ئەنجامەکەی چۆنە، سوێند بەخودا بەیعەت نادەم هەتا موسڵمانان کۆنەبنەوە لەسەر ئەوەی کە خودا لەسەری کۆیکردونەتەوە، موحەممەدی کوڕی مەسلەمەش وتی: پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) فەرمانی پێ کردووم گەر هاوەڵەکانم ناکۆکیان تێکەوت لایەنگری هیچ یەکێکیان نەکەم و شمشێرەکەم بکێشم بە بەردێکدا و بیشکێنم، بۆیە دەچم لەماڵەوە دادەنیشم و ناچمە نێو هیچ بەرەیەکەوە تا ئەو کاتەی دەستێکی هەڵە دێت و ئەمکوژێت، یان ئەوەتا مردنم پێ دەگات. منیش ئەوەم کردووە[٢]:

ئەم هاوەڵانە و چەند هاوەڵێکی دیکەش بەو شێوەیە لەبەرامبەر ڕووداوە سیاسیە جۆرا و جۆرەکانی دەورووبەریاندا، هەڵوێستی بێلایەنیان گرتەبەر و خۆیان کەنارگرت لە ڕووداوەکان و ئیعتیزالیان لە هەموویان کرد، چونکە بۆیان یەکلا نەببوویەوە کێ لەسەر حەقە و کێش لەسەر ناحەقە، ئەوەبوو خەلیفە عوسمان کوژرا و خەڵکیش لەنێوان خۆیاندا دابەش بوون بەسەر دوو بەرەدا، ئایا خەلیفە عوسمان لەسەر حەق بووە یان بکوژەکانی؟

---

[٢]ـ الحافظ بن أحمد أبي حاتم محمد بن حيان ـ السيرة النبوية و أخبار الخلفاء ـ ل ٣٠٥ ـ تحقيق و مراجعة سعد كريم الفقي ـ دار إبن خلدون ـ بيروت.

ئایا عەلی دەیتوانی خەلیفە عوسمان بپارێزێ یان کەمتەرخەمی کرد و نەیپاراست؟.

ئینجا هەندێك هاتن و داوای خوێنی خەلیفە عوسمانیان دەکرد و بە دوای ئەویشدا جەنگی جەمەل ڕوویدا کە لەنێوان عەلی لە لایەك و خاتوو عائیشە و طەڵحە و زوبێر لەلایەکی تردا، پاش ئەویش جەنگی صففین هاتە ئاراوە کە لە نێوان بەرەی عەلی و موعاویەدا ڕوویدا، هەموو ئەمانەش زیاتر خەڵکەکەی دووچاری پەرێشانی کرد بوو، نەیاندەزانی کام یەك لەو دوو دەستەیە لەسەر حەقە، بۆیە خەڵکەکە ئیعتیزالیان لە هەموو ئەو ڕووداوانە کرد و خۆیان لێ کەنار گرتن، تەنانەت ئەم دیاردەی ئیعتیزال و کەنار گرتنە تەواوی ناوچەکانی دیکەی گرتبوویەوە، ئەوەتا قەیسی کوڕی سەعد کە ـ کاربەدەستی عەلی بوو لە میصر ـ نامەی نوسی بۆ عەلی و تیایدا پێی وت: (بەناوی خودای گەورە و میهرەبان.. پاشان ئەوا ئەمیری ئیمانداران ئاگادار دەکەمەوە خودا بیپارێزێ کە کۆمەڵە خەڵکێك لێرە خۆیان جیاکردووەتەوە و ئیعتیزالیان کردووە لە ئاست ڕووداوەکاندا، داوای ئەوەشیان لێکردووم کە وازیان لێ بهێنم و لێیانگەڕێم لەسەر ئەو حاڵەتەی کە بڕیاریان لەسەر داوە، تا ئەو کاتەی کاروباری موسڵمانان یەکلایی دەبێتەوە، ئێمەش ئەو کاتە بۆچوونی خۆمان دەردەبڕین، بۆیە منیش پێم باش بوو دەستیان لەسەر هەڵگرم و زۆریان لێ نەکەم و پەلەشیان لێ نەکەم لە جەنگکردندا[4]).

تەنانەت ئەوانەش کە لە بەرەی عەلیدا بوون و جەنگیان دەکرد، پەرێشان ببوون و ڕامابوون لەو هەڵوێستەی گرتبوویانە بەر و نەیاندەزانی ئایا

---

[4] ـ الطبري ـ تأريخ الأمم و الملوك ـ تحقيق محمد أبو الفضل إبراهيم جـ ٤ ـ ل ٥٥٤ ـ دار المعارف ـ ١٩٧٦.

هەڵوێستەکەیان دروستە و لەسەر حەقن یان ئەوەتا هەڵوێستەکەیان بەتاڵە و ناحەقیان هەڵبژاردووە، ئەوەبوو ئیبن جەرموز ـ لە جەنگی جەمەل دا ـ زوبێری کوشت، ئەوجا هات بۆ لای عەلی و هەواڵی کوشتنی زوبێری پێدا، عەلیش وتی: لە پێغەمبەری خودام (درودی خودای لەسەر بێت) بیستووە دەیفەرموو: بکوژی ئیبن صەفیە ـ زوبێر ـ لە ئاگردایە، ئیبن جەرموزیش وتی: گەر لەگەڵ ئێوەدا دژ بەوان بجەنگێین لە ئاگرداین: گەر لەگەڵ ئێوەشدا بجەنگێین هەر لە ئاگرداین، بۆیە شمشێرەکەی خۆی کرد بەسکی خۆیدا و خۆی کوشت[°].

تا ئەم ڕادەیە دوو دڵی و ڕاڕایی لەنێو خەڵکیدا دروست ببوو، بۆیە زۆر ئەستەم بوو کەسێك بتوانێ بڕیارێکی ئەرێنی بگریتە بەر لە بەرامبەر ئەو ئاشوب و فیتنەیەی کە هەڵگیرسابوو، بۆیە ئەمانە "موعتەزیلەی فیتنە" سەلامەتیان هەڵبژارد و خۆیان کەنار گرت لە هەموو ئەو ڕەوتانەی کە لەگەڵ یەکتردا جەنگیان دەکرد، لە ترسی ئەوەی نەبادا خۆیان بدەنە پاڵ ڕەوتێك و دواتر ئەو ڕەوتە "تاقمە لە سنوور دەرچووەکە" بێت و بەهۆیەوە خەسارۆمەندی دونیا و ئاخیرەت بن.

لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە "موعتەزیلەی فیتنە" لە ڕواڵەتدا هەڵوێستیان سیاسی بوو، لەناوەڕۆکیشدا هەڵوێستیان هەڵوێستێکی دینی بوو، لەڕاستیدا ترسی ئەوەیان هەبوو کە لە دواڕۆژدا خەسارۆمەند بن، بەڵام ناتوانین ئەوە بڵێین کە "موعتەزیلەی فیتنە" مەزهەبێکی دینیان هەبووە، کە تیایدا بنەما و ڕێسای تایبەت بە خۆیان هەبووە جیاواز لە هەموو مەزهەب و ئاینەکانی تر.

---

[°] ـ محمد بن حیان ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ ل ٣١٤.

## • موعتەزیلەی کەلامی:

ئەم قوتابخانەیە لەسەر پێنج بنەما دادەمەزرێت، هەر کەس باوەڕی بەم پێنج بنەمایە هەبوو ئەوە بە موعتەزیلە هەژمار دەکرێت، بنەماکانیش بریتین لە: (التوحید، العدل، الوعد و الوعید، المنزلة بین المنزلتین، الأمر بالمعروف والنهي عن المنکر[٦]) واتە: (یەکتاپەرستی، دادپەروەری، پاداشت و سزا، شوێنێك لەنێوان دوو شوێندا، ئەمر بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە)، بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە ئاراوە، ئایا چ هۆکارێك وایکرد ئەم ناوەیان لێ بنرێت، ئایا پەیوەندی لە نێوان موعتەزیلەی کەلامی و موعتەزیلەی فیتنەدا هەیە؟ پرسیار گەلێك دێتە ئاراوە کە پشت بە خودا لە لاپەڕەکانی داهاتوودا وەڵامی یەك بە یەکی ئەو پرسیارانە دەدەینەوە.

## • هۆکاری ناولێنانەکە:

سەبارەت بەهۆکاری ناونانی موعتەزیلە چەند ڕایەك هەیە، شەهرستانی دەڵێت: (... ڕۆژێك کابرایەك هاتە لای حەسەنی بەصری[٧] و وتی: پێشەواکەی دین! لای ئێمە کۆمەڵێك پەیدابوون دەڵێن: هەر کەسێك گوناهێکی گەورە ئەنجام بدات پێی کافر دەبێت و لە ئوممەتی ئیسلام پێی دەچێتە دەرەوە، ئەوانەش بە "وعیدیة الخوارج" ناسراون، کۆمەڵێکی دیکەش هەن بڕوایان وایە ئەوانەی گوناهی گەورەیان هەیە هیچ زیانێکی بۆ باوەڕیان نییە و پێی بێباوەڕ

---

[٦] ـ إبن حزم ـ الفصل في الملل و الأهواء و النحل ـ جـ٢ ـ ل ٨٩ ـ دار المعرفة ـ بیروت ـ ١٩٧٥.

[٧] ـ حەسەنی کوڕی ئەبو لحەسەنی بەصری لەساڵی (١١٥ك ـ ٧٢٨م) مردووە، پێشەوای خەڵکی بەصرە بووە ـ موعتەزیلەکان لەنێو پیاوانیاندا لە چینی سێهەمدا هەژماریان کردووە، بڕوانە: ـ إبن خلکان ـ وفیات الأعیان و أنباء أهل الزمان ـ جـ١ ـ ل١٨٠ ـ القاهرة ـ ١٧١٠ ك.

نابێت، وە زانستیش لای ئەوان پایەیەك نییە لەپایەکانی ئیمان و باوەڕ، بۆیە دەڵێن: (لایضر مع الإیمان معصیة، کما لا ینفع مع الکفر طاعة) واتە: "هیچ گوناهێك زیان نادات لە ئیمان، وەك چۆن لەگەڵ کوفردا هیچ گوێڕایەڵیەك سود و کەڵکی نییە!!" ئەو کۆمەڵەش بە "مرجئـة الأمة" ناسراون، جا قوربان حوکمی جەنابت چی یە و دەبێت ئێمە عەقیدە و بیروباوەڕمان لەم مەسەلەیەدا چۆن بێت؟ حەسەنی بەصری ماوەیەك کەوتە بیرکردنەوە، پێش ئەوەی وەڵام بداتەوە "واصلی کوڕی عەطاء[8]" هەڵیدایە و وتی: من ئەڵێم ئەو کەسەی کە خاوەنی گوناهی گەورەیە نە کافری تەواوە، نە بڕواداری تەواو، بەڵکو لە پلەیەکدا لە نێوان هەردووکیاندا - منزلة بین المنزلتین - ئینجا هەستا و چووە پاڵ پایەیەك لەپایەکانی مزگەوت و خۆی جیاکردەوە، بەم هەڵوێستەی ویستی وەها وەڵامی هاوەڵانی حەسەنی بەصری بداتەوە، کاتێ حەسەنی بەصری ئەمەی بیست، وتی: "اعتزل عنا واصل" واتە: واصل خۆی لێمان جیاکردەوە، ئیتر بەهۆی ئەوەوە "واصل" و هاوەڵانی ناوی موعتەزیلە درا بە باڵایاندا[9]. "ئیسفرایینی"ش هەمان ڕاوبۆچوونی شەهرستانی هەیە کە لەبارەیانەوە

---

[8] - ئەبو حوذەیفە واصلی کوڕی عەطاء. (١٢١ - ٨٠ ك = ٧٤٨ - ٦٩٩م) یەکێکە لە پێشەوایانی زانستی کەلام، نازناوی (غزَّال) ی لێنرابوو، واتە شت چن، چونکە لە بازاڕی پیشەوەرانی ڕستن و چنیندا زۆر دادەنیشت تا ئافرەتە پاکداوێنەکانی پێ بناسێتەوە، بۆ ئەوەی دەستگرۆییان بکات، واصل نەیدەتوانی پیتی - ڕ - بە جوانی دەربیڕێت، بەڵام لەبەر لێهاتوویی لەکاتی قسەکردنیدا نیازی بە پیتی - ڕ - نەبوو، لەو بارەوە وتارێکی بەناوبانگیشی هەیە کە تیایدا بە هیچ جۆرێك پیتی - ڕ - ی تێدا دەرنەبڕیوە و خۆی لێ پاراستووە، بڕوانە: - معجم الأدباء - یاقوت الحموي - جـ ١٩ - القاهرة، یان بڕوانە: - وفیات الأعیان - جـ٤.

[9] - الشهرستاني - الملل و النحل - تحقیق محمد فرید - بەشی یەکەم ل ٦٨ - المکتبة التوفیقیة - القاهرة.

وتویەتی، پاش ئەوەی ڕاوبۆچوونی هاوەڵان و خەواریج لەبارەی فاسیقەوە دەهێنێ، دەڵێ: (واصل پێچەوانەی هەر دوو ڕاکەیە و دەڵێ: فاسق لە دونیادا نە بڕواداری تەواوە، نە کافری تەواویشە، بەڵکو لە شوێنێکدایە لە نێوان دوو شوێندا، بڕیاریشیان لای خودا ئەوەیە لە پاشە ڕۆژدا لەگەڵ کافراندا بە هەمیشەیی لە ئاگردا دەمێننەوە، هەر کەس لەوانەش پێش ئەوەی لەدونیا دەرچێت و تەوبە بکات و بگەڕێتەوە، دروست نییە بۆ خودا لێی خۆش بێت، ئەم ڕایەش پێچەوانەی ڕای موسڵمانان بوو بە گشتی، بۆیە خۆی لە موسڵمانان جیاکردەوە، حەسەنی بەصریش لە کۆڕ و کۆبوونەوەکەی کردیە دەرەوە، ئیتر لەگەڵ هاوەڵەکانیدا خۆیان لە حەسەنی بەصری جیاکردەوە و ناویان لێنان "موعتەزیلە"، چونکە خۆیان لە موسڵمانان جیاکردەوە[10]).

یەکێك لە ڕۆژهەلاَتناسەکان بەناوی "جولد تسیهر[11]" بۆچونێکی تری هەیە لەبارەیانەوە کە دەڵێ: (بۆیە پێیان وتراوە موعتەزیلە چونکە کەسەکانی سەرەتایان وەك واصلی کوڕی عەطاء و عەمری کوڕی عوبێد و جەعفەری کوڕی موبەشیر و جەعفەری کوڕی حەرب وازیان لە دونیا هێنابوو، زیاتر حەزیان لە ژیانی خۆ ڕەتاندنەوە و دونیا نەویستی دەکرد[12]). بۆ چوونی سێهەمیش کە

---

[10]- الأسفراييني - التبصير في الدين - ل ٦٦ - تحقيق محمد زاهد الكوثري. - القاهرة - ١٣٥٩ك.

[11]- جولد تسیهر (١٨٥٠ - ١٩٢١م) لە ساڵی ١٨٧٣ میلادیدا لە کۆلێژی زانستەکان لە زانکۆی "بودابست" وەك وانەبێژ وانەی وتووەتەوە .. پاشان پەیوەندی بە ئەزهەرەوە کردووە و لەسەر دەستی "شێخ موحەممەد عەبدە" وانەی خوێندووە، لە بارەی ئیسلام و موسڵمانانەوە چەندین کتێبی نوسیووە، بڕوانە: د. سعيد مراد - مدرسة البصرة الإعتزالية - ل٢١ - پەراوێزی ٥٨ - القاهرة - ١٩٩٢م.

[12]- زهدي حسن جار الله - المعتزلة - ل٣ - مطبعة مصر - القاهرة - (١٣٦٦ك / ١٩٤٧م) - مدرسة البصرة الإعتزالية - هەمان سەرچاوەی پێشوو - ل٢١.

بۆچوونی مەسعودیە ـ کە یەکێکە لەپیاوانی موعتەزیلە ـ دەڵێ: (بۆیە پێیان دەوترێت موعتەزیلە چونکە بڕوایان وابوو خاوەنی گوناهی گەورە نە بڕواداری تەواوە، نە بێباوەڕی تەواو، بەڵکو لەشوێنێکدایە لە نێوان دوو شوێندا ـ المنزلة بين المنزلتين ـ[13]).

بۆچوونێکی دیکەش هەیە کە بۆچوونی "ئەحمەد ئەمینە" بەلآم دواتر لێی پاشگەز بووەتەوە، ئەویش ئەوەیە کە دەڵێ: (لەچاپی یەکەمی ئەم کتێبەدا بۆچوونێکم ترم هەبوو سەبارەت بەناولێنانی موعتەزیلە، ئەویش ئەوەبوو بۆیە پێیان دەوترێت موعتەزیلە چونکە جولەکە ئەم ناوەی لێنابوون، ئەویش بە پشت بەستن بە وشەی ـ الفروشيم ـ کە لە زمانی عەرەبیدا بە واتای ـ الإعتزالي ـ دێت، بۆیە وتم لەوانەیە ئەم ناوە خەڵکێك ئەم ناوەی بڕیبێ بە بالآیاندا پێشتر جولەکە بووبن و دواتر موسڵمان بووبن، ئەویش بە هۆی ئەوەی لێکچوون لەنێوان ئەم دوو تاقمەدا هەبووە لەبارەی قەدەر و شتانگەلێکەوە بۆیە ئەم ناوەیان بڕیوە بەسەریاندا، بەلآم دوای تێڕامان و وردبوونەوە خۆم لەو بۆچوونە لادا و لێی پاشگەز بوومەوە[14]).

کەواتە پاش ئەم خستنە ڕووە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە سێ بۆچوون هەیە هەوڵ دەدات ئەوە ڕەتکاتەوە کە هۆکارێکی دیاریکراو هەبێ لەبارەی ناولێنانەکەیەوە، بۆچوونی یەکەم دەڵێ: هۆکاری ناوناکەی بریتی یە لە جیابوونەوەی واصلی کوڕی عەطاء لە کۆڕ و کۆبوونەوەکەی حەسەنی بەصری، بۆچوونی دووەمیش هۆکاری ناولێنانیان دەگێڕنەوە بۆ حاڵەتی خۆڕەتاندنەوە

---

[13] ـ المسعودي ـ مروج الذهب ـ جـ٢ ـ ل١٧٤. تحقيق ـ محمد محيى الدين ـ دار الكتاب اللبناني ـ بيروت (١٩٦٦م).

[14] ـ أحمد أمين ـ فجر الإسلام ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٤٥٨ ـ پەراوێزی ٢.

و دونیانەویستی کە موعتەزیلەکان خۆیان لەدونیا داڕنیبوو، سەبارەت بە بۆچوونی سێهەمیش دەیگێڕنەوە بۆ ئەو بۆچوونەی کە بڕوای بە (المنزلة بين المنزلتين) هەیە بۆ مرۆڤی گوناهکاری گەورە، وەك ئەوەی لە پێشەوە باسمان کرد، بەڵام ئەیا ڕای بەهێز سەبارەت بە هۆکاری ناولێنانی موعتەزیلە بەو ناوەوە کامەیە؟.

## • ڕای پەسەند سەبارەت بە هۆکاری ناو لێنانەکە:

سەبارەت بە دوایین بۆچوون کە ئەحمەد ئەمین هەیبوو ئەوە لێی پاشگەز بوویەوە، بەڵام ڕاوبۆچوونی ڕۆژهەڵاتناس "جولد تسيهر" ئەوە ناکرێت پشتی پێ ببەستین، چونکە ئیعتیزال یان خۆکەنارگرتن تەنها جوڵەیەك نەبووە لە بواری دونیا نەویستی و خۆ ڕەتاندنەوەدا تا ئەو ناوەی لێ بنرێت، بەڵکو موعتەزیلە بە پلەی یەکەم ڕەوتێکی ئیسلامی ئەقڵانی بووە، هەرچی بۆچوونی مەسعودیشە - کە یەکێکە لە پیاوانی موعتەزیلە - ئەوە تەئویلی ناوەکەی کردووە تا فەزڵ و گەورەیی موعتەزیلە دەربخات، ئەوەی ئەویش پێی هەستاوە هەمان ئەو کارەیە کە ئیبن مورتەزا[15] لە کتێبەکەیدا بە ناوی - المنية و الأمل - پێی هەستا، کە تیایدا وەك بەرگریکردن وابوو لە ناوەکە و هاوکات وەڵامدانەوە و بەرپەرچدانەوە بوو دژ بە بەغدادی - کە دەڵێ بۆیە ئەم ناوەیان دراوەتە پاڵ، چونکە خۆیان دوورە پەرێز گرتووە لە ڕاوبۆچوونی سەرجەم زانایانی

---

[15]- ئەحمەدی کوڕی یەحیای کوڕی مورتەزا، لەساڵی ٦٤٠ کۆچی مردووە و یەکێك بووە لە موعتەزیلەکان، بە زۆری لە کتێبەکەیدا - المنية و الأمل - پشتی بەستووە بەو کتێبە موعتەزیلانەی کە لەناوچوون و ئێستا لەبەردەستدا نین، بڕوانە - زهدی جار الله - المعتزلة - ل٢٧٠ - هەمان سەرچاوەی پێشوو.

ئوممەت ـ ئیبن مورتەزاش لە وەڵامیدا دەڵێ: (موعتەزیلە خۆیان ئەم ناوەیان بڕیوە بە باڵای خۆیاندا نەك كەسانی تر، هەروەها پێچەوانەی ڕاوبۆچوونی سەرجەم زانایانی ئوممەتیش نەوەستاونەتەوە، بەڵكو كاریان بۆ ئەوە كردووە كە لە سەرەتای ئیسلامدا لەسەری كۆكبوون، گەر پێچەوانەی شتێكیشیان كردووە ئەوە پێچەوانەی ئەو ڕاو بۆچوونە داهێنراوە تازانە وەستاونەتەوە كە دایان هێناوە و ئەمان خۆیان لێ جیاكردووەتەوە[16]).

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت موعتەزیلە ئەم ناوەیان بەلاوە گەورە نەبووە، بەڵام هەوڵیانداوە لەڕێگەی بەڵگەوە فەزڵ و گەورەیی ناوەكە بخەنەڕوو[17].

سەبارەت بەڕاو بۆچوونی یەكەمیش كە پێی وابوو هۆكاری ناونانی موعتەزیلە بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە چونكە "واصل" لە ئەڵقە و كۆڕی حەسەنی بەصری خۆی جیاكردەوە، ئەوە ئەحمەد ئەمین ئەم ڕایە بە لاواز دادەنێت و دەڵێ:... ئەم ڕاو بۆچوونە لە چەند ڕوویێكەوە لاوازە!

یەكەمیان: كەنارگرتن و خۆجیاكردنەوەی واصل یان عەمری كوڕی عوبێد[18] لەئەڵقە و كۆڕی حەسەنی بەصری لە مزگەوتدا بۆ جێگایەكی دیكە، شتێكی ئەوەندە گرنگ نییە كە دروست بێ ناوی گروپێك یان تاقمێكی پێ بنرێ بە قەدەر ئەوەی ناو لێنانەكە پەیوەندی بە ناوەڕۆكەوە هەیە نەك لایەنی دەرەوە.

---

[16]ـ إبن المرتضى ـ المنية و الأمل في شرح كتاب الملل والنحل ـ ل ٢ ، ٤ ـ طبعة حيدر آباد ـ ١٩٠٢، بڕوانە: زهدی جار الله، ل٤.

[17]ـ زهدی جار الله هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل ٥.

[18]ـ عەمری كوڕی عوبێدی كوڕی باب، باب یەكێك بوو لە كۆیلەكانی بابل لە ناوچەی بەڵخ ـ لەساڵی ٨٦ كۆچی لەدایكبووە و لەساڵی ١٤٤ كۆچی مردووە، لە خەلیفە ئەبو جەعفەری مەنصوور زۆر نزیكبووە و هاودەمی واصلی كوڕی عەطائیش بووە.

دووەم: جیاوازی ڕیوایەتەکان لە ڕاوییەکەوە بۆ ڕاوییەکەی تر، هەندێکیان ئەم ڕووداوی خۆ کەنارگرتنە دەدەنە پاڵ عەمری کوڕی عوبێد و هەندێکی تریش دەیدەنە پاڵ واصل، هەندێکی تریش دەڵێن حەسەنی بەصری ئەم ناوەی بڕیوە بە بالآیاندا، هەندێکی دیکەش دەیگێڕنەوە بۆ قەتادە، ئەمەش ـ بێگومان ـ ڕیوایەتەکە لاواز دەکات و دەیکاتە مایەی ڕەخنە.

سێهەم: زۆرێك لە کتێبەکان کە لەبارەی کەسێکەوە ئەدوێ دەڵێ: بۆچوونی ئیعتیزالی هەبووە، یان یەکێکە لە ئەهلی ئیعتزال، ئەمەش بۆ خۆی ئەوە دەگەیەنێت ناوی ئیعتزال مەزهەبێکە لە مەزهەبەکان و بۆ خۆی بنەما و ڕێسای تایبەت بە خۆی هەیە، نەك تەنها لەوەدا کورتی کەیتەوە کە جیابوونەوەیەکە لە کۆڕ و مەجلیسێکەوە بۆ کۆڕ و مەجلیسێکی تر، بەڵکو ئیعتیزال ماناکە لە ماناکان نەك بریتی بێت لە جوڵەیەکی جەستەیی[19].

لە ڕاستیدا ئێمە ڕای جیاوازمان لەگەڵ ئەحمەد ئەمیندا هەیە لەو ڕووەوە، چونکە ئەم هەواڵەی ـ کە واصل خۆی لەئەڵقە و کۆڕ و مەجلیسەکەی حەسەنی بەصری جیاکردەوە ـ لە زۆربەی کتێبە مێژوویی و کتێبەکانی تریشدا ئاماژەی پێکراوە و ڕیوایەتکراوە، بەڵام سەبارەت بەو هەڵەیەی جارێك دەدرێتە پاڵ واصل یان عەمری کوڕی عوبێد، ئەوە زیاتر بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە هەردووکیان زۆر لەگەڵ یەکتردا تێکەڵ بوون و یەکترییان خۆش ویستووە و هەمیشە بەیەکەوە بوون، بۆیە لێرەدا ئەو هەڵەیە دروست بووە، بەڵام ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەیە ئەم ڕووداوی گواستنەوەیە لە ئەڵقە و کۆڕی حەسەنی بەصریدا ڕوویداوە. پاشان ئەم بەڵگەیەش ئەم ڕاو بۆچوونە لاواز ناکات، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە لەڕاستیدا تەنها ئەوە نەبووە لەشوێنێکەوە

---

[19] ـ فجر الإسلام ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٤٥٦.

بگوێزێتەوە بۆ شوێنێکی تر، بەڵکو مەبەستی "واصل" لێرەدا ئەوە بووە ڕایگەیەنێت کە پێچەوانەی حەسەنی بەصرییە یان پێچەوانەی ڕاو بۆچوونی ئەهلی سەلەفە لەو مەسەلەدا، سەبارەت بەوەی کە حەسەنی بەصری وتی (اعتزل عنا واصل) مەبەستی ئەوە نەبووە کە واصل چووەتە جێیەکی مزگەوتەوە و خۆی جیاکردووەتەوە بە قەدەر ئەوەی کە تێڕوانینێکی نوێی هەبوو بۆیە خۆی جیاکردەوە لە کۆڕ و کۆبوونەوەکەی حەسەنی بەصری، لایەنی سێهەمیش ئەوەیە ئەو کتێبانەی کە دەڵێن فلاًن کەس ئەهلی ئیعتیزالە، ئەوە لەڕاستیدا پاش ئەو دەنگۆیانە هات کە ئەم مەزهەب و ڕێبازە لەڕووی بنەمای فیکری و ئەقڵییەوە بە تەواوی ناوبانگی دەرکردبوو، بۆیە ئەم ناوە بڕا بە بالاًیاندا.

لەڕاستیدا پێویستە ئەوە ڕوونکەینەوە کە نابێت هۆکاری ناولێنانی ئەم مەزهەبە لەگەڵ ئەو کاتەی کە ئەم ناوە بڕاوە بە بالاًیدا هاوکات لەگەڵ سەرەتای سەرهەڵدانی مەزهەبی ئیعتیزال لەڕووی بابەتیەوە واتە لەڕووی یاسا و ڕێساکانیەوە تێکەڵ بکەین، چونکە گەر جیاوازیمان کرد لە نێوانیاندا، ئیتر سەر ناکێشێ بۆ ئەم ناکۆکیانە، بۆیە دەبینین ئەم مەزهەبە ـ لەڕووی بابەتیەوە ـ دواتر پەیدابووە پێش ئەوەی کە "واصلی کوڕی عەطاء" لە کۆڕ و مەجلیسی حەسەنی بەصری جیابێتەوە، ئەگەر چی ئەو ڕۆژە ناوەکە بڕرا پیایدا کە واصل لە کۆڕ و مەجلیسی حەسەنی بەصریدا خۆی جیاکردەوە و کەناریگرت، بۆیە ڕاوبۆچوونی دروست و پەسەند لای ئێمە سەبارەت بەناو لێنانی موعتەزیلە بەم ناوەوە بریتی یە لەو ڕایەی کە دەڵێ واصل خۆی لە کۆڕ و مەجلیسی حەسەنی بەصری جیاکردوەتەوە.

## • پەیوەندی نێوان موعتەزیلەی فیتنە و موعتەزیلەی کەلامی:

هەندێ لە توێژەران پێیان وایە موعتەزیلەی کەلام درێژکراوەی موعتەزیلەی فیتنەیە، بۆ نموونە - پاش ئەوەی ئەو ڕووداوانە کە مێژوونووسان لەبارەی موعتەزیلەی فیتنەوە وتویانە - ئەحمەد ئەمین دەڵێ: (موعتەزیلە بە گروپ و دەستەیەکی تایبەت وتراوە کە پێش صەد ساڵ بەر لە قوتابخانەی حەسەنی بەصری بوونی هەبووە، بەڵام ناونانیان بەسەر قوتابخانەی واصلی کوڕی عەطاء و عەمری کوڕی عوبێدەوە، ئەوە بۆ زیندووکردنەوەی ناوە کۆنەکە بووە نەك داهێنانێك بووبێت ئەنجامیاندا بێ، لەڕاستیدا ئەمەش قورسە بەسەرمانەوە بڕوا بکەین ئەم ناوە - کە پێشتر زانراو بووە و ڕەنگێکی تایبەت بە خۆی هەبووە - بدرێتە پاڵ واصل تەنها لەبەر ئەوەی کە لە پایەیەکەوە چوو بێتە پاڵ پایەیەکی تر[20]. پاش ئەوەی توێژەر ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە موعتەزیلەی کەلامی هەڵوێستێکی وەسەتیان گرتەبەر و خۆیان جیاکردەوە لەڕاوبۆچوونی هەریەك لە خەواریج و مورجیئەکان سەبارەت بەو کەسانەی کە گوناهی گەورەیان ئەنجامداوە و وتیان ئەوانە لە شوێنێکدان لەنێوان دوو شوێندا "المنزلة بين لمنزلتين"[21]. هەرچی موعتەزیلەی فیتنەشە ئەوا خۆیان

---

[20]- فجر الإسلام - هەمان سەرچاوەی پێشوو - ل٢٦٠.

[21]- خەواریجەکان پێیان وایە ئەو کەسەی کە گوناهی گەورە ئەنجام دەدا پێی کافر دەبێت، بۆیە هەڵوێستیان لەو بارەوە توند بوو. بەڵام مورجیئەکان بە پێچەوانەی ئەوانەوە پێیان وایە ئەوانە بڕوادارن، بۆیە دەڵێن: (هیچ گوناهێك زیان نادات لە ئیمان، وەك چۆن لەگەڵ کوفردا هیچ تاعەت و گوێڕایەڵیەك سود و کەڵکی نییە!! هەرچی موعتەزیلەیشە ئەوا لە نێوان ئەم دوو بۆچوونەدا هەڵوێستێکی وەسەتیان گرتووەتە بەر، کە ئەویش بۆچوونی (المنزلة بين المنزلتين)ە "شوێنێ لەنێوان دوو شوێندا".

جیاکردبوویەوە و خۆیان کەنار گرتبوو لەو دوو دەستە و تاقمەی کە لەبەرامبەر یەکتردا دەجەنگان، بۆیە دەڵێت: ڕەنگە لە دەرئەنجامی هەموو ئەمانەدا بتوانین ئەوە بڵێین کە لەنێوان ئەم دوو گروپەدا نیمچە وێکچوویەك هەیە[22]).

لەڕاستیدا وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد پێویستە جیاوازی لەنێوان موعتەزیلەدا بکەین چ وەك ناو یان چ وەك مەزهەب و ڕێبازێك کە بۆ خۆی خاوەنی بنەما و ڕێسای تایبەت بەخۆی هەیە، جا بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی وردتر ڕوونی بکەینەوە، پێویستە مانای ئیعتیزال لەڕووی زاراوەوە بخەینەڕوو، خاوەنی کتێبی لسان العرب دەڵێ: (عزل الشيء يعزله عزلاً وعزله فاعتزل، وانعزل و تعزل نحاه جانباً فتنحى[23]) خستیە ئەولاوە و کەوتە ئەولاتر، خاوەنی کتێبی (مختار الصحاح) یش دەڵێ: عزله واتە: لێی دوورخستەوە، دەوترێ من لەو کارە دوورم، یان لەکارەکەی دووریخستەوە و لێی جیاکردەوە، (معزل) و (عزل) عن أمته[24]. لێرەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە وشەی (إعتزال) لە ڕووی زاراوەوە دەدرێتە پاڵ شتێك کە کانار بخرێت یان کەنار خرابێت، جا هەر کەس خۆی لە دەستە و گروپێکی دیاریکراو بەدوور بگرێت ئەوە ئیعتیزالی لێکردووە، هەروەها هەر کەسێك خۆی بەدوور بگرێت لە هەندێ بنەمای دیاریکراو ئەوە ئیعتزالی لێکردووە، ئەمەش ئەوەبوو ڕوویدا لای هەریەك لە موعتەزیلەی فیتنە و موعتەزیلەی کەلامیەکاندا، یەکەمیان خۆیان جیاکردەوە لە هەر دوو دەستە جەنگکەرەکە - عەلی و موعاویە - دووەمیشیان خۆیان جیاکردەوە لە ڕاوبۆچوونی حەسەنی بەصری و ئەوەی ئەهلی پێشین لەسەری بوون، بۆیە تەنها لەڕووی لێکچووەوە بە هەموو ئەمانە دەوترێت موعتەزیلە. ئەوەی لێرەدا

---

[22]- أحمد أمين ـ فجر الإسلام ـ ل٤٦٨.

[23]- إبن منظور ـ لسان العرب.

[24]- محمد بن أبي بكر بن عبدالقادر الرازي ـ مختار الصحاح.

بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەوەیە موعتەزیلەی فیتنە لەبەرامبەر ڕووداوەکاندا بەشێوەیەکی نەرێنی بێلایەنی خۆیانیان دەربڕیبوو، واتە هیچ دەستەیەکیان بەحەق لە قەڵەم نەئەدا، بەڵام موعتەزیلەی کەلامی - وەك بینیمان - ڕاوبۆچوونی خۆیان سەبارەت بە هەردوو تاقمەکە خستەڕوو، هەندێکیان وتویانە یەکێك لەو تاقمە جەنگکەرە فاسیقە - لەدین دەرچووە - بەڵام هیچ کام لە تاقمەکەیان دیاری نەکرد، هەندێکی تریشیان هەردوو تاقمەکەی بە - فاسیق - و دەرچوو لە دین داناوە، هەندێکیشیان لایەنگری عەلی بوون و لایاندابوو بەلای عەلیدا دژ بە موعایە، ئەمانەش ئەرێنی بوون سەبارەت بەم ڕووداوانە بە پێچەوانەی موعتەزیلەی فیتنەوە کە بێلایەنی نەرێنیان هەڵبژارد بوو کە بۆچوونی هیچ لایەکیان بە دروست نەدەزانی، گەر ئەم ڕاوبۆچوونە پێچەوانەیان هەبێت ئیتر چۆن دەتوانین بڵێین موعتەزیلەی کەلامی درێژکراوەی موعتەزیلەی فیتنەیە؟! بۆیە لەڕاستیدا پێویستە لەنێوان مانای زاراوە و زارەکیدا تێکەڵی دروست نەکەین لە وشەی "إعتزال"دا کە مەبەست پێی گروپ و تاقمێکی کەلامیە و بنەما و ڕێسای تایبەت بە خۆی هەیە، هەر کەس ئەو بیر و بۆچوونەی هەبوو ئەوە موعتەزیلەیە.

- **ناوەکانی موعتەزیلە:**

موعتەزیلە ناوی زۆری دیکەی هەیە[25] زۆربەیان ناوی تایبەتن و کورت هەڵاتوون لەسەر تاقمێك لە تاقمەکانیان یان وەرگیراوە لەو بیروباوەڕەی کە

---

[25]- لە کتێبی (الخطط و الآثار للمقریزي) دا زۆرێك لە ناوی موعتەزیلە هاتووە لەوانە:

الحرقیة: بیروبۆچوونیان وایە کە مرۆڤی بێباوەڕ تەنها یەکجار لەئاگردا دەسوتێت.

الثنویة: بیروڕایان وایە خەیر و چاکە لە خوداوەیە و شەڕ و خراپەش لە مرۆڤەوەیە.

اللفظیة: پێیان وایە قورئان مەخلوقە و دروستکراوە.

پێیان وایە خەیر و چاکە لەخوداوەیە و شەڕ و خراپەش لە مرۆڤەوەیە، هەندێکیشیان ناوی هاوبەشن و هەموو دەستە و تاقمێك دەگرێتەوە[٢٦].

ئێستاش باس لە گرنگترین ئەو ناوانە دەکەین کە پەیوەستن بە بنەما سەرەکیەکانی موعتەزیلەوە، جا ئایا ئەو ناوانەی کە خۆیان لە خۆیانیان ناوە یان ئەو ناوانەی کە نەیارەکانیان داویانەتە پاڵیان.

## أ- ئەهلی عەدل و تەوحید:

شەهرستانی لە کتێبی "الملل و النحل"دا باسی ئەوەی کردووە کە موعتەزیلەکان پێیان دەوترێت عەدل و تەوحید،[٢٧] ئیبن مورتەزاش دەڵێ موعتەزیلە خۆیان ناوناوە "العدلية و الموحدة[٢٨]"، پێشیان خۆشە ئەم ناوەیان لێ بنرێت. لەڕاستیدا ئەم ناوە لەدوو بنەما سەرەکیەکەی ئیعتیزال وەرگیراوە کە زۆربەی بیروبۆچوون و ڕێنماییەکانیان بە دەوری ئەم دوو بنەمایەدا دەسوڕێتەوە[٢٩]، جا - عەدل - لای ئەوان عەدل و دانایی خودایە، مرۆڤ خۆی

---

الملتزمة: دەڵێن خودا لەهەموو جێگایەکدا هەیە.

القبرية: نکوڵی سزای گۆڕ دەکەن.

الواقفية: بەوانە دەوترێت کە لە قورئاندا زۆر وەستانیان کردووە.

المفنية: بروایان وایە بەهەشت و دۆزەخ کۆتایی دێت.

بڕوانە - الخطط و الآثار للمقريزي - جـ٣ - ل ٢٨٨ - طبعة بولاق ١٢٧٠ك - یان بڕوانە زهدی جار الله - المعتزلة - ل٣.

[٢٦]- زهدی جار الله - المعتزلة - ل٣

[٢٧]- الشهرستاني - الملل و النحل - ل٦٥.

[٢٨]- المنية و الأمل ل٢.

[٢٩]- زهدي جار الله - المعتزلة - ل٦.

توانای ئەوەی هەیە کردەوەکانی خۆی بە خەیر و شەڕەوە دروست بکات، خودا بە دوورە لەوەی شتێك بە زوڵم و شەڕ بداتە پاڵ خۆی[30]. مەبەسیشیان لە - تەوحید - ئەوەیە کە خودا - قدیم - ە، قەدیمیش تایبەتمەنترین سیفەتە بۆ خودا، بۆیە نەفی سیفاتی قەدیمیان کردووە، چونکە پێیان وایە گەر وامان وت ئەوا چەند - قدیم - ێك دروست دەبێت، ئەوان بە - وحدة ذات والصفات - ناوی دەبەن، واتە خودای گەورە و سیفەتەکانی یەك شتن نابێت لێك جیا بکرێنەوە[31].

## ب - قەدەرییەکان:

شەهرستانی دەڵێت: ئەوان - واتە موعتەزیلە - زاراوەی قەدەریەیان کردووە بە زاراوەیەکی هاوبەش - بۆیە وتویانە: زاراوەی قەدەرییە بە کەسێك دەوترێت کە دان بە قەدەر دا بنێ ئیتر بە خەیر بێ یان بە شەڕ لەلایەن خودای گەورەوە، ئەمەش بۆ خۆ دوورخستنەوە لەوەی کە نیشانەی نازناو بەخوداوە بنێن، چونکە وتنی قەدەری خراپ ئەوە هەمووان لە سەری هاوڕان، لەسەر ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) فەرمویەتی: (القدرية مَجوسُ هذه الأمة[32]). واتە: (قەدەرییەکان مەجوسی ئەم ئوممەتەن). بەغدادیش دەڵێ: ئەهلی سوننە بە قەدەرییە ناویان دەبەن، چونکە پێیان وایە

---

[30]- لای ئەهلی سوننە مرۆڤ جوزئی کردەوەکانی سەرپشکە تیایدا نەك هەمووی بەگشتی. - وەرگێڕ -

[31]- الشهرستاني - الملل و النحل - ل٦٥.

[32]- هەمان سەرچاوەی پێشوو - هەمان لاپەڕە.

مرۆڤەکان خۆیان تەقدیری کردەوەکانی خۆیان دەکەن و خودا هیچ جۆرە تەقدیرێکی تێدا ناکات[٣٣].

کەواتە موعتەزیلە پێیان خۆش نییە ئەم ناوەیان بەسەردا ببڕێت، ئەهلی سونەش بۆیە ئەم ناوەیان لێ دەنێن چونکە زەمی تێدایە، ئەویش وەك کارکردن بەو فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) کە فەرموویەتی: قەدەرییە مەجووسی ئەم ئوممەتەن. بەلأم لەڕاستیدا قەدەرییەکان گروپێکن پێش موعتەزیلە سەریان هەڵداوە، سەرانی پێشینیشیان بریتی بوون لە مەعبەدی جوهەنی و غیلانی دیمەشقی، کاتێ موعتەزیلە سەری هەڵدا و دەرکەوت، بۆچوونی نەفی قەدەریان لێوەرگرتن، ئیتر ئەم ناوە بە تایبەتی بڕا بە بالآیاندا، پێشیان وایە کە غیلانی دیمەشقی یەکێکە لەوان[٣٤]. دەبینین هەندێکیش لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە لەبارەیانەوە هاتووە هیچ جیاوازییەك لەنێوانیاندا نابینن و وایدادەنێن کە هەردووکیان یەك گرووپن[٣٥].

## ج ـ جەهەمیەکان:

جەهەمیە[٣٦] گروپێکن پێش موعتەزیلە سەریان هەڵدا، نکوڵی سیفەتەکانی خودایان کرد و وتیان بەهەشت و دۆزەخ بە هەمیشەیی نامێننەوە و لەناو

---

[٣٣] ـ الإمام عبدالقاهر البغدادي الأشعري ـ الفرق بين الفرق ـ ل٩٤ ـ دار الآفاق الجديدة ـ بيروت ـ ١٣٩٣ك.

[٣٤] ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

[٣٥] ـ الإمام عبدالقاهر البغدادي الأشعري ـ الفرق بين الفرق ـ ل٩٤ ـ دار الآفاق الجديدة ـ بيروت ـ ١٣٩٣ك.

[٣٦] ـ جەهەمیە: گروپێك بوون کە دەدرێنە پاڵ جەهمی کوڕی صەفوان کە لەساڵی ١٢٨ کۆچیدا سەلمی کوڕی ئەحوەزی مازنی لە سەردەمی دوایین پادشای بەنی ئومەییەدا لە مەڕوە کوشتی.

دەچن، هەروەها نكۆڵی بینینی خوداشیان كرد و پێشیان وایە قورئان خەلقی خودایە و دروستكراوە[37]، هەرچی موعتەزیلەشە ئەوا هەموو ئەم بۆچوونانەی لە جەهەمیەكانەوە وەرگرت، تەنها لە مەسەلەی "جەبر"دا نەبێ، چونكە لەم مەسەلەیەدا جیاوازییان لەگەڵ جەهەمیەكاندا هەبوو، جەهەمیەكان بڕوایان وایە كە مرۆڤ دەسەڵاتی نییە بەسەر ئەو كردەوانەی كە ئەنجامی دەدات، چونكە پێیان وایە مرۆڤ هیچ كارەیە لەبەرامبەر كردەوەكانیدا، وە هەموو ئەو كردەوانەش كە دەیكات ویستی خۆی تێدا نییە، بەڵكو خودا بۆ خۆی دەیكات[38]، كاتێك لە نێوان ئەم دوو گروپەدا لێك نزیكیەكی بەهێز لەبیرو بۆچوونەكانیاندا دروست بوو، ئەهلی سوننە ناوی جەهەمیەشیان بڕی بە باڵایاندا، ئەوەتا شێخ جەمال الدینی قاسمی دەڵێ: زانایانی دوایین كە بەرپەرچی جەهەمیەیان داوەتەوە و شتیان لەبارەوە نوسیوون وەك: "ئیبن حەنبەل و بوخاری" و ئەوانەی لەدوای ئەوانیشەوە هاتوون، كاتێ ناوی جەهەمیەیان هێناوە مەبەستیان پێی موعتەزیلەیە، بەڵام زانایانی پێشینی سوننە ئەوانەی بەرپەرچی جەهەمیەیان داوەتەوە مەبەستیان پێی جەهەمیەی سەرەتایە، چونكە ئەوان لە پێش موعتەزیلەدا سەریان هەڵداوە، كەواتە: هەموو موعتەزیلیەك جەهەمیە، بەڵام هەموو جەهەمیەك موعتەزیلی نییە[39].

جا هەروەك چۆن خۆیان بێبەری كرد لەناوی قەدەرییە، بەهەمان شێوە بە توندی ناوی جەهەمیەشیان لەخۆیان ڕەتكردەوە و خۆشیان بێبەری كرد لە

---

[37] ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ٩ ـ ل٩٩.

[38] ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ جـ٩ـ ل١٠٠.

[39] ـ جمال الدين القاسمي الدمشقي ـ تأريخ الجهمية و المعتزلة ـ ل٤٤. مؤسسة الرسالة ـ بيروت ـ ١٤٠٥ك ـ ١٩٨٥م.

جەهم و هاوەڵە جەبرییەکان[40]. بۆیە بەخراپ لە جەهمیان دەڕوانی و پێیان وابوو بەهەمان شێوەی هیشامی کوڕی حەکەمی ڕافضی لە ئیسلام دەرچووە[41].

هەندێ لەو ناوانەی تر کە دراونەتە پاڵ موعتەزیلە، وەك: ـ المُعطلة ـ کە ئەهلی سوننە ئەم ناوەی داوەتە پاڵیان، چونکە هەموو ئەو سیفاتانەی خودایان لەکارخست کە لەقورئان و فەرموودەدا بە ئاشکرا هاتوون و ڕوونن، هەروەها پێشیان دەڵێن "وەعیدیە"، چونکە بڕوایان بە "وعد" و "وعید" هەیە[42]ـ پاداشت و سزا. بەهەر حاڵ ناوی موعتەزیلە زۆرە، بەڵام بەناو بانگترینیان ئەم دوو ناوەیە: "موعتەزیلە و ئەهلی عەدل و تەوحید" ـ دادپەروەری و یەکتاپەرستی ـ یەکەمیان: سەپاندویانە بەسەریانا و دواتر خۆشیان بەرگرییان لێکرد و هەوڵیشیان داوە ناوەکە جوان بکەن و بیڕازێننەوە، دووەمیشیان: خۆیان ئەم ناوەیان دابڕیبوو بەسەر خۆیاندا، چونکە بەرگرییان لە گەورەترین بیروڕا پێدەکرد کە بریتی بوو لە تاکو تەنهایی و عەدلی خودا.

---

[40]ـ بڕوانە زهدی جار الله ـ المعتزلة ـ ل ٨ ، ٩.

[41]ـ الإنتصار ـ ل١٢٦.

[42]ـ بڕوانە زهدی جار الله ـ المعتزلة ـ ل٢ تا ل١١.

# بەشی دووەم

# دەرکەوتنی موعتەزیلە و ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی دەرکەوتنی

# پێشەکی

لەبەشی ڕابردوودا بینیمان کە چۆن ناوی موعتەزیلە دەرکەوت، پێویستە لەنێوان موعتەزیلەی فیتنە و موعتەزیلەی کەلامیەکاندا جیاوازی بکەین، ئاماژەمان بەوەشکرد کە پێویستە لەڕووی بابەتیشەوە جیاوازی بکرێت لەنێوان دەرکەوتنی موعتەزیلەدا، واتە دەرکەوتنی وەك مەزهەب کە بۆ خۆی بنەما و ڕێسای تایبەت بە خۆیی هەیە، وە لە نێوان دەرکەوتنی موعتەزیلەیەکدا کە دەدرێتە پاڵ ئەم مەزهەبە[43]، جا موعتەزیلە وەك مەزهەب زۆر لەپێش ناوەکەیەوە سەری هەڵداوە، ئێمەش لەم بەشەدا کاتێك باس لە دەرکەوتنی موعتەزیلە دەکەین زیاتر مەبەستمان پێی موعتەزیلەیە وەك مەزهەب و ئاینزا، وەك ئەوەی کە "خەیاط"[44] لە بارەیەوە دەڵێت: (هیچ یەکێك لەوانە شایستەی ئەوە نییە پێی بوترێت موعتەزیلە تا ئەوەی ئەم پێنج بنەمایەی تێدا کۆدەبێتەوە: (التوحید، العدل، الوعد و الوعید، المنزلة بین المنزلتین، الأمر بالمعروف و النهي عن المنکر). واتە: (یەکتاپەرستی، دادپەروەری، پاداشت و سزا، شوێنێ لەنێوان دوو شوێندا، ئەمر بە چاکە و ڕێگریکردن لە خراپە). گەر ئەم پێنج بنەمایە لەهەر کەسێکدا ڕەنگیدایەوە ئەوە پێی دەوترێت

---

[43]- بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

[44]- ئەبولحەسەن (الخیاط) لەساڵی ٣٠٠ ك وەفاتی کردووە، یەکێکە لە موعتەزیلەکانی بەغداد.

موعتەزیلە[45]. بێگومان ئەم بنەمایانەش لەپڕێکدا دەرنەکەوتوون، بەڵکو بە چەند قۆناغێك دەرکەوتوون، پێویستە کاتێك کە بە دواداچوون دەکەین سەبارەت بە سەرهەڵدانی موعتەزیلە، دەبێت بە دواداچوون بۆ ئەوە بکەین کێ یەکەم کەسبووە کە بەڕوونی باسی لە یەکێك لەم بنەمایانەی کرد کە هیچ گومانی تێدا نییە، ئەگەر گەیشتین بەو خاڵەی کە کێ سەرەتا قسەی لەسەر کردووە، ئەو کاتە بەڕوونی بۆمان دەردەکەوێت کە موعتەزیلە وەك مەزهەب لە کەیەوە سەری هەڵداوە، لێرەدا باسی سەرهەڵدانی گرنگترین بنەماکان دەکەین کە موعتەزیلە بڕوای پێی بووە - پشت بە خودا بە تێر و تەواوی لە بەشی سێهەمی ئەم کتێبەدا باس لە بنەماکانی موعتەزیلە دەکەین - کەخۆی لە بنەمای "تەوحید"دا دەبینێتەوە، ئەوجا گرنگترین بابەتەکانی وەك نەفی سیفەتەکانی خودا و خەلقی قورئان و نەفی بینینی خوداش دەخەینەڕوو، بنەمای دووەمیش کە بریتی یە لە "عەدل" گرنگترین بابەتەکانیشی بابەتی "قەدەرە"، هەرچی بنەمای سێهەمیشە ئەوا بریتی یە لە شوێنێك لەنێوان هەر دوو شوێنەکەدا - المنزلة بين المنزلتين - ئێستاش باس لەسەر هەڵدانی ئەم بابەتانە دەکەین.

## أ- بیروبۆچوونیان سەبارەت بە قەدەر:

ئەوەمان زانی کاتێ موعتەزیلە لەبارەی قەدەرەوە دەدوێن مەبەستیان پێی ئەوەیە کە مرۆڤ خۆی تەقدیری کارەکانی دەکات، هەر بۆیە پێیان دەڵێن قەدەرییەکان[46]، لەڕاستیدا یەکەم کەسیش کە لەبارەی قەدەرەوە قسەیکرد

---

[45]- الإنتصار - ل١٢٦.

[46]- بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

"مەعبەدی جوهەنی" بوو[47]، دواتر "غیلانی دیمەشقی"[48] هات و ئەم بیر و بۆچوونەی لەوەوە وەرگرت. خاوەنی کتێبی "مفتاح السعادة" دەڵێ: (... یەکێك لەسەرانی موعتەزیلە بریتی بوو لە "ئەبو مەڕوان غیلانی کوڕی موسلیمی دیمەشقی"، کە یەکێك بوو لە هاوەڵانی حەسەنی بەصری، کۆمەڵێك شوێنکەوتەی هەبوو پێیان دەوتن غیلانیەکان، کابرایەکی قیبطي قەدەری بوو، جگە لە مەعبەدی جوهەنی کەس لەپێش ئەوەوە لەبارەی قەدەر قسەی نەکردووە، ئەوزاعی دەڵێ: یەکەم کەس کە لەبارەی قەدەرەوە قسەیکرد مەعبەدی جوهەنی بوو پاش ئەویش غیلان... [49]).

---

[47] ـ مەعبەدی کوڕی عەبدوڵلای جوهەنی بەصرییە، یەکەم کەس بوو کە لە بەصرەدا لەبارەی قەدەرەوە قسەیکرد، لەکاتی شۆڕشەکەی "ئیبن ئەشعەث"یشدا کە لەبەرامبەر حەججاجی کوڕی یوسفی ثەقەفیدا بەرپای کرد، بەشداری لە شۆڕشەکەیدا کرد، ئەوەبوو بریندار بوو دواتر لە مەککەدا مایەوە، حەججاجیش لە مەککەدا دەستگیریکرد و لەژێر ئەشکەنجە و ئازاردا لە ساڵی ٨٠ کۆچی کوشتی.

[48] ـ ئیبن موسلیم ئەبو مەڕوان، لە پاش مەعبەدی جوهەنی بەدووەم کەس هەژمار دەکرێت کە لەبارەی قەدەرەوە قسەی کردووە، پێنجەمین خەلیفەی ڕاشیدین عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بانگهێشتیکرد و لەسەر دەستی ئەو تەوبەیکرد و لەبیر و بۆچوونەکەی پاشگەز بوویەوە، غیلان خۆی دەڵێ: لەڕاستیدا من کەسێکی گومڕا بووم تۆ هیدایەتت دام و ڕێگات بۆ ڕۆشنکردمەوە، بەڵام لەسەردەمی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکدا جارێکی تر گەڕایەوە سەر هەمان ئەو بیر و بۆچوونەی کە هەیبوو، ویستی دیداری لەگەڵدا ساز بکات و پاشگەز بوونەوەی خۆی دەرببڕێت وەك ئەوەی کە لەسەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزدا کردی، بەڵام هیشام داواکەی لێی وەرنەگرت، ئەوەبوو لەپاش ساڵی ١٠٥ کۆچی فەرمانیدا هەڵبواسرێت.

[49] ـ طاش کبری زاده ـ مفتاح السعادة و مصباح السیادة ـ جـ٢ ل١٦٤ ـ دار الکتب الحدیثة ـ القاهرة ـ ١٩٦٨.

لەڕاستیدا قازی عەبدولجەباریش لەنێو چینەکانی موعتەزیلەدا غیلانی دیمەشقی لەچینی چوارەمدا داناوە[50]، هەروەك چۆن "خەیاط"یش بە یەکێك لە پیاوانی موعتەزیلە هەژماری دەکات[51].

غیلانی دیمەشقی نامەیەکی بۆ عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نوسی و تیایدا وتی: (ئەی عومەر ئایا دانایەکت بینیوە عەیب و ناتەواوی بگرێت لەو شتەی کە دروستی دەکات یان شتێك دروست بکات و دواتر ببێتە عەیبە و ناتەواوی، یان سزای کەسێك بدات لەسەر ئەو شتەی خۆی بڕیاری لەسەر داوە، یان شتێك بڕیاری دابێت و دواتر خەڵکی لەسەر سزا بدات؟ یان ئایا کەسێکی سەر ڕاست و ڕێنمایی کارت بینیوە کە بانگەشەی هیدایەت بکات و دواتر خەڵکی لێ لابدات[52]).

ئەم نامەیەش یەکێك لە گرنگترین بنەماکانی موعتەزیلە لەخۆ دەگرێت کە ئەویش بنەمای عەدلە، بۆیە موعتەزیلەکان بە هەڵەدا نەچوون کاتێ غیلانی دیمەشقیان بە یەکێك لەپیاوەکانیان هەژمار کردووە، ئەوەتا بینیمان کە چۆن هەر یەك لە قازی عەبدولجەبار و خەیاط ـ کە هەردووکیان موعتەزیلەن ـ غیلانی دیمەشقیان بە یەکێك لە پیاوەکانی موعتەزیلە هەژمار کردووە و لێرەدا هەردووکیان ڕێگەی ڕاستیان گرتەبەر، چونکە یەکێك بووە لە بەناوبانگترین بانگهێشت چیانی بیر و ڕای قەدەری و لەو پێناوەشدا کوژراوە، موعتەزیلەکانیش مەسەلەی قەدەریان لەوەوە وەرگرتووە، تەنانەت مۆرکی قەدەرییەشیان پێوە ناون، بۆیە ئێمەش پێمان وایە کە موعتەزیلە درێژە

---

[50]ـ القاضي عبد الجبار ـ طبقات المعتزلة ـ ل٣٩ ـ تحقيق د. علي سامي التشار.

[51]ـ الإنتصار ل١٢٧.

[52]ـ طبقات المعتزلة ـ ل٣٠.

پێدەری قەدەرییەکانی پێشینن، تەنانەت دەکرێت بەو قەدەرییانە بوترێت "موعتەزیلەکانی پێشین".

## ب ـ نەفی سیفاتەکانی خودا و مەسەلەی خەڵقی قورئان و نەفی بینینی خودا:

موعتەزیلەکان وتوویانە خودا سیفاتی نییە و قورئانیش خەلقی خودایە و دروستکراوە، مەبەستی ئەوان لێرەدا بەرگریکردن بووە لە یەکتاپەرستی خودا، ئەوان باوەڕیان وایە کە زاتی خودا بۆ خۆی کۆنە و هیچ شتێك کۆن نییە جگە لە زاتی خودا، هەرچی دوای ئەو هەیە تازەیە[٥٣]، واصل دەڵێ: هەر کەسێك ئیسپاتی مانا و سیفاتی کۆنی بداتە پاڵ خودا، ئەوە ئیسپاتی دوو ئیلاهی بۆ خودا بڕیار داوە[٥٤].

سەبارەت بە خەلقی قورئانیش هەمان بیر و ڕایان هەیە، گەر قورئان دروستکرا و نەبێ کەواتە کۆنە، گەر پێمان وابوو قورئان کۆنە ئەوا هاوبەشمان بۆ خودا بڕیارداوە لەڕووی ئەزەلی و کۆنییەوە، ئەم جۆرە بیر و بۆچوونەش لای ئەوان بە هاوەڵ بڕیاردان بۆ خودا هەژمار دەکرێت.

لەڕاستیدا ئەوەی کە سەرەتا نکۆڵی سیفات و خەلقی قورئانی کرد "جەعدی کوڕی درهەم[٥٥]" بوو، پاش ئەویش جەهمی کوڕی صەفوان[٥٦] ئەم بیر و

---

[٥٣] ـ الإنتصار ـ ل٥.

[٥٤] ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٦٧.

[٥٥] ـ جەعدی کوڕی درهەم ـ مامۆستا و ئامۆژگاریکەری مەڕوانی کوڕی موحەممەد بوو، دوایین خەلیفەی ئومەوییەکان، هەر بۆیە پێی دەوترا مەڕوانی جەعدی ـ جەعدی کوڕی درهەمیش یەکەم کەسبوو کە وتی قورئان مەخلوقە و نکۆڵی سیفەتەکانی خودای کرد. ئەوەبوو خالیدی

بۆچوونانەی لەوەوە وەرگرتووە، ئەوەتا شەهرستانی لەزاری جەهمی کوڕی صەفوانەوە هێناویەتی و دەڵێ: (دروست نییە خودا بەشتێك وەسف بکرێت کە دروستکراوەکانی پێ وەسف دەکرێت، چونکە ئەو کاتە هاوشێوە بۆ خودا بڕیاردەدرێت.. [57])

بەهەمان شێوە نکوڵی بینینی خوداش دەکەن لە دواڕۆژدا، ئەهلی سوننە دەڵێن خودا لە ڕۆژی دواییدا دەبینرێت، بەڵام موعتەزیلە نکوڵی بینینی خودا دەکەن و پێیان وایە هەر کەس ئەو بڕوایەی هەبوو کە خودا دەبینرێ، ئەو کاتە هاوشێوە بۆ خودا دروست دەبێت، دەی ئەمەش لەگەڵ بنەمای ـ التوحید ـ یەکتاپەرستیدا یەکناگرێتەوە[58]، بۆیە دەبینین جەهەمیەکانیش بەهەمان شێوەی موعتەزیلەکان نکوڵی بینینی خودایان کردوە لە دواڕۆژدا، چونکە بەهەمان شێوەی موعتەزیلەکان نکوڵی هاوشێوە دەکەن بۆ خودا[59].

---

کوڕی عەبدوڵڵای قەسری کە والی هیشامی کوڕی عەبدولمەلیك بوو لەعێراقدا، لەساڵی ١٢٦ کۆچیدا لەڕۆژی جەژنی قورباندا هێنای، دوای ئەوەی نوێژی جەژنی بۆ خەڵکەکە کرد لە مزگەوتی کوفەدا، لەکۆتایی وتارەکەیدا بە خەڵکەکەی وت: بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانتان و قوربانی بۆ خودای گەورە بکەن، خودا لێتانی وەرگرێت، منیش دەمەوێت ئەمڕۆ جەعدی کوڕی درهەم بکەم بە قوربانی، چونکە دەڵێ خودا لەگەڵ موسادا قسەی نەکردووە و ئیبراهیمیش دۆست و خۆشەویستی خودا نییە ـ نەفی کەلامی خودا دەکات ـ پاکو بێگەردی بۆ خودا لەوەی کە جەعد دەیڵێ. ئینجا لەسەر مینبەرەکە دابەزی و لەژێر مینبەرەکەدا سەری بڕی.

[56] ـ إبن العماد الحسيني ـ شذرات الذهب في أخبار من ذهب ـ القاهرة ـ ١٣٥٠ك ـ جـ١ ـ ل١٦٩.

[57] ـ الملل و النحل ـ جـ١ـ ل٩٩.

[58] ـ زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل٣٤، ل٨٠.

[59] ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ ل٣٤.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە موعتەزیلەکان لەم سێ مەسەلەی کە پەیوەستە بە بنەمای ـ التوحيد ـ یەکتاپەرستیەوە لەگەڵ جەعدی کوڕی درهەم و جەهەمیەکاندا پێچەوانە نەبوون، بەڵکو لەم سێ مەسەلەدا موعتەزیلە بە درێژە پێدەری جەعدی کوڕی درهەم و جەهمی کوڕی صەفوان هەژمار دەکرێت، بەڵام ئەوەی کە جێی ناکۆکیە لە نێوان جەهەمی و موعتەزیلەدا پەیوەستە بە مەسەلەی قەدەرەوە.

## جـ ـ شوێنێك لە نێوان دوو شوێندا: "المنزلة بين المنزلتين "

لەمەو پێش ئەوەمان خستەڕوو کە واصلی کوڕی عەطاء وتی ئەوانەی گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن نە بڕواداری تەواون نە کافری تەواو بەڵکو لەشوێنێکدان لەنێوان دوو شوێندا[٦٠].

دەگێڕنەوە جارێکیان دەشتەکیەك هاتووەتە لای حەسەنی بەصری و وتویەتی: علمني ديناً وسطاً، لا ذاهباً شطوطاً، ولا هابطاً هبوطاً. فقال الحسن: (لأن قلت ذاك إن خير الأمور أوسطها[٦١]). واتە: (دینێکی وەسەت و مامناوەندم فێر بکە، نە زۆر پەرگیربێت و نەزۆر شلگیریش بێت. حەسەنی بەصری وتی: (ئەوەی کە تۆ وتت قسەیەکی تەواوە لەڕاستیدا باشترین کاروبارەکان کاروبارێکە کە مامناوەند بێت).

جا ئەم تێڕوانینە وای لە "زهدی جار الله" کردووە کە بە ڕوونی بڵێت ئەم ئاماژەیە ئەوەمان پێ دەڵێ کە لە نێوان موعتەزیلە و حەسەنی بەصریدا پەیوەندی هەبووە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی موعتەزیلەکان لە

---

[٦٠]ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

[٦١]ـ الجاحظ ـ البيان والتبيين ـ تحقيق: عبد السلام هارون ـ القاهرة ـ جـ١ ـ ل١٧٧.

مەسەلەکانی تردا هاوڕابوون لەگەڵ حەسەنی بەصرپیدا جگە لە نەفیکردنی قەدەر، ئەمەش بە دوور نازانرێت بنەمای ـ المنزلة بین المنزلتین ـ شوێنێ لەنێوان دوو شوێندا ـ لە حەسەنی بەصرپییەوە وەریان گرتبێت، ئەگەر چی حەسەنی بەصری ڕای جیاواز بوو لە جێبەجێکردنی ئەم بنەمایەدا کە بدرێت بەسەر ئەو کەسەدا کە گوناهی گەورە ئەنجام دەدا[٦٢].

لە ڕاستیدا ئەم وتەیەی " زهدی جار الله " لەزۆر ڕووەوە لەڕاست لایداوە، چونکە کاتێك "واصل" وتی "شوێنێك لە نێوان دوو شوێندا" مەبەست پێی شوێنی مرۆڤی بڕوادار و کافر بوو، بەلاّم شوێنی مامناوەند ئەوە شوێنی مرۆڤی فاسیقە، جا گەر حەسەنی بەصری وتبێتی شوێنێ لەنێوان دوو شوێندا ئەوە دەبێت ئەم بنەمایەی جێبەجێ کردبێت بەسەر مرۆڤێکدا کە گوناهی گەورەی ئەنجامدا بێت، "زهدی جار الله" ش ئەمەی نەوتووە، چونکە حەسەنی بەصری لەم مەسەلەدا پێچەوانەی "واصل" بووە، یان ئەوەتا دەبێت جێبەجێی بکرێت بەسەر ئەو کەسانەدا کە گوناهی بچووکیان ئەنجامداوە، جا گەر ئەمەش وابوو، ئەوا جێبەجێکردنی بەسەر کەسانێکدا کە گوناهی گەورەیان ئەنجامداوە لە پێشترە، چونکە تاوانەکەی گەورە ترە، کەواتە هیچ شتێك لە نێوان بەرپەرچدانەوەی حەسەنی بەصری نییە بۆ بڕیارەکەی واصلّ.

لەلایەکی تریشەوە دەشتەکیەکە پرسیاری لەحەسەنی بەصری کرد سەبارەت بە ئاینێك کە مەمناوەند بێت و هیچ زیادەڕەوییەکی تێدا نەبێ، چونکە ئاینی ئیسلام ئاینێکی مامناوەندییە، بۆیە حەسەنی بەصری جەختی لەسەر وتەی دەشتیەکە کردەوە، ئەمەش هیچ کات ئاماژە نییە بەوەی کە حەسەنی بەصری وتبێتی شوێنێ لەنێوان دوو شوێندا.

---

[٦٢] ـ بڕوانە ـ زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل٥٥.

له ڕاستیدا ـ وەك باسمان لێوە کرد ـ ئەم وتەیەی واصل ـ شوێنێك له نێوان دوو شوێندا ـ وایکرد ناوی ـ إعتزال ـ ببڕێت بەسەر واصل و هاوەڵەکانیدا، تەنانەت شەهرستانی جەخت لەوە دەکاتەوە کە عەمری کوڕی عوبێد هاوڕای واصل بووە لە مەسەلەی قەدر و نکۆڵیکردنی سیفاتەکانی خودا پێش ئەوەی واصل باسی شوێنێك لەنێوان دوو شوێندا بخاتە ڕوو[٦٣]، هەرچی واصلیشە ئەوا پێش ئەوەی باسی بنەمای شوێنێك لەنێوان دوو شوێندا بکات بۆ خۆی هەواداری هەبووە کە لەسەر کۆمەڵێك بنەما و ڕێسا لەسەری ڕێککەوتبون.

لێرەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە سەرەتا "ئیعتیزال" لەسەر دەستی قەدەرییەکانی پێشین سەری هەڵدا ـ گەر دەتەوێت پێیان بڵێ موعتەزیلەکانی پێشین ـ جەهەمیەکانیش چوونە پاڵ ئیعتزالیەکان، گرنگترین بنەماکانی ئیعتیزالیش لەنێوان هەریەك لەجەهەمی و قەدەرییەکاندا هاوبەشن ـ جگە لە مەسەلەی قەدەر ـ بەڵگەش لەسەر ئەمە زۆربەی بیرمەندە موسڵمانەکان جەهەمیە و موعتەزیلەیان بەیەك گرۆ و تاقم داناوە، بۆ نموونە دەبینین پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە نامەکەیدا ـ الرد علی الزنادقة و الجهمیة ـ دا مەبەست پێی موعتەزیلەیە، بەهەمان شێوە ئیبن قەیمیش لە کتێبەکەیدا بەناوی ـ الصواعق المرسلة علی الجهمیة و المعطلة ـ و ئیبن تەیمیەش لە کتێبەکەیدا ـ تخلیص التلبیس من کتاب التأسیس ـ هەموو ئەمانە وەك مەزهەبێك ناویان دەبەن کە بۆ خۆیان بنەما و ڕێسا و ڕێگای تایبەت بە خۆیان هەیە لە بیرکردنەوەدا، بەڵام مەسەلەی ناولێنانەکە ئەوە مەسەلەیەکە دواتر دراوەتە پاڵیان وەك مەزهەب، گەرچی مەزهەبەکە بەهۆی واصل و هاوەڵەکانیەوە ناوبانگی دەرکردووە ـ ئەوانەی ناویان لێنان موعتەزیلە چونکە

---

[٦٣] ـ الملل و النحل ـ جـ١، ل٦٩.

حەسەنی بەصری ئەو ناوەی لێنان ـ چونکە مەزهەبێکیان ڕێکخستبوو کاریشیان دەکرد بۆ بڵاوکردنەوەی ڕێنماییەکانییان و بەرگریشیان لێ دەکرد، ئەو ڕێنماییانەی کە لەلایەن هەندێ لە خەلیفەکانی عەبباسیەوە پشتگیرییان لێدەکرا ـ وەك ئەوەی کە بینیمان ـ لەو پێناوەدا هەریەك لە مەعبەدی جوهەنی و غیلانی دیمەشقی و جەعدی کوڕی درهەم و جەهمی کوڕی صەفوان کوژران، بەڵام واصل و هاوەڵەکانی دواتر درێژەیان بەم کاروانە داو بەردەوامبوون لەسەری تا دواجار لەڕووی سیاسیەوە بەختی باش یاوەریانبوو پشتگیریان لێ دەکرا بۆ ئەوەی ڕێنماییەکانیان بلاو بکەنەوە، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە مەزهەبەکە بناسرێت و ناوبانگ دەربکات، هاوکات خۆشیان بە هۆی مەزهەبەکەوە لای خەڵکی بناسرێن و ناوبانگ دەربکەن.

## • ئەو هۆکارانەی بوونە هۆی سەرهەڵدانی موعتەزیلە:

لە ڕاستیدا هیچ مەزهەبێکی فیکری یان بیروباوەڕی لە پڕێکدا سەر هەڵنادات، چونکە خۆ شتێکی ئاسایی نییە لە خۆوە هەڵتۆقێ و بێتە بوونەوە، بەڵکو دەبێت کۆمەڵێك دەرهاوێشتە یارمەتیدەر بێت بۆ ئەوەی بێتە بوونەوە و کاریگەریش لەسەر فیکر و بیروباوەڕی دروست بکات، بۆ ئەم مەبەستە دەبینین کۆمەڵە هۆکارێك یارمەتیدەر بوون لەسەر دەرکەوتنی موعتەزیلە وەك یەکێك لە بەهێزترین گروپە کەلامیەکان[٦٤] کە هیچ کات کەمتەرخەم نەبوون لە

---

[٦٤] ـ گروپ و دەستە کەلامیەکان ئەوانەن کە سەرقاڵبوون بە زانستی کەلامەوە، "تەهانەوی" بەم شێوەیە پێناسەی زانستی کەلامی کردووە، دەڵێ: (زانستێکە کە مرۆڤ دەتوانێ لە ڕێگەیەوە بیروباوەڕە ئاینیەکان بسەلمێنێ بەسەر ئەوانی تردا، ئەمەش لەڕێگەی دەرخستنی بەڵگە و لابردنی گومانەکانەوە)، بڕوانە ـ کشاف إصطلاحات الفنون ـ الهيئة العامة للكتاب

بڵاوكردنەوەی ڕێنماییەكانی ئیسلام و بەرگریكردن لە ئاین و بیروباوەڕەكانی ئیسلامدا، جا لێرەدا بە كورتی گرنگترین ئەو هۆكارانە دەخەینەڕوو.

## یەكەم: قورئانی پیرۆز:

قورئان لەزمانەوانیدا چاوكی "قرأ"یە، دەوترێت: قرأ الكتابَ قراءة "كتێبەكەی خوێندەوە بەخوێندن". (و قُرآناً بالضم. و قرأ الشيء قُرآناً بالضم) واتە: خوێندییەوە و كۆیكردەوە و كردی بە یەك، لەوەوە ناونراوە قورئان، چونكە سورەتەكانی كۆكردووەتەوە لەنێوان دوو بەرگدا، خودای گەورەش دەفەرموێت: ﴿إِنَّ عَلَينا جَمْعَهُ وَقُرآنَهُ﴾. واتە: (لەسەر ئێمەیە كە قورئان لە دڵی تۆدا كۆكەینەوە و بشتوانی بیخوێنیتەوە[٦٥]).

بەڵام لای زانایان: (بریتیە لە كەلامی خودا كە لەڕێگەی جبریلەوە ـ سەلامی خودای لێبێت ـ ناردوویەتیە خوارەوە بۆ سەر دڵی پێغەمبەر (درودی خودای

---

١٩٧٢ ـ ل٢٦، هەروەها "طاش كبری" لە ڕووی ئامانجەوە جیاوازی كردووە لە نێوان زانستی كەلام و فەلسەفەدا و ئەمەی بۆ زیادكردووە ـ دەڵێ: (وتراوە ـ زانستی كەلام ـ بوونە لەڕووی بوونەوە، لەچیدا فەلسەفە لە زانستی خودایی جیادەبێتەوە، زانستی خودایی بەدوای بنەماكانی بوونی ڕەهادا دەگەڕێت بەو پێیەی كە ئامانجە، چونكە باسكردن لە زانستی كەلام لەسەر بنەماكانی شەرعە، بەڵام لەزانستی خوداییدا لەسەر داخوازی ئەقڵە)، بڕوانە: ـ مفتاح السعادة ـ جـ٢ ل٢٢، بۆیە خاڵی دەستپێك لای ئەهلی كەلام بریتی یە لە نەقڵ، ئیسپاتی ئەو بیروباوەڕە دەكەن كە ئاین هێناویەتی، جا كاتێ موعتەزیلە وتویانە (العدل و التوحید) ئامانجیان سەلماندنی ئەو بیروباوەڕانەیە كە دین هێناویەتی. بەڵام فەیلەسوف خاڵی دەسپێكردن لای ئەو بریتی یە لە ئەقڵ، باوەڕی بەو شتەیە كە عەقڵ پێی دەگات و پەیی پێ دەبات.

[٦٥] ـ مختار الصحاح.

لەسەر بێت) بە زمانی عەرەبی لە ڕێگەی دەستا و دەستی زۆرەوە ـ تواتر ـ گەیشتووە بە ئێمە، بەخوێندنەوەی عیبادەت و خواناسیمان دەست دەکەوێت، کەس ناتوانێ لەوێنەی ئەو بێنێ و دەستەوسانە لە بەرامبەریدا، لە دوو توێی پەڕاوێکدا نوسراوەتەوە، بە سورەتی ـ الفاتحة ـ دەست پێ دەکات و بە سورەتی ـ الناس ـ یش کۆتایی پێ دێت[66]).

لە ڕاستیدا زاراوەی قورئان ڕۆڵێکی زیندووی هەبووە لە سەرهەڵدانی زانستی کەلام بەشێوەیەکی گشتی و موعتەزیلەش بە شێوەیەکی تایبەتی، چونکە زاراوەی قورئان دەکرێت لەڕووی ئاشکرایی و شاراوەییەوە دابەشی بکەیت بۆ (مُحکم و مُتشابه)، "مُحکم" (بریتی یە لەو زاراوانەی کە ماناکەی ڕوونە لەبارەی ئەو حوکمەی باسی لێوە کردووە و هیچ جۆرە تەئویلکردن و تایبەتکردن و سڕینەوەیەك هەڵناگرێت چ لە ژیانی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) چ پاش وەفاتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت)، جگە لەو مانایەی خۆی هیچ مانایەکی دیکە هەڵناگرێت). بەڵام "مُتشابه" (بریتی یە لەو زاراوانەی کە ماناکەی شاراوەیە و ئاسان نەبووە بزانرێت ماناکەی چی یە، چونکە خودا خۆی وا مەبەستی بووە ئەو زاراوەیە بە شاراوەی بهێڵێتەوە و هیچ گریمانەیەکیش لەپێش یان لەپێشیەوە نەهاتووە کە ئاماژە بەو شتە شاراوەیە بکات، تەنها زاتی خودا خۆی دەزانێ مەبەستی پێی چی یە[67]). کەواتە زاراوەی (مُتشابه) بە پێچەوانەی زاراوەی (مُحکم)ە وە تەئویلکردن هەڵدەگرێت، ئەمەش بووە هۆی دەرکەوتنی زۆرێك لە ڕاوبۆچوونی جیاواز لەو بارەوە بۆ ئەوەی هەوڵی ئەوە

---

[66] ـ دار عبد المجید مطلوب ـ المدخل في التعریف بالفقه الإسلامي ـ ل١٦٦ ـ دار النهضة العربیة ـ ١٩٩٥م ـ ١٤١٥ ك.

[67] ـ د. محمد فرحات ـ أصول الفقه ـ ل١٤٩، ل١٥٣ ـ القاهرة ـ دار النهضة العربیة ـ ١٩٨٨م.

بدەن تا لەڕێگەی عەقڵەوە بگەن بە نزیکترین تەئویلێك کە ئەگەری ئەو زاراوەیە هەڵبگرێت، جا بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕوونتر باسی لێوە بکەین، باشتر وایە سەرەتا بزانین جیاوازی "تەفسیر و تەئویل" لە چیدایە، گەر هاتوو دانانی زاراوەکە بە بەڵگەیەکی (قطعي) هەندێ ئەگەری هەڵگرت ئەوە تەفسیرە، گەر هاتوو بەڵگەکە (ظني) بوو ئەوە تەئویلە[68] کەواتە تەئویل گومانە و ناگاتە پلەی "یقین"، بۆیە تا ئەو کاتەی تەئویل پشت ئەستوورە بە گومان ئەوە تا دێت بازنەی خیلاف و ڕاجیایی فراوان تر دەبێت، ڕێك وەك ئەوەی بەسەر ئەهلی کەلامدا ڕوویداوە، بۆ نموونە دەبینین لە قورئانی پیرۆزدا هەندێ ئایەت هاتووە ئاماژە بە "جەبر" دەکات و مرۆڤ هیچ دەسەڵاتێکی تێدا نییە، هەندێ ئایەتی دیکەش هاتووە ئاماژە بە ئازادی و ویستی مرۆڤ دەکات، نموونەی یەکەمیان خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوۡلَىٰنَاۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ﴿٥١﴾﴾[69] واتە: (ئەی موحەممەد - درودی خودای لێبێت - بڵێ: هەرگیز لەوە زیاترمان بۆ پێش نایەت و توشمان نایەت جگە لەوەی کە خودا بۆی نوسیوین، ئەو زاتە هەمیشە یار و یاوەر و پشتیوانمانە، دەبا ئیمانداران هەر پشت بەو خودایە ببەستن). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَلَوۡ شِئۡنَا لَأٓتَيۡنَا كُلَّ نَفۡسٍ هُدَىٰهَا وَلَٰكِنۡ حَقَّ ٱلۡقَوۡلُ مِنِّي لَأَمۡلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ أَجۡمَعِينَ ﴿١٣﴾﴾[70] واتە: (بێگومان گەر بمان ویستبایە هەموو کەسێکمان هیدایەت و ڕێنموویی دەکرد - بە ناچاری و

---

[68] - هەمان سەرچاوەی پێشوو - ل١٤٧ - پەراوێزی ١.

[69] - سورەتی - التوبة - ئایەتی ٥١.

[70] - سورەتی - السجدة - ئایەتی ١٣.

بەبێ ویستی خۆیان - بەڵام بڕیاری من ئەوەیە - ئادەمیزاد و پەرییەکان سەربەست و سەرپشك بکەم و ئازاد بکەم - سەر ئەنجامیش هەر دۆزەخ پڕ دەکەم لە پەرییەکان و لە خەڵکی تێکڕا - لەوانەی بڕوایان بە خودا و پێغەمبەرەکەیان نەبوو -). نموونەی دووەمیش خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِي لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ ﴿١٠٨﴾﴾[71] واتە: (ئەوەی ڕێبازی هیدایەتی وەرگرتبێت ئەوە سودی بۆ خۆیەتی، ئەوەش گومڕا بوو بێت و ڕێی ون کردبێت، ئەوە گومڕاییەکەی لەسەر خۆی دەکەوێت و من لێپرسراو و چاودێر نیم بەسەر کار و کردەوەی ئێوەوە).

جا لەبەرامبەر ئەم ئایەتانەی قورئانی پیرۆزدا تەئویلاتەکان جیاوازن، هەندێك دەڵێن مەبەستی ئایەتەکان ئیرادە و ویستی مرۆڤ دەردەخات و تیایدا نکۆڵی قەدەری کردووە، وەك - قەدەرییەکانی سەرەتا لە نێویشیاندا موعتەزیلەکان - هەندێکی تریش دەڵێن مەبەست پێی "جەبر" و ناچاریە و هیچ ویستێکی مرۆڤی تێدا نییە وەك ئەوەی لە پێشتردا بە درێژی بینیمان.

هەروەها لە قورئانی پیرۆزدا چەند ئایەتێکی تێدایە کە ئیسپاتی سیفەتەکانی خودای گەورە دەکات، وەك ئەم ئایەتە پیرۆزە کە خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿١٨١﴾﴾[72] واتە: (بەڕاستی خودا بیسەر و زانایە - بە گوفتار و

---

[71] - سورەتی - یونس - ئایەتی ١٠٨.

[72] - سورەتی - البقرة - ئایەتی ١٨١.

نیبەتتان). هەروەها لە ئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴾[٧٣] واتە: (خودا فراوانگیر و زانایە). هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴾[٧٤] واتە: (خودا بینایە بەو کار و کردەوانەی دەیکەن). لەگەڵ زۆرێك ئایەتی ترد کە مەسەلەی سیفەتەکانی خودایان وروژاند و بووە گرفت لەنێوان ئەوانەی کە ئیسپاتی سیفەتەکانی خودا دەکەن لەگەڵ ئەوانەی کە نکۆڵی سیفەتەکانی خودا دەکەن[٧٥].

پاشان گەورەترین گرفتی کەلامی هاتە ئاراوە ئەویش ئەوەبوو ئایا قورئان کەلامی خودایە و وەك خودا کۆنە یان ئەوەتا کۆن نییە و دروستکراوە؟ تەنانەت زانستی کەلام بۆیە ئەم ناوەیان بەسەردا بڕا، چونکە لەسەر ئەم بابەتانە قسەیان دەکرد[٧٦].

بۆیە پێمان وایە لەبەر ئەوەی قورئانی پیرۆز هەندێ ئایەتی (مُتشابە)ی لە خۆ گرتووە و عەقڵی مرۆڤەکانیش ئەو جیاوازییەیان بۆ دروست بووە، بۆیە ئەمە بووە هۆکارێك بۆ دەرکەوتنی گروپە کەلامیەکان ـ لە نێویشیاندا موعتەزیلە ـ وەك هەوڵێك لەپێناو تەئویلکردنی ئەم ئایەتانەدا، بۆ ئەوەی لەگەڵ بنەما ئیمانیەکاندا ڕێککەوێت کە ئەوان دایانناوە و پشتیوانی لێ دەکەن، وەك ئەوەی کە لەلاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا بەرچاومان کەوت.

---

[٧٣] ـ سورەتی ـ البقرة ـ ئایەتی ٢٤٧.

[٧٤] ـ سورەتی ـ البقرة ـ ئایەتی ٢٦٥.

[٧٥] ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

[٧٦] ـ بڕوانە پەراوێزی٢.

## دووەم: بڕیاردان لەسەر ئەنجامدەری گوناهی گەورە:

مەسەلەی بڕیاردان لەسەر ئەو کەسەی کە گوناهی گەورە ئەنجام دەدات کاریگەری گەورەی هەبوو بۆ پشتگیریکردن مەزهەبی ئیعتیزال، لەڕاستیدا ئەم مەسەلەیە پێش ئەوەی واصل ئەو بڕیارە بەناوبانگە بدات ورووژێنرا بوو، ئەوەبوو خەواریجەکان وتیان هەر کەسێکی بڕوادار گوناهێکی گەورە ئەنجام بدات پێی کافر دەبێت، مورجیئەش هاتن وتیان: تاوان هیچ زیانێك ناگەیەنێت بە باوەڕ بەڵکو حیسابیان لەلای خودایە لە ڕۆژی دواییدا[77]، پاشان "واصلی کوڕی عەطاء" هات و وتی: ئەو کەسەی گوناهی گەورە ئەنجام دەدات نە کافری تەواوە و نە بڕواداری تەواو، بەڵکو لە نێوان هەردووکیاندایە کە ئەویش فاسیق بوونە[78]. بەڵام لەڕاستیدا جیاوازییەکان تەنها جیاوازی تیۆری نەبوون، بەڵکو دەکرێت لەسەر ئەم بنەمایە بڕیار لەسەر بەشداربووانی هەردوو جەنگی صفین و جەمەلیش بدرێت بە تایبەتیتر بڕیار لەسەر خەلیفەکانی ئومەوی، چونکە ئەوان کاروباری دەوڵەتیان بەدەستەوە بوو، بەپێی بۆچوونی ئەوان ئەوانەی خوێنیان ڕژاندووە تاوانباری گەورەن، جا ئایا ئەوانە بەپێی بۆچوونی خەواریجەکان کافربوون یان ئەوەتا بەپێی بۆچوونی مورجیئە وازیان لێ بهێنرێت و حەق و حیسابیان لای خودایە لەڕۆژی دواییدا یان ئەوەتا پێی "فاسق" دەبن؟ کەواتە بڕیاردان لەسەرئەنجامدەری گوناهی گەورە ڕەهەندێکی سیاسی لەخۆگرتبوو کەئومەوییەکان بەر لەکەسانی تر لێی تێگەیشتبوون.

---

[77] ـ شەهرستانی ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل١٢٩.

[78] ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

## سێهەم: بەرگریکردن لە ئاینی ئیسلام:

گومانی تێدا نییە لەو ساتەوەی ئاینی ئیسلام دەرکەوتووە تا ئێستاشی لەگەڵدا بێ، بەردەوام دووچاری چەندین هێرشی توند بووەتەوە لەلایەن نەیارەکانیەوە، ئامانج لەهەموو ئەمانەش تێکدانی پایە بەهێزەکان و گاڵتەپێکردن بوو بە بنەڕەتەکانی، ئەمەش جگە لەگومان دروستکردن نەبێت لە بیروباوەڕی ئیسلامدا بە هیچی دیکە دروست نابێت، چونکە ئیسلام بۆ خۆی لەسەر چەند پایەیەك بونیاد نراوە، گەر ـ خودا نەکردە ـ ئەو پایانە تێکدرا، ئەوا پایەکانی ئیسلام تێك دەچێت و لەناو دەبرێت.

لەڕاستیدا کاتێ موعتەزیلە سەری هەڵدا و ئیسلامیش ـ وەك نەریتی خۆی ـ لەهەموو لایەکەوە دوژمن گەمارۆی دابوو، لەوێ هەندێ کەس موسڵمان ببوون نە لەبەر ئەوەی کە باوەڕیان بە ئیسلام هێنابێت و بڕوایان پێی هەبێت، بەڵکو لەبەر چەند مەرام و مەبەستێك بوو کە لەناخیاندا حەشاریان دابوو. هەندێکی تریان بۆ ئەوە موسڵمان ببوون تا ماڵێك یان پلە و پێگەیەکی دونیایی دەستکەوێت، هەندێکی دیکەشیان موسڵمان ببوون بۆ ئەوەی تۆڵە لە موسڵمانان بکەنەوە، جا مەترسی ئەمانە زۆر لە مەترسی ئەوانە زیاتر بوو کە بێباوەڕی خۆیان ئاشکرا کردبوو.

بۆیە دەبینین موعتەزیلەکان بەرامبەر هەموو ئەو لەمپەر و ئاریشانە وەستانەوە کە پێچەوانە بوو لەگەڵ بیروباوەڕی ئیسلامدا، بۆ ئەوەی ئیسپاتی یەکتاپەرستی خودا بکەن و تاقانەیی بسەلمێنن وتیان خودا سیفاتی نییە و نکۆڵیان لێکرد، ئەوەبوو جولەکەکان لەبارەی هاوشێوەوە وتیان خودا لێکچووی هەیە، لەبەر ئەوەی بینیان کە تەوراتەکەیان پڕیەتی لە هاوشێوە و لێکچوواندن، لەوانە: وێنە و قسەکردنی ڕووبەڕوو، قسەکردنی ئاشکرا، دابەزینی

خودا بۆ سەر كێوی سەینا بە جوڵە، واتە: گواستنەوە لە شوێنێكەوە بۆ شوێنێكی تر، وەستانی خودا لەسەر عەرش بە جێگیری و چەندینی تر[79].

یەكەم كەس كە لەنێو موعتەزیلەدا خۆی ئامادەساز كرد بوو بۆ ئەوەی بەرگری لە ئاینی ئیسلام بكات و بنەماكانی موعتەزیلە بلاوبكاتەوە "واصلی كوڕی عەطاء" بوو، یەكێك لەو هەڵوێستانەی كە "واصلی كوڕی عەطاء" گرتیە بەر، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی بەرگری لە ئاینی ئیسلام كردووە، ئەو هەڵوێستەش ئەوەبوو كە لەبەرامبەر "بەشاری كوڕی بوردا" گرتیەبەر، بەتایبەت كاتێ بۆی ئاشكرابوو كە بێباوەڕە، لەڕاستیدا بەشار پێی وابوو كە ئیبلیس ـ نەفرەتی خودای لێبێت ـ لەسەر حەق بووە كاتێ ڕەتیكردوەتەوە كڕنووش بۆ ئادەم ببات ـ سەلامی خودای لێ بێت ـ لەم بارەوە شیعرێكی هۆنیوەتەوە و دەڵێ:

الأرض مظلمة والنار مشرقة

والنار معبودة مذ كانت النار[80]

واتە: (زەوی تاریكە و ئاگریش درەوشاوەیە، لەو كاتەوەی ئاگر بووە ئاگر پەرستراو بووە).

جا كاتێ واصل تەواو دڵنیابوویەوە لە بێباوەڕی بەشار وتی: (أما لهذا الأعمى الملحد، أما لهذا المشنف المكني بأبي معاذ من يقتله...؟ أما والله لولا أن الغيلة سجية من سجايا الغالية لدسست إليه من يعج بطنه على مضجعه، ويقتله في جوف الليل وفي يوم حفله[81]). واتە: (ئایا كەسێك نییە ئەم بێباوەڕە كوێرە لێو هەڵگەڕاوە بكوژێت كە بە ئەبو موعاذ ناسراوە...؟ سوێند بێت بە

---

[79] ـ شەهرستانی ـ الملل و النحل ـ جـ1 ـ ل218.

[80] ـ أبو الفرج الأصفهاني ـ الأغاني ـ جـ3 ـ ل145 ـ دار الكتب المصرية ـ 1929.

[81] ـ الجاحظ ـ البيان و التبيين ـ جـ1 ـ ل31.

خودا گەر بە نهێنی کوشتنی ئەم پیاوە کارێکی مەردانە نەبوایە ئەوا کەسێکم بۆ ڕادەسپارد سکی ڕابدات لەسەر جێگاکەیدا، یان ئەوەی لە نیوەی شەودا یان لە کاتی خۆشی و شادیەکانیدا بیکوژێت). واصل بە مەش نەوەستا تا ئەوەی لە بەصرە دووریخستەوە، بەڵام ئەوەبوو پاش مردنی واصل جارێکی تر گەڕایەوە بۆ بەصرە[٨٢].

خێزانی واصل باس دەکات و دەڵێ: هەر کاتێ شەو دادەهات، "واصل" هەردوو قاچی ڕێکدەخست و نوێژی دادەبەست، کاغەز و کەرەستەی نوسینەکانیشی لەبەردەم خۆیدا دادەنا، هەر کاتێ بەسەر ئایەتێکدا گوزەری بکردبایە و بیزانیایە ئایەتەکە وەڵامێکە بۆ نەیارەکانی، دادەنیشت و ئایەتەکەی دەنوسیەوە، ئەوجا دەگەڕایەوە بۆ نوێژەکەی[٨٣].

لەڕاستیدا خەڵکێکی زۆر لەسەر دەستی "واصلی کوڕی عەطاء" موسڵمانبوون، لەم ڕیوایەتەدا هاتووە کە باس لە هەندێ "سەمەنیە" دەکات - ئەوانەی کە بڕوایان بە قەدیمی ژیان و دۆنای دۆنە "تناسخ الأرواح" کە پێیان وایە ڕۆح نامرێت لە کەسێکەوە دەچێتە کەسێکی ترەوە - لەسەر دەستی واصل موسڵمانبوون، قازی عەبدولجەبار دەگێڕێتەوە: (جارێکیان هەندێ لە "سەمەنیەکان" وتیان بە جەهمی کوڕی صەفوان: ئایا شتێك کە ناسراوە لە پێنج هەستیارەکە دەچێتە دەرەوە؟ وتی: نەخێر، وتیان: دەی کەوایە باسی پەرستراوەکەی خۆتمان بۆ بکە، ئایا بە یەکێك لەم هەستیارانە ناسیووتە، وتی: نەخێر، صەفوانیش نەیتوانی وەڵامیان بداتەوە بێدەنگبوو. بۆ ئەم مەبەستە نامەی نوسی بۆ واصلی کوڕی عەطاء و پرسیارەکەیانی تێدا باسکرد، ئەویش

---

[٨٢]- الأصفهاني - الأغاني - جـ٢ - ل٢٤.

[٨٣]- إبن المرتضى - المنية و الأمل - ل١٩.

وەڵامی دایەوە و وتی: ـ لەسەروو پێنج هەستیارەکەوە ـ ڕووی شەشەمی وەك مەرج دەگیرێتە بەر کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ـ ناسراو ـ لە هەست و شعور یان بەڵگە ناچێتە دەرەوە، بۆیە لێیان بپرسە، ئایا جیاوازی لەنێوان کەسێکی زیندوو یان مردوودا دەکەن یان جیاوازی لەنێوان کەسێکی شێت یان ئاقڵدا دەکەن؟ ئەمەش بە بەڵگە ناسراوە، کاتێ جەهمی کوڕی صەفوان بەم شێوەیە وەڵامی سەمەنیەکانی دایەوە، وتیان: ئەمە قسەی تۆ نییە، پێیان وت: ئەمە قسەی واصلە، ئیتر ئەوانیش چوون بۆ لای واصل و هەندێ مشتومڕ لە نێوانیاندا ڕوویدا و دواتر موسڵمانبوونی خۆیان لەسەر دەستی واصل ڕاگەیاند[٨٤]).

هەرچی قوتابی و هاوەڵەکانی واصلیش بوو، ئەوا هەمان ڕێبازیان گرتبووە بەر، دەگێڕنەوە عەمری کوڕی عوبێد لەگەڵ مەجوسیەکدا لەناو کەشتیەکدا موناقەشە و مشتومڕیان دەبێت، عەمر پێی دەڵێت: بۆچی موسڵمان نابیت..؟ وتی: چونکە خودا ئیسلامبوونی منی ناوێت، گەر خودا بیویستبایە ئیسلام ببم ئەوا دەبوومە موسڵمان. عەمر وتی: خودا ئیسلامبوونی تۆی دەوێت، بەڵام شەیتانەکان وازت لێ ناهێنن. مەجوسیەکە لە وەڵامدا وتی: دەی من دەمەوێت لەگەڵ هاوەڵە زاڵەکەدا بم[٨٥].

لەڕاستیدا هەموو پەرۆشیەکی موعتەزیلەکان ئەوەبوو ڕێنماییەکانی ئیسلام بڵاوبکەنەوە، لەم پێناوەشدا هیچ کەمتەر خەمیەکیان نەکرد، ئەوەبوو بەردەوام پەیوەندیان لەگەڵ خەلیفەکاندا هەبوو هەمیشە ئامۆژگاریان دەکردن، ئەم پەیوەندیەشیان ـ بەتایبەت موعتەزیلەکانی پێشین ـ هیچ کات لەپێناو

---

[٨٤] ـ القاضي عبد الجبار ـ فرق و طبقات المعتزلة ـ ل٤٧.

[٨٥] ـ بڕوانە زهدی جارالله ـ ل٤٠.

بەرژەوەندی خۆیاندا نەبووە، ئەوەتا دەگێڕنەوە جارێکیان عەمری کوڕی عوبێد هاتە لای ئەبو جەعفەری مەنصور[٨٦] لە سەردەمی خیلافەتیدا، خەلیفە لەخۆیی نزیك کردەوە و لای خۆی داینیشاند و پێی وت: ئامۆژگاریم بکە، ئەویش وتی: کاروباری خەڵکی لەژێر دەستی تۆدایە، خۆ گەر لەژێر دەستی کەسانی پێش تۆ بمایاتەوە نەدەگەیشتە دەستی تۆ، بۆیە ئاگادارت دەکەمەوە بە شەوێك کە ڕۆژەکەی دەردەکەوێت و ئیتر شەوێکی تری بەسەردا نایەتەوە، کاتێ ویستی هەستێت و بڕوات، ئەبو جەعفەری مەنصور فەرمانیدا بڕێك پارەی بۆ بێنن، عەمریش پارەکەی وەرنەگرت، ئەبو جەعفەری مەنصور وتی: سوێند بەخودا دەبێت وەری بگریت، وتی: سوێند بەخودا وەری ناگرم لەو کاتەدا "مەهدی کوڕی ئەبو جەعفەری مەنصور" ئامادەبوو، پێی وت: ئەو پارەیە وەرگرە ئەمیری باوەڕداران سوێندی خواردووە، عەمر وتی: ئەمیری باوەڕداران توانای زۆرترە لەدانەوەی کەفارەتی سوێندێك تا مامت، ئەبو جەعفەری مەنصور وتی: چ پێداویستیەکت هەیە داوای بکە تا بۆتی جێبەجێ بکەم؟ وتی: داوات لێدەکەم نەنێریت بەشوێنمدا تاخۆم دێم بۆ لات، تا داواشت لێنەکەم هیچم مەدەرێ، وتی: دەزانی مەهدی کوڕم کردووە بە جێنشینی خۆم؟ عەمر وتی: کاروبارەکانی بۆ دێتە پێش و خیلافەتی پێ دەدرێت لە ڕۆژێکدا کە تۆ سەر قاڵیت. ئەبو جەعفەری مەنصوریش بەم کۆپلە شیعرە مەدح و پیاهەڵدانی عەمری کرد:

---

[٨٦] ـ عەبدوڵلای کوڕی موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی موحەممەد کوڕی عەلی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی عەبباسە، ئەو ڕۆژەی بوو بە خەلیفە تەمەنی شەصت و سێ ساڵ بوو، ماوەی خیلافەتەکەشی بیست و دوو ساڵی خایاندووە، لەساڵی ١٥٨ ك وەفاتیکردووە. بڕوانە ـ إبن حيان ـ السيرة النبوية و أخبار الخلفاء ـ ل٣٢٧.

كلكم يمشي رويد    كلكم يطلب صيد

غير عمرو بن عبيد[87]

واتە: (هەمووتان لەسەرخۆتان دەڕۆن و هەمووشتان داوای نێچیر دەکەن تەنها عەمری کوڕی عوبێد نەبێ).

باس لەوە دەکرێت کە ئەبو هوذەیلی عەللاف[88] کتێب گەلێکی زۆری دانا بۆ بەر پەرچدانەوە و بە درۆخستنەوەی هەموو ئەو مەزهەبانەی کە پێچەوانەی ئاینی ئیسلامبوون، گرنگترینیان کتێبی - میلاس - بوو. "میلاس" کابرایەکی مەجوسی بوو پاشتر موسڵمانبوو، هۆکاری ئیسلام بوونەکەشی ئەوەبوو ئەبو هوذەیل و هەندێ لە "ثەنەوییەکان" کۆبوونەوە بۆ مشتومڕ و موناقەشەکردن، بەڵام دواتر ئەبو هوذەیل توانی هەموو بەڵگەکانی ئەوان پوچەڵکاتەوە و سەرکەوێت بەسەریاندا. بۆیە "میلاس"یش موسڵمان بوو[89].

ئەبو هوذەیل لەگەڵ ڕافضی و مەجوسیەکانیشدا بەهەمان شێوە موناقەشە و مشت و مڕی دەکرد و بە کەمترین وشە هەموو بەڵگەکانیانی

---

[87] - بڕوانە - السيوطي - تأريخ الخلفاء - ل٢٢٧ - وفيات الأعيان جـ٣ - ل٤٦٣.

[88] - ئەبو هوذەیل موحەممەدی کوڕی هوذەیلی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی مەکحولی عەبدیە، ناسراو بە عەللاف (١٣١ك - ٢٣٥م) بۆیە بە عەللاف ناسرا بوو، چونکە لەبەصرەدا ماڵەکەی لەگەڕەکی عەلاف و ئالیك فرۆشەکاندا بووە، یەکێك بوو لە گەورەترین زاناکانی موعتەزیلە، شەهرستانی لە بارەیەوە دەڵێ: عەللاف ناودار و پێشەنگ و بڕیاردەر و ڕێکخەری موعتەزیلەکان بووە. بڕوانە - إبن المرتضى - المنية و الأمل - ل٥٦ - إبن خلكان - وفيات الأعيان - جـ٤ ل٦٥ - الملل و النحل للشهرستاني - جـ١ - ل٧٠.

[89] - المنية و الأمل - ل٥٥ - بڕوانە - وفيات الأعيان - جـ١ - ل٦٠٥ - بڕوانە - زهدي جار الله - ل٤٠.

پوچەڵدەکردەوە[90]، ئەوەبوو ئەبو هوذەیل لەگەڵ یەکێك لەناودارەکانی ئەنەویەدا[91] بە ناوی "صاڵحی کوڕی عەبدولقدوس"دا دیداری سازکرد، دەگێڕنەوە ئەم صاڵحە کوڕێکی مردووە زۆر بێتاقەت بووە بۆی، جارێکیان ئەبو هوذەیلی عەللاف دەگات بە صالح و پێی دەڵێ: ئەم بێتاقەتیەی تۆی تێدایت هیچ بیانوویەکی بۆ نادۆزمەوە، صاڵح وتی: بۆیە بێتاقەتم بۆی چونکە کوڕەکەم کتێبی "الشکوك"ی نەخوێندووەتەوە، "الشکوك" بریتی بوو لەو کتێبەی کە خۆی دایانابوو، دەڵێن هەر کەسێك ئەم کتێبەی بخوێندایەتەوە گومانی بۆ دروست دەبوو لەوەی کە بووە، تەنانەت گومانی بۆ دروست دەبوو کە هەر نەبووە، تەنانەت ئەوەشی کە هەر نەبووە گومانی بۆ دروست دەبوو کە بووە، ئەبو هوذەیل وتی: دەی تۆش گومان ببە لە مردنی کوڕەکەت و وایدابنێ کە هەر نەمردووە ئەگەرچی مردووە، یان وایدابنێ کوڕەکەت کتێبەکەتی خوێندووەتەوە ئەگەر چی کتێبەکەشی هەر نەخوێندووەتەوە[92].

---

[90]- زهدی جار الله، هەمان سەرچاوە.

[91]- ئەنەویە: بانگەشەی ئەوە دەکەن کە نور و تاریکی هەردووکیان کۆنن و ئەزەلین، ئەگەر چی لەناوەڕۆك و شێواز و کاریاندا جیاوازیشن، نور بەهۆی کردەوەی خێر و سود بەخشەوە دروست دەبێت، تاریکیش بەهۆی کردەوەی خراپ و زیانبەخشەوە دروست دەبێت، هەندێکیشیان دەڵێن: نور بە مەبەست و هەڵبژاردن دروست دەبێت، تاریکیش بەهۆی تێکەڵکردن و ڕێککەوتنەوە دروست دەبێت، گرنگترین گروپەکانیشیان بریتی یە لە: مانەوییە، مەزدەکیە، دیصانیە، مەرقیونیە، بڕوانە: الشهرستانی ـ الملل و النحل، لە جـ١ ـ لە ل٢٥١ تا ل٢٦٠.

[92]- المنیة و الملل ـ جـ١ ـ ل٤٥ ـ زهدي جار الله ـ ل٤٠.

دەگێڕنەوە لەسەر دەستی ئەبو هوذەیلی عەللاف زیاتر لەسێ هەزار پیاوی "مەجوس و وەثەنیە" موسڵمان بوون بە هۆی لێهاتوویی لە وەڵامدانەوەیاندا[93].

لێرەدا ناتوانین نکۆڵی لە "جاحظ" یش بکەین لەبەرامبەر ئەو کارە گرنگەی کە پێی هەستاوە، کە بریتی بوو لە بەرگریکردن لە ئاینی ئیسلام - یەکێك بووە لە موعتەزیلەکانی بەغداد و لە ساڵی ٢٥٥ك مردووە - لەڕاستیدا "جاحظ" لەپێناو بەرگریکردن لەئاینی ئیسلام کتێبێکی زۆری دانا، بەناوبانگترین کتێبیش کە لەو پێناوەدا داینا کتێبی "فضیلة المعتزلة" بوو، ئەم کتێبە تەنها بەرگری لە بنەماکانی ئیعتیزال نەکردووە، بەڵکو هاوکات وەڵامدانەوەیەکیش بوو بۆ ڕافیضەکان، هەر بۆیە ئەم کتێبە لەسەر دڵی رافضیەکاندا کاریگەرییەکی گەورەی بەجێ هێشت، ئەوەتا یەکێك لە پیاوەکانیان - ئیبن راوەندی - لەڕێگەی کتێبێکەوە بەناوی (فضیحة المعتزلة) وەڵامی کتێبەکەی"جاحظ"ی دایەوە، کە تیایدا زۆر شتی داوەتە پاڵ موعتەزیلە، ئەمە لەکاتێکدا بیرو بۆچوونیان بەو شێوەیە نەبووە کە ئەو دەیڵێ، لەبەرامبەر ئەمەدا "ئەبو لحوسەینی خەیاط" لە کتێبێکەیدا بەناوی (الإنتصار و الرد علی إبن الراوندي الملحد) تیایدا وەڵامی هەموو ئەو تۆمەتانەی دایەوە و بنەما ڕاست و دروستەکانی موعتەزیلەشی ڕوونکردەوە[94].

زۆربەی ئەو تۆمەتانەش کە ئاڕاستەی موعتەزیلەکان دەکرا بێ ئینسافی تێدابوو، تەنانەت لایەنگیری تێدابوو بۆ پێشەنگی تۆمەتبارەکان، موعتەزیلەکان

---

[93] - هەمان سەرچاوەی پێشوو - جـ١ - ل٤٤ - د. أحمد العمرجي - المعتزلة في بغداد - ل١٦٩.

[94] - الإنتصار - ل١٠٥ - زهدي جار الله - ل٤٢.

چاكەی زۆريان هەبووە، ئەگەر چی هەندێ لەو كەسانە كە لەڕێگەی دینەوە تۆمەتبار دەكرێن لەگەڵ ئەواندابوون[٩٥].

لەمەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە كە موعتەزیلە هیچ كەمتەرخەمیەكیان نەكرد لەپێناو سەرخستن و شان و شكۆی ئیسلامدا، جا ئایا ئەم سەرخستنە لەڕێگەی بەستنی كۆڕ و دیدارەوە بووبێت یان لەڕێگەی دانانی كتێبەوە بووبێت بۆ ئەوەی وەڵامی بێباوەڕ و بێ دینەكانی پێ بدەنەوە، هەموو ئەم كارانەش وایكرد كە پێگەیان بەرزببێتەوە، كە دواتر بووە هۆی ئەوەی لەڕووی سیاسیەوە كاریگەری گەورە دروست بكات، وەك ئەوەی لە بەشی چوارەمی ئەم كتێبەدا خودا یار بێ دەیانبینین.

## چوارەم: كاریگەری فیكری مەسیحیەت:

ئاینی ئیسلام لەنیوە دوورگەی عەرەبیدا بڵاوبوویەوە و لەوێشەوە نور و ڕۆشنایی ئیسلام تاریكایی زۆربەی ئەو ناوچانەی ڕەواندەوە كە ئاوەدانی تێدابوو، جیهاد فەرز بوو، موسڵمانانیش بە ماڵ و بەگیان كۆششیان دەكرد بۆ سەرخستنی ئاینی ئیسلام، لەم جیهاد و بەرخودانەشدا ئامانجی گەورەیان تەنها بەدەستهێنانی شەهادەت بوو، بەردەوام موسڵمانان ناوچەی تازە و نوێیان ڕزگار دەكرد و خەڵكەكەشی باوەشیان بۆ جەنگاوەرە موسڵمانەكان دەكردەوە، تا دەهات ژمارەی موسڵمانان زیادی دەكرد و پانتایی خاكی ئیسلامیش فراوانتر دەبوو، نەریت و باوەكان زیاتر دەبوو، تیرە و هۆز و بنەماڵە جیاوازەكانیش بەهۆی نزیكیان لە یەكترەوە تێكەڵ بەیەكتر دەبوون،

---

[٩٥] ـ د. محمد أبو زهرة ـ أبو حنفية ـ ل١٧٢ ـ دار الفكر العربي ـ چاپی دووەم ١٩٤٧.

ئەمەش بووە هۆی ئەوەی پلەکانی ئیسلام و باوەڕ لەنێو خەڵکەکەیدا جیاواز بێت، جا لەنێو ئەو خەڵکەدا هەبوو بە زمان و دڵی موسڵمان ببوو، هەموو بیروباوەڕە کۆنەکانیشی لەبیر کردبوو، هەشبوو موسڵمان ببوو بەڵام بیروباوەڕە کۆنەکەی وەك ناسنامەی خۆی هێشتبووەوە، هەندێکیش هەبوو تەنها بە زمان موسڵمان ببوو، ڕق و کینەی لەنێو دڵیدا بەرامبەر بە ئیسلام و موسڵمانان دەشاردەوە و بۆ فرسەتێك دەگەڕا تا تۆڵەیان لێ بکاتەوە، هەندێکی دیکەش هەبوو موسڵمان نەبوو هەر لەسەر ئاینەکەی خۆی مابوویەوە و لە ذیمەی موسڵماناندا بوو، وەك گاور و جولەکە و مەجوسەکان، بەڵام هەموو ئەمانە لەیەك کۆمەڵگادا دەژیان، ئیتر لەم نێوەندەدا بیروبۆچوونەکان لەنێو خەڵکیدا وەك ڕەشەبا بڵاودەبوویەوە، هەموو کاریگەریان لەسەر یەکتر دادەنا و بە یەکتریش کاریگەر دەبوون، پێکەوە لەنێو خۆیاندا موناقەشە و مشتومڕ ڕووی دەدا و دیداریان دەبەست، جارێك دەدۆڕان و جارێکیش سەردەکەوتن، موسڵمانانیش لەم نێوەندەدا بە هۆی سەرقاڵبوونیان بە فتوحاتاتەوە کاتێك بە خۆیان زانی لەهەر چوار لاوە گەمارۆ دراون و ڕووبەڕووی جۆرەها فیکر و ئاینی نوێ بوونەتەوە، بە جۆرێك کە پێشتر شتی وەهایان نەبینیبوو، بۆیە لەبەردەم هەموو ئەمانەدا دەستەوسان مابوونەوە، بەڵام زۆری نەخایاند لەنێو دەریایی ئەم فیکر و ئایدیانەدا کە شەپۆلی دەدا موسڵمانەکان دەستیاندایە مەلەکردن، جا هەر کەس مەلەی باشی نەزانیبایە ئەوە بێگومان چارەنووسی خنکان و نغرۆ بوون بوو.

موعتەزیلەش حاڵیان وەك حاڵی تەواوی موسڵمانان بوو، ئەوەبوو تێکەڵ بە کۆمەڵێك بیروبۆچوونی جیاواز و لادەر بوونەوە کە پێچەوانەی مەزهەبەکەیان بوو، بینیمان کە چۆن موعتەزیلەکان لەگەڵیاندا مشتومڕ و موناقەشەیان دەکرد

و ئاینی ئیسلامیان بەسەر ئاین و بیروبۆچوونەکانی ئەواندا سەر دەخست، لەڕاستیدا لەنێو هەموو ئاین و بیروبۆچوونەکاندا ئاینی مەسیحی کاریگەری گەورەی هەبوو ـ بەجۆرێك لەجۆرەکان ـ لە دەرکەوتنی بیری موعتەزیلەدا، ئەوەبوو سوپای موسڵمانەکان فەتحی ولأتانیان کرد، خەڵکی ئەو ناوچانەش هەموو گاوربوون، گاورەکانیش لە کاتی فتوحاتەکاندا بەسەر چەند گروپ و دەستەیەکدا دابەش ببوو، لەڕووی ڕۆژهەلأتیەوە بەناوبانگترینیان بریتی بوو لە: یەعاقیبەکان کە بە ناوچەکانی "میصر و نەوبە و حەبەشە"دا بلأو ببوویەوە، نەساطیرەکانیش بە ناوچەکانی "موصلّ و عێراق و ولأتی فارس"دا بلأو ببوونەوە، مولکانیەش بە ولأتی "مەغریب و صەقەلیە و ئەندەلوس و شام"دا بلأوو ببوویەوە[٩٦].

جا ناوکرۆکی جیاوازی نێوان گروپ و دەستەکانی نێو گاورەکان بریتی بوو لە سروشتی مەسیح و تێکەڵکردن لە نێوان لاهوت و ناسوتدا.

بێگومان قورئانی پیرۆز هەموو ئەم جیاوازی و پڕوپاگەندانەی بۆ ڕوون کردوینەتەوە کە گاورەکان بانگەشەی پێ دەکەن بۆ مەسیح "سەلامی خودای

---

[٩٦] ـ یەعاقیبەکان دەڵێن: خودا بریتی لە مەسیح. خودا لەم گۆشت و خوێنەدا کۆبووەتەوە، کەواتە مەسیح خودایە.

نەساطیرەکانیش دەڵێن: خودا لەگەڵ مەسیحدا یەکیگرتووە و ئەندامەکانی لەشی بەفەرمانی خودا دەجوڵێتەوە، وەك گڵۆپێك وەهایە کە شتی وردی تێدا بێت.

مولکانیەش دەڵێن: خودا لەگەڵ مەسیحدا یەکیگرتووە و تێکەڵی بووە، وەك چۆن ئارەق و ئاو و ماست تێکەڵ دەبێت.

بڕوانە ـ الملل و النحل للشهرستاني ـ جـ١ ـ ل٢٢٨، ل٢٣٢ ـ أحمد أمين ـ فجر الإسلام ـ ل١٩٦.

لێبێت"، ئەوەتا خودا دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَـٰثَةٍ﴾[97]. واتە: (سوێند بێت بە خودا بێگومان ئەوانەش بێ باوەڕبوون کە وتیان: خودا یەکێکە لە سێ دانە خودا). هەروەها دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ ۖ﴾[98]. واتە: (سوێند بە خودا بەڕاستی ئەوانە بێباوەڕ بوون کە وتیان: خودا هەر مەسیحی کوڕی مەریەمە).

مەسیح پێغەمبەریش "سەلامی خودای لێ بێت" خۆی بێبەری دەکات لە هەموو ئەم بانگەشە و قسەلۆکانە، قورئانی پیرۆز زۆر بە جوانی ئەم بەرگریکردنەی مەسیح پێغەمبەرمان "سەلامی خودای لێ بێت" بۆ ڕوون دەکاتەوە لەوەی کە داویانەتە پاڵی، ئەوەتا خودا دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى وَأُمِّىَ إِلَـٰهَيْنِ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ مَا يَكُونُ لِىٓ أَنْ أَقُولَ مَا لَيْسَ لِى بِحَقٍّ ۚ إِن كُنتُ قُلْتُهُۥ فَقَدْ عَلِمْتَهُۥ ۚ تَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِى وَلَآ أَعْلَمُ مَا فِى نَفْسِكَ ۚ إِنَّكَ أَنتَ عَلَّـٰمُ ٱلْغُيُوبِ ﴿١١٦﴾﴾[99].

واتە: (ئەو کاتەش وەبیر بێنە کە خودای کارزان لە ڕۆژی قیامەتدا بە عیسای کوڕی مەریەم دەڵێ: ئایا ئەوە تۆ بەخەڵکیت وتووە: لە بری خودای تاك و تەنها خۆت و دایکت بکەنە دوو خودا؟! عیسا لە وەڵامدا دەڵێ: پاکی و بێگەردی و بێ هاوەڵی شایستەی تۆیە، بۆم نییە من شتێك بڵێم بۆ خۆم کە

---

[97] ـ سورەتی ـ المائدة ـ ئایەتی ٧٣.

[98] ـ سورەتی ـ المائدة ـ ئایەتی ٧٣.

[99] ـ سورەتی ـ المائدة ـ ئایەتی ١١٦.

مافی من نەبێت؟! خۆ گەر شتی وەهام وتبێت ئەوە بەڕاستی تۆ دەیزانیت و لێت شاراوە نییە، چونکە تۆ دەزانیت بە هەرچی لە دڵ و دەروونمدا هەیە، بەڵام من نازانم بەوەی کە لە دەریای عیلم و زانستی بێ پایانی تۆدا هەیە، چونکە بەڕاستی هەر تۆ زانا و شارەزای نهێنی و پەنهانیت). پاشان بڕیاری جیاکەرەوە لەلایەن خوداوە دەردەچێت سەبارەت بە سروشتی مەسیح و مەریەمی پاک داوێن لەم ئایەتە پیرۆزەدا کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞۖ كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ ثُمَّ ٱنظُرۡ أَنَّىٰ يُؤۡفَكُونَ ﴾[١٠٠]. واتە: (مەسیحی کوڕی مەریەم هیچ شتێك نییە ـ نە خودایە و نە کوڕی خودایە ـ جگە لە پێغەمبەرێکی خودا نەبێت، بەڕاستی پێش ئەو چەندەها پێغەمبەری تریش ڕابوردوون، دایکیشی ئافرەتێکی زۆر ڕاست و ڕاستگۆیە، هەردووکیان خواردنیان دەخوارد ـ وەك هەر مرۆڤێکی تر ـ سەیر بکە و سەرنج بدە ـ ئەی موحەممەد ئەی بڕواداران ـ چۆن هەموو فەرمان و بەڵگەیەکیان بۆ ڕووندەکەینەوە، لەوە و دواش تەماشەکە چۆن ڕوویان لە حەق وەردەچەرخێنرێت و لەڕاستی لا دەدرێن!). جا بیروباوەڕەکانی مەسیحیەت ـ لەباسی تاکو تەنهایی خودای گەورەدا ـ کاریگەری زۆری هەبوو لە بەهێزکردنی موعتەزیلەدا، بۆیە تەواو خۆیان ئامادەساز کردبوو، تا لەڕێگەی بەڵگەی عەقڵیەوە بەر پەرچی هەموو ئەو بیروباوەڕە خراپانە بدەنەوە، ئەوەبوو گاورەکان ئینکاری قورئانیان دەکرد، لەم پێناوەدا موعتەزیلەکانیش بەرگریی

---

[١٠٠] ـ سورەتی ـ المائدة ـ ئایەتی ٧٥.

تەواویان لە تاکو تەنهایی خودا کرد و بە چەندین ڕێگا هەستان بە سەلماندنی یەکێك لە گرنگترین بنەماکانیان کە بنەمای "توحید"ە ـ بەتایبەت موعتەزیلەکانی پێشین ـ بەردەوام مشتومڕیان لەگەڵدا دەکردن و خۆیان بە تەواوەتی یەکلاکردبوویەوە بۆ وەڵامدانەوەی هەموو ئەو تاقم و دەستانەی کە باوەڕیان بە قورئانی پیرۆز نەبوو، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی زۆرێك لە خەڵکی بەوپەڕی قەناعەتەوە بێنە ناو ئاینی ئیسلامەوە و موسڵمان بن.

کاتێك دەوڵەتی ئیسلامیش فراوان بوو، پێویستی بەوەکرد کە دامو دەزگاکان لەڕووی کارگێڕییەوە سەر لە نوێ بەهێز بکرێتەوە تا بتوانێ لەتەواوی ناوچەکاندا کاروبارەکان بەشێوەیەکی ڕێکوپێك بەڕێوە ببرێت، هەروەها پێویستی بەوەش کرد کە چەند دیوانێکی نوێ دابمەزرێنێت تا لەڕێگەیەوە ئاگاداری هەموو کاروبارێکی گەورە و بچووك ببێت، هەرچی عەرەبەکانی دوورگەی عەرەبیش بوو ئەوا هیچ شارەزابییەکیان لەو بوارانەدا نەبوو، چونکە زۆربەیان سەرقاڵی ژیانی سادەی گوندەکان بوون و خۆیان بە مەڕ و ماڵاتەوە خەریك کرد بوو، ئەوەبوو ـ لەسەردەمی دەوڵەتی ئومەوییدا ـ پشتیان بە پیاوە ئاینییەکانی نێو ئاینەکانی دیکە بەست بۆ ئەوەی لەڕووی کارگێڕییەوە یارمەتیان بدەن و سەرپەرشتی کاروباری دامو دەزگاکانی دەوڵەت بکەن، بۆ ئەم مەبەستە ئومەوییەکان هەستان بەنزیککردنەوەی ئەو کەسانەی کە لە نێو ئاینەکانی دیکەدا شارەزاییان هەبوو، طەبەری دەگێڕێتەوە و دەڵێ: موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان سەرجۆنی کوڕی مەنصوری ڕۆمی کرد بە نوسەری خۆی و خاوەن بڕیار، پاش مردنی موعاویەش سەرجۆن هەر لەو شوێنەی خۆیدا مایەوە، ئەوەبوو یەزیدی کوڕی موعاویەش لە کاتی نارەحەتیەکاندا ڕاوێژی پێدەکرد و بۆچوونەکانی وەردەگرت، تەنانەت پاش

مردنی سەرجۆن کوڕەکەی ـ یەحیای دیمەشقی ـ[١٠١] جێگەی گرتەوە و لەشوێنی باوکیدا درێژەی بە کارەکانیدا. یەحیای دیمەشقی لەساڵی "٨١ ك" لە دایکبووە و لەساڵی "١٣٢ ك" مردووە، ناوی عەرەبیەکەشی مەنصوور بوو، ئەم پیاوە زانایەکی گەورە بوو لەنێو پیاوە ئاینیەکاندا، هەروەها قەشەیەکی بەڕێزی نێو هەردوو کڵێسای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواش بوو، لەڕاستیدا ماوەیەك خزمەتی ئومەوییەکانی کرد و پاشان لە ساڵی ١١٢ کۆچیدا وازی لە کارکردن هێنا و پەیوەندیکرد بە یەکێك لە پەرستگاکانەوە لە نزیك قودس، ئیتر ئەو ماوەی کە مابووی لە ژیانیدا تەرخانیکرد بوو بە بابەتە ئاینیەکان و ڕێکخستنی کتێبەکانی لاهوتەوە، یەحیای دیمەشقی لەزانستی کەلامدا شارەزاییەکی باش و پێگەیەکی بەرزی هەبوو، بۆیە لەکاتی مشتو مڕ و موناقەشەکانیدا پشتی بە زانستی کەلام دەبەست و لەڕێگەی هێنانەوەی بەڵگەی عەقڵیەوە بەرگری دەکرد لەبیروباوەڕ و ئاینەکەی، کاریگەری یەحیاش تەنها کورت هەڵنەهاتبوو لەسەر ڕۆژهەڵاتی مەسیحیەت، بەڵکو لەڕووی ڕۆژئاواشەوە کاریگەری هەبوو، جا کاتێك یەحیای دیمەشقی بەم شێوە بەهێزە کاریگەری هەبوو، ئەو موسڵمانە عەرەبانەی لەگەڵیاندا دەژیان کاریگەری ئەویان بەسەرەوە بوو[١٠٢]، لەپاش یەحیای دیمەشقی قوتابیەکەی "تیودور ئەبو قورە" ڕێگاکەی ئەوی گرتەبەر کە لەساڵی ٢١١ کۆچی مردووە، لە ڕاستیدا لەنێوان ئەبو قورە و زانایانی موسڵماندا مشتومڕ و دیداری زۆر ڕوویدا، خەلیفە مەئمونیش هەموو ڕۆژێکی سێشەممان دادەنیشت بۆ ئەوەی گوێ لە و دیدار و مشتومڕانە بگرێت لەبواری فیقهدا، دەگێڕنەوە لەبەردەم مەئموندا سەبارەت بە مەسیح (سەلامی خودای لێبێت)

---

[١٠١] ـ الطبري ـ تأريخ الأمم و الملوك ـ جـ٥ ـ ل٣٣٠، و زهدي جار الله، ل٢٣.

[١٠٢] ـ زهدي جار الله ـ ل٢٤، ل٢٥.

دیدار و چاوپێکەوتن لەنێوان عەتابی و ئەبو قورەدا ڕوویداوە[١٠٣]، جا ئەم جۆرە دیدار و موناقەشانە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر موسڵمانەکان سەبارەت بە ناساندنی بیروباوەڕی مەسیحیەت ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە لەڕووی موناقەشە و دیدارەکانەوە شارەزایی باشیان پەیدا کرد و سەرسامبوون بە قسەکانیان، بەتایبەتی موعتەزیلەکان زۆر کاریگەر و سەرسامبوون بە قسەکانیان، عەمری کوڕی شوعەیب دەڵێ لە ئەوزاعیم بیست دەیووت: (یەکەم کەس کە لە بارەی قەدەرەوە قسەیکرد پیاوێکی عێراقی گاور بوو کە پێیان دەوت "سەوسەن"، ئەم پیاوە گاور بوو دواتر موسڵمان بوو، دووبارە چوویەوە سەر ئاینەکەی پێشوویی و بوویەوە بە گاور، "مەعبەدی جوهەنی" لەوەوە زانستی قەدەری وەرگرت و غیلانی دیمەشقیش لە مەعبەدەوە ئەو زانستەی وەرگرت[١٠٤])، ئەوەبوو پێشتر زانیمان کە چۆن موعتەزیلەکان غیلانی دیمەشقی بە یەکێك لە پیاوەکانیان هەژمار دەکرت و خستبوویانە سەر و چینی چوارەمەوە[١٠٥].

بەڵام ئەو دیدار و موناقەشانەی کە لە نێوان فیکری ئیسلامی و فیکری مەسیحیدا ڕوویاندا کاریگەری گەورەی لەفیکر و بیروڕای موعتەزیلەکاندا جێهێشت، ئەوەتا ئەحمەد ئەمین جەخت دەکاتەوە لەسەر ئەوەی کە باسمان لێوەکرد و دەڵێ: (لەڕاستیدا گروپ و دەستەی موعتەزیلە سەرەتا لە مەسیحیەتەوە سەری هەڵدا، چونکە قەشە و گەورەی کڵێساکان موشتومڕ و موناقەشەیان لەبارەی ویست و ئازادی مرۆڤەوە دەکرد، پێیان وابوو مرۆڤ

---

[١٠٣] - السيوطي - تأريخ الخلفاء - ل٣٨٦، زهدي جار الله، ل٢٥.

[١٠٤] - الإسفراييني - التبصير في الدين - ل٧٦.

[١٠٥] - بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

هەندێ جار سەرپشکە لە کردەوەکانیدا و هەندێ جاریش ویستی خۆی تێدا نییە، بە دەستەواژەیەکی تر لە مەسەلەی قەدەردا وەك ئەوان موناقەشە و مشتومڕیان لەبارەی سیفەتەکانی خوداوە دەکرد، جا هەموو ئەم بیروباوەڕانە کەڵەکەبوون و لەڕێگەی گاورەکانەوە گەیشت بە موعتەزیلەکان...بەناوبانگترین کەس کە کاریگەری دروستکرد لەسەر موسڵمانان بریتی بوو لە یەحیای دیمەشقی و تیودور ئەبو قوڕە بوو... [106]). لەڕاستیدا فیکری ئیعتیزال و فیکری یەحیای دیمەشقی لە چەند خاڵێکدا بە یەك دەگەنەوە کە ئێستا باسیان لێوە دەکەین:

١ـ باسمان لەوە کرد کە موعتەزیلەکان پێیان وایە خودای گەورە هیچ سیفەتێکی نییە، بەهەمان شێوە یەحیای دیمەشقیش نکۆڵی سیفەتەکانی خودای کرد بوو، بەڵگەشی بۆ ئەمە ئەوەبوو کە ناتوانین خودا دیاری بکەین یان پەی بە سروشتی خودا بکەین، چونکە مەحاڵە سروشت بزانێت چی لەسەر و سروشتەوە دەگوزەرێت، لەڕاستیدا دیمەشقی نەفی ناوەکانی خوداشی کردبوو، پێی وابوو کاتێ مەحاڵ بێ کە لەخودا تێ بگەین یان درك بە ناو کرۆکی بکەین، کەواتە خودا هیچ ناوێکیشی نییە[107].

٢ـ هەروەها یەحیای دیمەشقی یەکێك بووە لەو کەسانەی کە نەفی قەدەری خودای کردووە، هاوکات بانگەشەی بۆ ویست و ئیرادەی مرۆڤەکانیش کردووە،[108] بۆیە جیاوازی دەکرد لەنێوان ئەو کردەوانەی کە مرۆڤ توانای بەسەریدا نییە، وەك لەدایکبوون و گەشەی مرۆڤ، لەگەڵ ئەو کردەوانەی کە

---

[106]ـ أحمد أمين ـ ضحى الإسلام ـ جـ١ ـ ل٣٤٤.

[107]ـ بڕوانە زهدي جار الله ـ ل٢٧.

[108]ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ ل٢٩٠.

مرۆڤ تیایدا سەرپشکە و دەتوانێت دوای بیرکردنەوە تێرامان نەرم نەرم پێی بگات، هەرچی ئەوەی یەکەمە ئەوا مرۆڤ دەسەلآتی تێیدا نییە و ویستی خودا زاڵە بەسەر کردەوەکانیدا، دووەمیشیان ئەوەیە مرۆڤ تیایدا ئازادە و دەتوانێت کارەکە ئەنجام بدات یان ئەنجامی نەدات، چونکە هەندێ کردەوەی مرۆڤ هەیە ستەم و سەرزەنشتی تێدایە ناچێتە ئەقڵەوە ئەم کردەوانە بدرێتە پاڵ خودا. هەموو ئەمانە تا ئەندازەیەکی زۆر هاوشێوەی ئەو فیکرانەیە کە موعتەزیلەکان لەبارەی قەدەرەوە وتویانە.

٣ـ موعتەزیلە وای دەبینن کە خودا کاری شەڕ و ناقۆلاّ ئەنجام نادات و بەوانەش وەسفی خودای پێ ناکات، بەهەمان شێوە دەبینین یەحیای دیمەشقی دەڵێت خودا خێرە و بۆ خۆی سەرچاوەی هەموو خێر و چاکەیەکیشە[١٠٩].

٤ـ هەروەها یەحیای دیمەشقی پێی وابوو خودا بۆ هەموو شتێك لە بووندا ئامادەسازی دەکات تا چاکبێت بۆی، ئەمەش تاڕادەیەك هاوڕایە لەگەڵ بۆچوونی موعتەزیلەدا کەپێیان وایە هەر کردەوەیەك لەو کردەوانەی خودا بەدەر نییە لە کردەوەی خێر و چاکە[١١٠].

٥ـ موعتەزیلەکان تەئویلی هەموو ئەو ئایەتانەی قورئانیان کردووە کە دەلالەت دەکەنە سەر "تەشبیە و تجسیم" "لێکچواندن و تەندارکردن"، هەروەها نەفی هەموو ئەو فەرموودانەشیان کردووە کە دەلالەتی "تشبیە"ی تێدایە، بۆیە لەم مەسەلەشدا تا ئەندازەیەکی زۆر لەگەڵ بۆچوونی یەحیای دیمەشقیدا یەکدەگرێتەوە، چونکە ئەو تەئویلی هەموو ئەو زاراوانەی دەکرد کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتبوون و مانای "تشبیە و تجسیم" ی هەڵدەگرت، بۆ نموونە

---

[١٠٩]ـ هەمان سەرچاوە، ل٢٧.

[١١٠]ـ هەمان سەرچاوە، ل٢٧، ل١٠٢.

دەیووت: دەمی خودا بریتی یە لە ویست و ئیرادەی خودا، بیستنی خوداش بریتی یە لە ئامادەیی خودا بۆ وەگرتنی نزا[111]....

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە موعتەزیلەکان کاریگەربوون بە فیکری مەسیحی، بە مانایەکی وردتر فیکری مەسیحی کاریگەری هەبوو لەدەرکەوتنی فیکری موعتەزیلەدا، لە لایەکەوە موعتەزیلەکان بۆ ئەوەی بیروباوەڕی مەسیحیەکان پوچەڵکەنەوە بەتایبەت هەڵوێستیان سەبارەت بە سروشتی مەسیح پێغەمبەر (سەلامی خودای لێ بێت) دیداریان لەگەڵ دەبەستن، لەلایەکی تریشەوە موعتەزیلە کاریگەری بیری یەحیای دیمەشقیان لەسەر بوو، بەڵام پێویستە ئەوەندە زیادەڕەوی نەکەین لەو کاریگەرییەدا، بۆ نموونە سەبارەت بە قەدەر و ئازادی ویستی مرۆڤ، چونکە ئەم مەسەلەیە تەواوی بیر و هزری مرۆڤەکانی بەخۆیەوە سەرقاڵ کردووە و شتێك نییە تەنها یەحیای دیمەشقی قسەی تێدا کردبێ و دایهێنابێ، لەسەروو ئەمەشەوە کاتێك موعتەزیلە چارەسەری ئەم مەسەلەیانکرد، تەنها لەڕێگەی ئەقڵەوە هەوڵی سەلماندنیان نەدا، بەڵکو شان بە شانی بەڵگەی ئەقڵی پشتیان بە بەڵگەی نەقڵیش بەستبوو، ئەمە حاڵی موعتەزیلەکان بوو سەبارەت بە بۆچوونەکانی یەحیای دیمەشقی کە لەگەڵ بۆچوونەکانیاندا یەکیان گرتبوویەوە، کاتێك کە یەحیای دیمەشقی لەڕوانگەی ئەقڵیەوە چارەسەری کردبوو، دەبینین موعتەزیلەکان بۆ چارەسەری ئەم مەسەلەیە جگە لە بەڵگەی ئەقڵی پەنایان بۆ بەڵگەی نەقڵیش بردووە، لە کاتێکدا کە موعتەزیلەکان بیر و بۆچوونەکانیان دەخستەڕوو هاوکات ڕەواجیان بە مانا دەدا بۆ ئەوەی تاقانەیی خودا

---

[111]- بۆ ئاشنایی زیاتر سەبارەت بەوەی تاچەند بیروبۆچوونەکانی یەحیای دیمەشقی کاریگەربوون لەسەر موعتەزیلە ـ بڕوانە ـ زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ لە ل٢٧ تا ل٣٢.

بسەلمێنن، بەڵام دەبینین ئەم جۆرە بۆچوونە یەکناگرێتەوە لەگەڵ ناوەڕۆکی فیکری مەسیحیەتدا، چونکە ئەوان خودا و مەسیح پێکەوە تێکەڵ دەکەن. کەواتە کاریگەری مەسیحیەکان لەسەر موعتەزیلە لەڕووی چۆنیەتی و چەندییەتیەوە نەگەیشتبوویە ئاستێك کە زۆربەی دوژمنانی موعتەزیلە باسیان لێوە کردووە، چونکە لای هەندێك پەیوەندییان گەیشتبوویە ئاستی ڕێککەوتنی تەواو. بۆیە ئێمە لەم بۆچوونەدا لەگەڵ ئەحمەد ئەمیندا[112] هاوڕاین کە پێی وایە سەرهەڵدانی موعتەزیلە سەرهەڵدانێکی ئیسلامی بووە، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە زۆربەی بنەماکانی موعتەزیلە بۆ بەرپەرچدانەوەی فارسەکان دانرابوو نەك بۆ گاور و مەسیحیەکان.

## پێنجەم: کاریگەری فەلسەفە لەسەر فیکری ئیعتیزال:

لەڕاستیدا فیکر و دیدگای مرۆڤەکان جێگیر و دامەزراو نییە لەسەر شتێك، بەڵام بەردەوامبوون سیمای یەکەمیەتی ئەویش ئەوەیە کە هەمیشە لە ململانێدایە، هەموو بیروبۆچوون و فیکرێك هەوڵی ئەوە دەدا زاڵبێت بەسەر بیرو بۆچوون و فیکری بەرامبەردا، مەرج نییە زۆرجار سەرکەوتن بۆ بیرۆکەی بەهێز بێت، بۆیە هەندێ جار بیرۆکەی لاواز - ئەگەر چی سەرکەوتنێکی ساختەیە - بەهۆی کۆمەڵە هۆکارێکەوە کە بۆی دەستەبەر دەبێت، دەبێتە مایەی سەرکەوتنی، ڕوونترین نموونەش بۆ ئەمە - لەم سەردەمەی ئێستاماندا - فیکر و بیروبۆچوونەکانی ڕۆژئاوایە کە لەبەرامبەر موسڵمان و ئاینی ئیسلامدا وەستاوەتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە هەرگیز نەگەشتووە و ناشگات بە ئاستی فیکری ئیسلامی کە لە - قورئان و سوننەتەوە - سەرچاوە وەردەگرێت و ڕۆڵی

---

[112] - ضحى الإسلام، ل٣٤٦.

سەرەکی دەگێڕێت لە نوێبوونەوە و بەردەوامبووندا، بەڵام دەبینین لەم سەردەمەی ئێستاماندا ئەوان سەرکەوتوون ئەگەرچی سەرکەوتنێکی ساختەیە، هۆکارەکەشی ئەوەیە ئەو خاوەنی چەك و جبەخانەیە و توانیویەتی سەرکەوتن بە دەست بهێنێت، سەرەتا لەڕێگەی شانەی پەیوەست بە یەکەوە بووەوە دەستی پێکرد کە بەشێوەیەکی رێك و تەواو پێی هەستا، دواتریش لەڕێگەی کەناڵی ڕاگەیاندنی بەهێزەوە توانی کاریگەری لەسەر ڕای گشتی دروست بکات، ئێمەش ـ لەگەڵ ئەوەی کە لەڕووی فیکر و بیروباوەڕمانەوە بەهێزین ـ بەڵام ئەم چەکە کاریگەرەمان فەرامۆش کردووە، بەبێ ئەم چەکەش ناتوانین هێز و دەسەلات پەیدا بکەین.

گەر بگەڕێینەوە بۆ سەرەتاکانی سەدەی دووی کۆچی ـ کە موعتەزیلە تیایدا دەرکەوت ـ دەبینین موعتەزیلە ئەوەیان لەسەر شانیان هەڵگرتبوو کەبەرگری لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام بکەن و هەوڵی بڵاوکردنەوەی ئەو پەیامەش بدەن لە هەموو ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی دەوڵەتی ئیسلامیدا، چونکە بینیان کەخاوەن ئاینەکانی دیکە ـ لەگەڵ ئەوەی کە لە ڕووی فیکر و بیروباوەڕەوە لاوازن ـ بەڵام خاوەنی چەکێکی بەهێزن کە بە گشتی موسڵمانان و موعتەزیلەش بە تایبەتی ئەو چەکەی ئەوانیان نییە، کە بریتی یە لە مشتومڕ و دیدار، زانستی فەلسەفە و مەنتیق، لەڕاستیدا موعتەزیلە هەر زوو لەوە حاڵی بوو گەر خۆیان لەو ڕووەوە پڕ چەك نەکەن ئەوا ناتوانن سەرکەون و ئەوەی دەیانەوێت پێی بگەن، بۆیە پێویستە هەمان فیکری ئەوان بەکاربهێنن و لەڕێگەی فەلسەفە و مەنتیقەوە خۆیان پڕ چەك بکەن تا سەرکەون بەسەر بیروبۆچوونی نەیارەکانیاندا، بۆ ئەمەش هەستان بە دانانی نەخشە ڕێگایەك وەك سەرەتای کارەکە بۆ ئەوەی وردە وردە بچنە ناو زانستەکەوە تا بەجوانی شارەزایی تێدا پەیدا بکەن، لەڕاستیدا چالاکی وەرگێڕان لەسەردەمی ئەبو جەعفەری مەنصوردا ئاسانکاری

بۆ کراو ڕەواجی پێ درا، ئەمەش بۆ خۆی تاکە ڕێگا بوو بۆ ئەوەی موعتەزیلە لەو ڕێگاویەوە خۆیان بەو زانستە پڕچەك بکەن، ئەوەتا "سیوطی" باس لەوە دەکات کە ئەبو جەعفەری مەنصور یەکەم خەلیفە بوو کتێبەکانی سریانی و ئەعجەمی وەرگێڕایە سەر زمانی عەرەبی، وەك کتێبی "کلیلە و دیمنە و ئیقلیدس"[113]، هەر لەسەردەمی ئەودا مەنتیقیش وەرگێڕدرایە سەر زمانی عەرەبی، لەڕاستیدا ئەم کارەش لەلایەن موسڵمانان بەگشتی و ئەهلی کەلامیش بە تایبەتی پێشوازییەکی باشی لێکرا، تا لەو ڕێگەیەوە شارەزاییەکی باش لە زانستی مەنتیق و فەلسەفەی یۆنانی وەربگرن بۆ ئەوەی ڕووبەڕووی نەیارەکانیان ببنەوە[114]، هەروەها لەسەردەمی مەئمونیشدا زۆرێك لە کتێبە یۆنانیەکان وەرگێڕدرانە سەر زمانی عەرەبی، موعتەزیلەکانیش هەموو ئەو کتێبانەیان وەرگرت و بەوردی چاویان بە لاپەڕەکانی ئەو کتێبانەدا خشاندەوە و شارەزاییەکی باشیان لێوە وەرگرت[115]، "ئیبن المرتضی" باس دەکات و دەڵێ: لەڕاستیدا ئەم پرۆسەی وەرگێڕانە یارمەتیدەرێکی باشبوو بۆ موعتەزیلەکان تا لێیەوە هەموو ئەو بەڵگانەی پێویستە لەو ڕووەوە ئامادەی بکەن، بۆ ئەوەی بەرگری لە یەکتاپەرستی خودای پێ بکەن هەر وەك چۆن لێ تێگەیشتوون[116].

موعتەزیلەکان پشتیان بە هەموو ئەو شتانە بەستبوو کە ئاینەکانی تری ناوچەکە پشتیان پێی بەستبوو لەڕێگەی زانستی فەلسەفە و شێوازی ڕووبەڕوونەوەی بەهێزەوە، بۆئەوەی شتە جوانە شاراوەکانی ئاینی پێ

---

[113]ـ السیوطي ـ تأریخ الخلفاء ـ ل٣٢٦.

[114]ـ أبو الوفا التفتازاني ـ علم الکلام و بعض مشکلاته ـ ل٢٣ ـ دار الثقافة و النشر ـ ١٩٧٩.

[115]ـ المقریزي ـ الخطط ـ جـ٤ ـ ل١٩٠.

[116]ـ المنیة و الأمل ـ جـ١ ـ ل١١١.

دەربخەن، ئیتر موعتەزیلەکان لە مێژووی ئیسلامدا بوونە بەرگریکارێکی بەهێز وەك چۆن مەسیحیەکان لەسەرەتاوە لەو سنورەی خۆیاندا بەرگریان لە ئاینەکەی خۆیان دەکرد، بۆیە پێویست بوو موعتەزیلەکانیش قوڵببنەوە بەنێو هەموو ئەو باس و خواستانەی ئەواندا تا ئاینی ئیسلام لەڕووی هێرشەوە دەربکەوێت نەك لەڕووی بەرگریکردنەوە، تا سەرکەوێت بەسەر هەموو ئەو شتانەی کە دەیەوێت بەسەریاندا سەرکەوێت[117].

هەرچی موعتەزیلەکانە ئەوا هەستیان بەوە کردبوو کە لەگەڵ کەسانێکدا دیدار و مشت و مڕ ئەنجام دەدەن کە بڕوایان بە بەڵگەی نەقڵی نییە، بۆیە پێویستە بە هەمان ئەو زمانەی کە ئەوان پێی دەدوێن لەگەڵیاندا بدوێت، موعتەزیلەکانیش زۆر کاریگەربوون بە بۆچوونەکانی "ئەرسطو و ئەفلاطون" ئەوەتا "ئیبن المرتضی" دەڵێ: (بیروبۆچوونەکانی ئەرسطو و ئەفلاطون یارمەتیدەرێکی باشبوو بۆیان بۆ ئەوەی بەرگری لە یەکتاپەرستی خودا بکەن و بەرپەرچی هەموو ئەو گومانانە بدەنەوە کە باس لە چەند خودایی دەکات... )[118].

شەهرستانی لە بارەی "نەظام"ەوە دەڵێ: کتێب گەلێکی زۆری لەبارەی فەلسەفەوە خوێندووەتەوە، زۆرێك لە قسەی فەیلەسوفەکانی دەهێنا و لەزۆر شوێندا لەگەڵ قسەی موعتەزیلەکاندا تێکەڵی دەکرد، بەڵام لەڕاستیدا قسەکانی لە فەیلەسوفە کۆنەکانەوە وەرگرتبوو[119].

---

[117] ـ نیبرج ـ مقدمة کتاب الإنتصار ـ ل٥٨، أحمد أمین ـ ضحی الإسلام ـ جـ١ ـ ل ٢٣٦

[118] ـ المنیة و الأمل ـ ل١٤٠.

[119] ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٧٣، ٧٤.

دەگێڕنەوە ئەبو جەعفەری کوڕی یەحیای بەرمەکی بە " نەظام "ی وتووە باسی "ئەرسطتالیس" بکە، ئەویش پێی وتووە: سەر لەبەری کتێبەکەیم هەڵوەشاندوەتەوە، جەعفەریش وتی: تۆ چۆن دەتوانی کاری وەها بکەیت لەکاتێکدا نازانیت بیخوێنیتەوە؟ ئەویش وتی: چۆنت پێ باشە کتێبەکەیت بۆ بخوێنمەوە، لەسەرەتاوە تا کۆتایی یان لە کۆتاییەوە تا سەرەتا، ئیتر وردە وردە کتێبەکەی بۆ باسکرد و بۆیی هەڵوەشاندەوە، جەعفەریش بەم کارەی زۆر سەرسام بوو[١٢٠].

بەم شێوەیە دەبینین فەلسەفە ڕۆڵێکی گەورەی بینی و کاریگەریشی لەسەر فیکری ئیعتیزال دانا و لەگەڵیدا ئاوێتە بوو بە جۆرێك کە ناکرێت فەرامۆش بکرێت و لێکیان جیابکرێتەوە، موعتەزیلە ئەوەندە ئالودەی فەلسەفەببوون و خۆشیان دەویست تا ئەوەی وردە وردە لەو ئامانجە ئاینیەی هەیانبوو دوور دەکەوتنەوە و لەبیروباوەڕی لاهوتی نزیك دەبوونەوە، بۆیە لەناو ئیسلامدا موعتەزیلە بە یەکەمین فەیلەسوفی ئیسلام دادەنرێت کە سەرەتا فەلسەفەیان وەرگرتبێت[١٢١]. بەڵام پێویستە بەردەوام ئەوە بە بیر خۆماندا بهێنینەوە کە بەردەوام فەلسەفەی موعتەزیلەکان مۆرکێکی ئیسلامی لە خۆ گرتبوو، ئەگەر چی بۆ ماوەیەك لە ئامانجە ئاینیەکانیان لایاندا و لێی دوور کەوتنەوە، بەڵام بە گشتی لێی دوور نەکەوتبوونەوە، چونکە فەلسەفە لە بنەڕەتدا لای ئەوان تەنها ئامرازێك بووە بۆ گەیشتن بە مەبەستێکی باش کە ئەویش ڕووبەڕوونەوەی دووژمنانی ئیسلامە.

---

[١٢٠] ـ القاضي عبد الجبار ـ طبقات المعتزلة ـ ل٢٧٠.

[١٢١] ـ زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل٥٠.

# پێشەکی

فیکری ئیعتیزالی بیروباوەڕ و بنەمای تایبەت بە خۆی هەبووە و لەسەری وەستاوە، ئیعتیزالیش بۆ خۆی لەسەر پێنج بنەما ڕاوەستاوە، هەر کەس بڕوای بەم پێنج بنەمایە هەبوو، ئەو کەسە بە موعتەزیلە هەژمار دەکرێت، بنەماکانیش بریتین لە: "التوحيد، العدل، الوعد و الوعيد، المنزلة بين المنزلتين، الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر" هەر کەسێك ئەم پێنج بنەما زیاد و کەم پێ بکات، ئەگەر چی یەك بنەماش بێت شایستە نییە پێی بوترێت موعتەزیلە[١٢٢].

لەڕاستیدا ئەم پێنج بنەمایە موعتەزیلە داینەهێناوە و بە تەنها فیکری موعتەزیلەش لەبارەیەوە قسەی نەکردووە جگە لە بنەمای "المنزلة بين المنزلتين" نەبێت، چونکە هیچ موسڵمانێك نییە کە ئینکاری یەکتاپەرستی خودا و دادپەروەری و پاداشت و سزای خودا بکات، هیچ موسڵمانێکیش نییە کە پێویست نەبێت لەسەری فەرمان بە چاکە یان بەرگری لە خراپە نەکات، بەڵام دەبینین کاتێك کە موعتەزیلە لەبارەی ئەم پێنج بنەمایەوە دەدوێ، لە ڕووی ئەقڵ و ئەقڵگەراییەوە ڕاڤە و تەفسیریان بۆ دەکات، بۆ ئەوەی لە کاتی دیدار و موشتومڕەکانیاندا یارمەتیدەریان بێت، کە زۆربەیان لەو بت پەرستانە بوون کە بە هیچ جۆرێك بڕوایان بە نەقڵ نەدەکرد ـ قورئان و سوننەت ـ

---

[١٢٢] ـ الأنتصار ـ ل١٢٦.

هەروەها بڕواشیان بە پێغەمبەرایەتی موحەممەد (درودی خودای لێبێت) نەدەکرد، تەنانەت بڕواشیان بە بەدیهێنەرێکی تاقانەش نەبوو کە بوونەوەری بە گشتی دروست کرد بێت ـ هەرچی موعتەزیلەشە ئەوا لەڕێی بنەماکانیانەوە کە دەیانخستەڕوو، کەوتنە نێو ناکۆکیەکی زۆرەوە و دواتر لەلایەن بیری سەلەفیەتەوە ڕووبەڕووی تۆمەت و ناوزڕاندن بوونەوە[122]. ئێستاش بەشێوەیەکی ڕیزبەندی وەك ئەوەی لە پێشەوە هاتووە، باسیان لێوە دەکەین.

## بنەمای یەکەم: یەکتاپەرستی "التوحید":

یەکتاپەرستی یەکێکە لە گرنگترین بنەماکانی موعتەزیلە، لەڕاستیدا موعتەزیلە لەپێناو ئەم بنەمایەدا خەباتێکی شەرەف مەندانەی کرد، ئەوەتا

---

[122] ـ زاراوەی سەلەف بەو کەسانە دەوترێت کە شوێن ڕێبازی هاوەڵان و شوێنکەوتوان و شوێنکەوتوانی شوێنکەوتوان کەوتوون، یان هەر کە کەس کە لەسەر ڕێڕەوی ئەوان بڕوات، وەك چوار پێشەواکە و سوفیانی ثەوری و سوفیانی کوڕی عویینە و لەیثی کوڕی سەعد و عەبدوڵڵای کوڕی موبارەك و بوخاری و موسلیم. هاوکات لەگەڵ تەواوی ئەوانەی کە فەرموودەیان گێڕاوەتەوە. هەروەك چۆن ئەو کەسایەتی و زانایانەش دەگرێتەوە کە پارێزگاریان لە ڕێبازی پێشینین کردووە لە هەموو سەردەمە جیاوازەکاندا، بەتایبەت کاتێك کە گرفت و ئاریشە سەری هەڵدەدا، وەك ئیبن تەیمیە، ئیبن قەییم، موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب، هەروەها لەگەڵ زۆربەی ڕەوتە سەلەفیە هاوچەرخەکاندا، دیارترین سیفاتیان پابەندبوونە بە نەقڵەوە، سەرەتا قورئان و دواتر فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت)، لە سەرەتاوە پێیان دەوتن ـ ئەهلی حەدیث ـ بۆ ئەوەی جیابکرێنەوە لەگەڵ شیعە و موعتەزیلە و خەواریج و تاقم و دەستەکانی دیکەدا. هەروەها پێشیان دەوتن ئەهلی ئەثەر. بڕوانە: د. مصطفی حلمي ـ قواعد المنهج السلفي ـ ط٢ ـ دار الدعوة. الأسكندرية. هەروەها بڕوانە: د. زين الدين مصطفی ـ سلسلة عقائد السلف ـ في علم الكلام ـ شخصيات و مذاهب ـ ل٢٢، ٢٣.

"خەیاط" لەم بارەوە دەڵێ: (تەنها موعتەزیلە هەڵگری بەیداخی یەکتاپەرستی بوون لەو دەمەدا، هەر ئەوانیش بوون لەو پێناوەدا توابوونەوە، بۆیە هەر قسەیەك لەبارەی یەکتاپەرستیەوە بکرێت، ئەوا بۆ ئەوان دەگەڕێتەوە و ئەوان سەرمەشق بوون تیایدا[١٢٤]).

موعتەزیلە لەپێناو بەرگریکردنیان لەبنەمای یەکتاپەرستی، هەستان بە نەیاریکردنی هەموو ئەوانەی ئەقڵیان پەی پێ دەبات لەوەدا کە نکۆڵی یەکتاپەرستی خودا دەکات یان گومان بۆ یەکتاپەرستی خودا دروست دەکات، بۆیە قەدیمیان بۆ خودا سەلماند و نەفی تەواوی سیفەتەکانی خوداشیان کرد، ئەوجا هەموو ئەو ئایەتانەی کە "تەشبیە" لێکچواندن لە هۆش و بیری مرۆڤدا دروست دەکات تەئویلکرد، لەم بارەوە شەهرستانی دەڵێت: (ئەهلی عەدل - مەبەست پێی موعتەزیلەیە - دەڵێ خودا لە زاتی خۆیدا یەکە: نابێت هیچ دابەشکردنێك بۆ خودا بکرێت و هیچ سیفەتێکیشی نییە، هەموو کاروبارەکانیش تەنها زاتی خۆی ئەنجامیاندەدا: هیچ هاوەڵێکی نییە، هیچ شتێکی تر جگە لە زاتی خودا قەدیم نییە، هیچ دابەشکردنێك لە کارەکانیدا نییە، مەحاڵە لە یەککاتدا دوو قەدیم هەبێت، هەر خودا بۆ خۆی بە توانایە لە نێو بەتواناکاندا، بۆیە لای ئەوان ئەمە بریتی یە یەکتاپەرستی[١٢٥]).

قازی عەبدولجەبار دەڵێ: (ئەوەی کە پێویستە کەسی موکەلەف لەبارەی زانستی یەکتاپەرستیەوە بیزانێت بریتی یە لەوەی کە: دەبێت خودای ناسیبێت بەوەی کە خودایەکی قەدیمە، ئەو سیفاتانەشی کە هەیەتی بەو شێوە بێت کە ئەو ناسیویەتی و شایانی خودایە، ئەوەش بزانێت کە چۆن خودا شایستەیە بەم

---

[١٢٤]- الأنتصار - ل١٣، ١٤.

[١٢٥]- الملل و النحل للشهرستاني - جـ١ - ل١٣.

سیفەتانە، وە پێویستە لە هەموو کاتێکدا بزانیَ چی شایستەیە بەخودا ئەوە بداتە پاڵی، لەهەموو ساتێك و لەهەموو کاتێکدا پێویستە ئاگای لە گوفتاری بێت و خودا بە دوور بگرێت لە هەموو شتێکی ناشایستە کە دەدرێتە پاڵی، پاشان لەسەریەتی ئەوە بزانێت کە حاڵەتێك هەیە نابێت لەو حاڵەتە زیاتر بڕوات، ئەویش ئەوەیە خودا تاك و تەنهایە و دووەهەمینی نییە نە لەسیفات و نە لەو شتانەش کە بۆ خودا بڕیار دەدرێت و شایستە نەبێت بە زاتی خودای گەورەوە[١٢٦]).

پاش ئەم خستنەڕووە پێویستە هەندیَ مەسەلە بخەینەڕوو کە موعتەزیلەکان ورووژاندوویانە، کە لە ڕێگەیەوە بەرگری تەواویان لە گرنگترین بنەما کردووە کە ئەویش بنەمای یەکتاپەرستیە.

## مەسەلەی یەکەم:ـ سیفاتەکان

لە قورئانی پیرۆزدا چەندین ئایەت هاتووە کە ناو و سیفات بۆ خودا دەسەلمێنێت، لەوانە: ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمٌۢ بِٱلظَّـٰلِمِينَ﴾[١٢٧]. واتە: (خودا بە ستەمکاران ـ خۆیان و نەفسیەتیان ـ چاك زانا و بە ئاگایە). ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ۝٩٦﴾[١٢٨]. واتە: (خودا بەو کار و کردەوەی ئەوان دەیکەن زۆر بینایە). ﴿إِنَّهُۥ

---

[١٢٦]ـ القاضي عبد الجبار ـ شرح الأصول الخمسة ـ تحقيق: د. عبد الكريم عثمان ـ ل١٧٩ ـ طبعة مصر الأولى ـ ١٩٩٦.

[١٢٧]ـ سورەتی ـ البقرة ـ ئایەتی: ٩٥.

[١٢٨]ـ سورەتی ـ البقرة ـ ئایەتی: ٩٦.

هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْبَصِيرُ ﴿١﴾﴾[129]. واته: (بەڕاستی ئەو زاتە ـ خودا ـ بیسەر و بینایە). ﴿قُلْ إِنَّ ٱللَّهَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يُنَزِّلَ ءَايَةً وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٧﴾﴾[130]. واته: (بڵێ ـ ئەی موحەممەد ـ بەڕاستی خودا دەسەلاتی هەیە کە موعجیزە بنێرێت، بەلاّم زۆربەی ئەوانە نەفامن و نەزانن).

ئەم ئایەتانە و چەندین ئایەتی تریش دەیسەلمێنێت کە خودا سیفەتی هەیە، بەلاّم چۆنیەتی ئەم سیفەتانە ڕۆشن نەکراونەتەوە، جا ئەم ئایەتانە لەو ئایەتانەبوون کە "مُتشابە"ن کە گرفت و ئاریشەی لەنێوان موعتەزیلە و سەلەفیەکاندا وروژاندووە، بۆ ئەوەی مەسەلەکە زیاتر ڕۆشن بێتەوە، باشتر وایە سەرەتا هەڵوێستی هاوەلاّن و سەلەف سەبارەت بە مەسەلەی سیفەتەکانی خودا بخەینەڕوو، دواتریش هەڵوێیستی موعتەزیلە لەو ڕووەوە پیشان بدەین.

## أ ـ هەڵوێستی هاوەلاّن و سەلەف لە مەسەلەی سیفاتدا:

مەقریزی هەڵوێستی هاوەلاّن (خودایان لێ ڕازی بێ) سەبارەت بە مەسەلەی سیفەتەکانی خودا ڕۆشن دەکاتەوە و دەڵێ: (هەر کەسێك بەوردی سەرنج بدات لە فەرموودەکانی پێغەمبەر و ئەو سەرچاوانەی کە لە پێشینەکانەوە بەجێماوە، دەزانێت کە سەرباری زۆری هاوەڵ و ڕاوبۆچوونی جیاوازیان، بەلاّم لە هیچ هاوەڵێکەوە (خودایان لێ ڕازی بێت) فەرموودەیەکی صەحیح یان لاواز نەهاتووە کە پرسیار لە پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) کرابێت لەبارەی واتایەکەوە کە خودا لە قورئانی پیرۆز یان لەسەر زاری پێغەمبەرەکەیەوە

---

[129] ـ سورەتی ـ الأسراء ـ ئایەتی: ١.

[130] ـ سورەتی ـ الأنعام ـ ئایەتی: ٣٧.

(درودی خودای لێبێت) وەصفی زاتی خۆیی پێ کردبێت، بەڵکو هەموو لەواتاکەی گەیشتوون و بێدەنگبوون لەسەر ئەوەی کە قسە لەبارەی سیفەتەکانی خوداوە بکەن، هیچ یەکێکیان جیاوازییان لەنێوان سیفەتی زاتی خودا و سیفەتی کرداری خودا دا نەکردووە، بەڵکو هەموویان ئەوەیان بۆ خودا تەسپیت کردووە و وتویانە خودا هەر لە ئەزەلەوە ـ علم و قدرة و حیاة ...هتد ـ ی هەبووە، هەمووشیان لەم مەسەلەیەدا یەك بۆچوونیان هەبووە، هەروەها هاوەڵان (خودایان لێ ڕازی بێت) ئەوەشیان بۆ خودا تەسپیت کردووە کە خودا بۆ خۆی ـ ڕووخسار و دەست و ..هتد هەیە، بەڵام نەك لەسەر شێوازی دروستکراوەکانی، بەڵکو ئیسپاتی سیفەتەکانی خودایان بەبێ هاوشێوە دانان کردووە، هەموو خودایان پاکڕاگردووە لەوەی لە کاری بخەن، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ یەکێکیان نەهاتوون تەئویل بۆ یەکێك لەم سیفەتانە بکەن، هەموویان بە تێکڕا وتوویانە ئەم سیفەتانە هەموویان هاتوون و بڕوامان پێیان هەیە، ئیتر هیچ یەکێکیان بۆ سەلماندنی یەکتایی و تاقانەیی خودا یان بۆ پێغەمبەرایەتی موحەممەد (درودی خودای لێبێت) بەڵگەیان بە هیچ شتێك لەمانە نەهێناوەتەوە، جگە لە قورئانی پیرۆز نەبێت، هیچ کامیان ڕێگەی کەلامی یان فەلسەفیان نەگرتووەتە بەر لەخزمەت پێغەمبەردا (درودی خودای لێبێت) لەو مەسەلەیەدا و هەر بەو شێوەیەی باسمان لێوەکرد هاوەڵان (خودایان لێ ڕازی بێت) ژیانیان بەڕێکردووە[١٣١]).

ئیبن قەییم دەڵێ: (هاوەڵان هیچ کات ناکۆکیان نەبووە لە مەسەلەی ناو و سیفەتەکان و کردارەکانی خودای گەورەدا، بەڵکو هەموویان ئیسپاتی ئەوەیان کردووە ئەوەی لە قورئان و سوننەتدا هاتووە لە سەرەتاوە تا کۆتایی بڕوایان

---

[١٣١] ـ المقريزي ـ الخطط ـ جـ٤ ـ ل١٨١.

پێیەتی، بەڵام پرسیاریان لەبارەی چۆنیەتیەکەیەوە نەکردووە[١٣٢]). کەواتە، هاوەڵان (خودایان لێ ڕازی بێت) لەم بارەوە قسەیان نەکردووە و ئەم مەسەلە نەبووەتە کێشە لە نێوانیاندا، بەڵام وا دەردەکەوێت شوێنکەوتەی ڕێبازی سەلەفی بۆچوونیان هەبووە لە مەسەلەی سیفاتدا، بۆیە کاتێك سەرنج لە دید و بۆچوونەکانی پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دەدەین لە مەسەلەیەدا، دەبینین دەڵێ سیفەتەکان قەدیمە[١٣٣]. هەروەها پێشەوا ئەبو حەنیفەش پێی وایە سیفەتەکانی خودای گەورە هەموویان قەدیمن، واتە سیفەتەکان لەگەڵ خودای گەورە هەبوون و تازەنین[١٣٤]. "ئیبن حەزمی ئەندەلوسی ظاهری" یش پێی وایە دروست نییە زاراوەی سیفات بۆ خودای گەورە بەکاربهێنرێت، بۆیە دەڵێت: (بەکارهێنانی زاراوەی سیفات بۆ خودای گەورە مەحاڵە و دروست نییە بە ڕەهایی بەکاربهێنرێت، چونکە خودای گەورە لە قورئاندا دەقێکی نەهێناوە کە باس لە سیفەت یان سیفاتی خودای گەورە بکات، هەروەها لە پێغەمبەریشەوە فەرموودە نەهاتووە کە بڵێ خودا سیفات یان سیفەتی هەیە[١٣٥]...).

کەواتە سەلەف هیچیان لێوە بەجێ نەماوە کە لەبارەی سیفاتی خوداوە وتبێتیان، هەر ئەوەندەیان وتووە کە سیفاتی خودا قەدیمە و هەر بووە،

---

[١٣٢]- إبن القيم الجوزية ـ أعلام الموقعين عن رب العالمين ـ جـ١ ـ ل٥١ ـ تحقيق: رضوان جامع رضوان ـ مكتبة الإيمان ـ المنصورة ـ ط١٤١٩ ـ ١ك ـ ١٩٩٩م.

[١٣٣]- أحمد بن حنبل ـ الرد على الزنادقة و الجهمية ـ ضمن مجموعة بعنوان ـ عقائد السلف ـ جمع د. علي سامي النشار و عمار الطالبي ـ ل٩٥، ٩٦ ـ منشاة المعارف ـ إسكندرية ـ ١٩٧١م.

[١٣٤]- أبو حنيفة ـ الفقه الأكبر ـ أشار إليه د. زين الدين مصطفى ـ عقائد السلف ـ جـ١ ـ ل٩٦.

[١٣٥]- إبن حزم ـ الفصل في الملل و الأهواء و النحل ـ جـ ح ـ ل١٢١.

تەنانەت کاتێك باسیشیان لێوە کردووە زۆر بە لێزانانە و وردەکارییەوە باسیان لێوە کردووە، بۆ ئەوەی لەو مەسەلەیەدا نەکەونە هەڵەوە، چونکە ئەوان هەمیشە پێچەوانەی ئەهلی کەلام جوڵاونەتەوە لە مەسەلەی سیفات و غەیری مەسەلەی سیفاتیشدا.

### ب ـ موعتەزیلە و نەفیکردنی سیفەتەکانی خودا:

پێشتر باسمان لەوە کرد کە یەکەمین کەس لەبارەی نەفی سیفەتەکانی خوداوە قسەی کرد "جەعدی کوڕی درهەم" بوو، پاش ئەویش "جەهمی کوڕی صەفوان" ئەم قسەی لەوەوە وەرگرتووە[١٣٦]. بەڵام وا دەردەکەوێت ئەم قسەی "جەعدی کوڕی درهەم" و ئەوانەی لەسەر هەمان ڕێبازی ئەو ڕۆشتوون لەبارەی نەفیکردنی سیفەتەکانی خوداوە، کاردانەوەیەك بووە لەبەرامبەر ئەو باسانەی کە لەو ماوەیەدا ورووژێنرابوون، وەك "موضەری کوڕی موحەممەدی کوڕی خالیدی کوڕی وەلید و هەمسی کوڕی حەسەن ئەبو عەبدوڵڵای بەصرِی" کە لەساڵی ٤٩ کۆچیدا وەفاتیکردووە، لەگەڵ ئەحمەدی کوڕی عەطائی هوجەیمیدا، شەهرستانی دەڵێ: (هەرچی حەشەوییەکانیشە... وەك موضەر و هەمس و ئەحمەدی هوجەیمی کە باوەڕیان بەوە هەبووە کە خوداکەیان بەریەککەوتن دەکات لەگەڵ بەندەکانیدا و تەوقەیشیان لەگەڵدا دەکات، موسڵمانە دڵسۆزەکانیش گەر چلەکێشی و ئیجتیهاد بکەن و بگاتە ئاستی دڵسۆزی و توانەوەی ڕووت لەگەڵ خودای گەورەدا، ئەوا دەتوانن هەم لە دونیا و هەم لە دوا ڕۆژیشدا لەگەڵ خودادا دەستلەملانێی یەکتر بن ...

---

[١٣٦] ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

ئەوەتا هەندێکیان وتویانە پەرستێوەکەی ئەو تەنە و گۆشت و خوێنە و ئەندامەکانیشی هەیە...لەگەڵ ئەوەشدا وتویانە تەنە بەلاّم وەك تەنەکان نییە، گۆشتە بەلاّم وەك گۆشتەکان نییە[١٣٧]..).

موعتەزیلە پێیان وایە پێویستە لەسەریان لەبەرامبەر هەرکەسێکدا بوەستنەوە کە هاوشێوە یان تەندارکردن بۆ خودا بڕیار دەدت، بۆ ئەوەی ئیسلام لە هەموو ئەو پۆخڵەواتانە ڕزگار بکات پێش ئەوەی مەترسیەکان گەورە ببێت و ژاوە ژاو لەسەر بیروباوەڕی ئاینی ئیسلام دروست بکات، ئەوەبوو هاتن نەفی سیفەت و هاوشێوەی خودایان کرد، هەروەها هەستان بە تەئویلکردنی هەموو ئەو ئایەتانەی کە لە هۆش و بیری مرۆڤدا "تەشبیە" لێکچواندن دروست دەکات وەك یەکێك لە دروستکراوەکان.

## • هەڵوێستی واصل لە مەسەلەی سیفەتەکانی خودا دا:

شەهرستانی پێی وایە کە "واصلی کوڕی عەطاء" کاتێك نەفی سیفەتەکانی خودای کردووە، قسەکەی قسەیەکی پێ نەگەیشتووە، واصل لەو قسەیدا کە نەفی سیفەتەکان دەکات بە قسەیەکی ڕواڵەتی دەست پێدەکات، کە هاوڕابوونە لەسەر مەحاڵبوونی بوونی دوو خودای کۆنی ئەزەلی، هەر کەسێك مانا و سیفەتێکی کۆن بسەلمێنێت، ئەوە دوو خودای سەلماندووە، شەهرستانی وا دەبینێ کە هاوەلاّنی واصل لەم مەسەلەیەدا زۆر فراوانتر ڕۆشتوون و شتی دیکەیان بۆ زیاد کردووە پاش خوێندنەوەی کتێبە فەلسەفیەکان[١٣٨]. خودای گەورە کۆنە و کۆنیشی تایبەت کردووە بە وەسفی خۆیەوە، لەپاش ئەمە ئیتر

---

[١٣٧]ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ ١ ـ ل١١٨.

[١٣٨]ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٧.

واجب دەبێت هەر لەبنەڕەتەوە نەفی سیفەتە کۆنەکان بکرێت، خودای گەورە - وەك ئەوەی موعتەزیلەکان دەیلێن - زانایە لە خودی خۆیدا، بە توانایە لە خودی خۆیدا، زیندووە لە خودی خۆیدا، زانایە نەك بە زانست، بە توانایە نەك بەهێز، زیندووە نەك بە ژیان، چونکە گەر ئەم سیفەتانە بەشدار بن لەگەڵ قەدیمی خودای گەورەدا کە وەسفێکی تایبەتی خودایە، ئەو کاتە ئەم سیفەتانە لەگەڵ پەروەرێنی خودا دا بەشدار پێکردووە[139]. لەڕاستیدا موعتەزیلە ئینکاری سیفەتەکان ناکەن وەك کۆمەڵێك ڕوو و ئیعتیباری ئەقڵی بۆ زاتی یەك خودا، بەڵکو ئینکاری سەلماندنی سیفەتەکان دەکەن کە لەگەڵ زاتی خودای گەورەدا هەربوون و ئەزەلین، بەڵکو ئەم سیفەتانە هەربوون و لە پشتەوەی زاتی خودای گەورەوەن، جا ئەم سیفەتانە یان دەبێت سیفاتی خودی خودا بێت یان غەیری خودی خودا، جا گەر سیفەتەکان خودی خودابوون ئەوە مەزهەبی موعتەزیلەیە، ئەگەر غەیری خودی خوداش بوو، کەواتە یا تازەیە یان قەدیمە، ئەوەبوو مەزهەبی سەلەفمان لەو ڕووەوە خستەڕوو بینیمان کە سیفەتەکانی خودا تازەنین، بەڵکو وتویانە سیفەتەکانی خودا قەدیمن .. جا ئەگەر سیفەتەکانی خودا قەدیم بوون ئەوە هاوبەشی قەدیمی دەکەن لەگەڵ خودای گەورەدا، ئەو کاتە ئەوانیش دەبنە کۆمەڵێك خودا، چونکە قەدیمی تایبەتترین سیفەتی قەدیمە، هاوبەشبوونیش لە سیفەتی تایبەتیدا ئەو کاتە واجبی دەکات کە لە سیفەتە گشتیەکانیشدا هاوبەشبن لەگەڵ خودای گەورەدا[140].

"خەیاط" ئیسپاتی ئەوە دەکات کە خودا خودی خۆی زانایە نەك بە زانستێك کە زیاتر بێت لە زاتی خۆی، ئەوەتا دەڵێ: ئەگەر خودا بەهۆی

---

[139]- هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦٥.

[140]- الشهرستاني - نهاية الإقدام في علم الكلام - ل١٩٩ - أكسفورد - ١٣٥٣ك - ١٩٣٤.

زانستێکەوە زانابێت، ئەوکاتە لە دوو شت بەدەر نییە، یان دەبێت ئەو زانستە قەدیم بێت، یان تازە بێت. ناکرێت زانستەکە قەدیم بێت، چونکە ئەو کاتە لەگەڵ خودادا دەبێت بە دوو قەدیم، ئەمەش بۆچوونێکی خراپ و بێ مانایە، هەروەها ناکرێت زانستەکە تازەش بێت، چونکە گەر وابوو، ئەوە ئەو کاتە خودا خودایەکی تازەی لە خودی خۆیدا بەدیهێناوە، یان لە غەیری خۆیدا بەدیهێناوە کە بووەتە هاوبەشی یان لە هیچ شوێنێکدا. ئەگەر خودا ئەم زانستەی لە خودی خۆیدا بەدیهێنابێت، ئەو کاتە خودا بووەتە شوێنی شتە تازەکان و قەدیم نییە، کەواتە خۆشی تازەیە کە ئەمەش مەحاڵە بۆ خودای گەورە. خۆ ئەگەر ئەم زانستەشی لە غەیری خۆیدا بەدی هێنابێت، ئەوا ئەو کاتە ئەو "غەیرە" دەبێتە زانا نەوەك خودا ـ بەرز و گەورەیی بۆ خودا کە زانایە بەسەر هەموو شتێکدا ـ بۆیە کاتێك کە تۆ هەڵدەستیت بە ڕەنگکردنی ئاوێك، ئەوە ئاوەکە ڕەنگ دەگرێت، نەك تۆ، یان کاتێ کە ئاوەکە لە حاڵەتی جوڵاندایە، ئەوە ئاوەکەیە ڕەنگەکە دەجوڵێنێت، نەك کەسێکی تر. بۆیە ناچێتە ئەقڵەوە کە خودای گەورە زانستی بەدیهێنابێت و شوێنێکیشی نەبێت. ئەو کاتە یەك شت دەمێنێتەوە ئەویش ئەوەیە کە خودا زانایە هەر لەزاتی خۆیدا[١٤١].

## • هەڵوێستی ئەبو هوذەیلی عەللاف لەبارەی سیفاتەوە:

بە پێی ئەم بۆچوونانە موعتەزیلەکان وایدەبینن کە خودا زانایە و زانستیش بەشێکە لە زاتی خۆی، بەڵام دەبینین ئەبو هوذەیلی عەللاف سەبارەت بە مەسەلەی سیفات بۆچوونێکی دیکەی هەیە ئەویش بۆ ئەوەی بەرگری لە

---

[١٤١]ـ الخياط ـ الإنتصار ـ ل١١١، ١١٢.

یەکتایی و تاقانەیی خودا بکات، بۆیە دەڵێت: خودا زانایە بەزانست و زانستەکەش خودی خۆیەتی، خودا توانایە بەهێز، تواناکەش هەر زاتی خۆیەتی، خودا زیندووە بە ژیان و ژیانیش خودی خۆیەتی[١٤٢].

بەلام لەڕاستیدا جیاوازییەك هەیە لەنێوان ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ: خودا بۆ خۆی زانایە، زانستەکەش بەشێکە لە زاتی خۆی، لەگەڵ ئەو بۆچوونەکەی کە دەڵێ: خودا زانایە بە زانستێك و زانستەکەش خودی خۆیەتی، لە بۆچوونی یەکەمدا نەفی سیفەتی زانست دەکات، بەو پێیەی کە زانست هەر زاتی خۆیەتی، لە بۆچوونی دووهەمیشدا سەلماندنی زاتێکە، زاتەکەش خۆی دەبێتە سیفەت، یان سەلماندنی سیفەتێکە سیفەتەکەش هەر زاتی خۆیەتی[١٤٣]. شەهرستانی پێی وایە سەلماندنی ئەبو هوذەیل بۆ ئەم سیفەتانە، کۆمەڵێك ڕوانگەی بۆ زات داناوە، بەم پێیە دەکاتە سێ کوچکەی گاورەکان، هەرچی ئەبو هوذەیلیشە ئەوا ئەم بۆچوونەی لەو فەیلەسوفانەوە هێناوە کە بڕوایان وابووە کە زاتی خودا لە زاتی خۆیدا تەنهایە و فرەیی تێدانیە بە هیچ شێوەیەك، سیفەتەکانیش لەپشتەوەی زاتی خوداوە بەدەر لەخۆیان مانایەکی سەربەخۆیان نییە، بەڵکو ئەو سیفەتانە هەر زاتی خودا خۆیەتی[١٤٤].

بەلام لەڕاستیدا ئەبو هوذەیل بەو شێوەیە قسەی نەکردووە کە ـ شەهرستانی لە بارەیەوە دەڵێت ـ لە سێ کوچکەی گاورەکانەوە ـ هێناویەتی، چونکە هەمیشە موعتەزیلە لە فرە خودایی ترساوە، هەر وەك چۆن گاورەکان تێکەوتن سەبارەت بە سێ کوچکە و وتیان: "الأب و الإبن و روح القدس"، کە

---

[١٤٢] ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ ل١١١، ١١٢.

[١٤٣] ـ هەمان سەرچاوە ـ هەمان لاپەڕە.

[١٤٤] ـ هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

ئەوانە لە بیروباوەڕی گاورەکاندا کۆمەڵێك سیفەتی قەدیمن و هەریەکەیان بۆ خۆیان جیاوازن بەدەر لە خودا، ئەمانە هەموویان لە تاقانەی خودا پێك دێن، ئەم سیفەتەناش لای ئەوان بریتی یە لە (الوجود، العلم، الحیاة) خودا لای ئەوان لە ڕووی جەوهەرەوە یەك خودایە، بەڵام لەڕووی سیفەتەوە سێ کوچکەیە، کاتێ کە موعتەزیلە ترساوە لەوەی کە بکەوێتە ناو فرەیی خودە قەدیمەکانەوە، هاتن سیفەتە فرە جیاواز و مرۆییەکانیان لە خۆیان جیاکردەوە، لەهەمان کاتیشدا دژایەتی کۆمەڵێکیشیان کردووە کە ئەم سیفەتە بدەنە پاڵ خودا، هەروەها ئەو سیفەتانەی خوداشیان جیاکردەوە کە بە ـ بۆچوونی ئەوان ـ دژی یەکتایی خودا نین، لەمەشدا پشتیان بەم ئایەتە پیرۆزەی خودای گەورە بەستووە کە دەفەرموێت: ﴿ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ ﴾.[145] واتە: (هیچ شتێك وەکو خودا نییە).

ئەشعەری[146] ڕەخنە لە عەللاف دەگرێت سەبارەت بە مەسەلەی سیفات و دەڵێ: (ئێوە هاوڕان لەگەڵ ئێمەدا بە هێنانەوەی بەڵگە لەسەر ئەوەی کە خودای گەورە زانایە و بە توانایە، واتە خودا زانایە و زانستەکەش زاتی

---

[145] ـ د. محمد القاسم ـ إبن رشد الفيلسوف المفترى عليه ـ ل١٠٥ ـ مكتبة الأنجلو المصرية ـ د.ت.

[146] ـ ئەبو لحەسەن عەلی کوڕی ئیسماعیلی ئەشعەریە، بۆیە پێی دەوترێت ئەشعەری چونکە دەیدەنە پاڵ ئەبو موسای ئەشعەری (خودای لێ ڕازی بێت)، پێشتر هەڵگری بیری موعتەزیلە بووە، بەڵام دواتر وازی هێناوە و لێیان جیابووەتەوە، دەگێڕنەوە چووەتە سەر مینبەرەکەی و بەئاشکرا وتویەتی: ئەوەی منی ناسیووە ئەوە دەزانێ کە من کێم، ئەوەش منی نە ناسیووە، ئەوە من فلانی کوڕی فلانم، پێشتر بۆچوونم وابووە کە قورئان مەخلوقە و خوداش لە قیامەتدا بە چاو نابینرێت و شەڕ و خراپە لە قەدەری خودا نییە، ئەوە ئێستا من تەوبەم کردووە و وازم لەهەموو ئەو شتانە هێناوە، ئەشعەری لە ساڵی ٢٦٠ کۆچی لەدایکبووە، وتراویشە لەساڵی ٢٧٠ کۆچی لە دایکبووە، وە لە ساڵی ٣٣٠ کۆچیش مردووە، بڕوانە: الملل و النحل ـ جـ ١ ـ ل١٠٦.

خۆیەتی، یان بە توانایە و تواناکەشی زاتی خۆیەتی، کەواتە مانا و تێگەیشتن لەو دوو سیفەتە یەك شتە، ئەبێت زانستی هەبێت کە بە توانایە، وە تواناشی بەسەر زانابووندا هەبێت[١٤٧]). مانای قسەکانی ئەشعەری ئەوە دەگەیەنێت کە ئەبو هوذەیلی عەللاف گەیشتووەتە کۆتایی دەرئەنجامی هەڵەوە، چونکە لای ئەو زانست بووە بە هێز، وە هێزیش بووە بە زانست، ئەمەش بۆ خۆی هەڵەیە، ئەگەر بڵێین زانست جیاوازە لەهێز، ئەوە قسەیەکی هەڵەیە و لەگەڵ ئەو پێشەکیەی کە عەللاف داینشتووە یەکناگرێتەوە کە دەڵێ خودا زانایە و دەزانێ و زانستەکەش هەر خودی خۆیەتی، وە هێز و توانای هەیە بەهێز و توانایەك کە هەردووکیان زاتی خۆیەتی.

"خەیاط" لێرەدا بۆچوونەکەی عەللاف لەبارەی سیفاتەوە ڕوون دەکاتەوە و بەرگریشی لێ دەکات، هەر بۆیە دەڵێ: (گەر ئەوەی عەللاف دەیڵێ ڕاستبێت، ئەوە لەڕاستیدا خودا هەر بە حەقیقەت زانایە، کەواتە قسەکەی لێرەدا بەتاڵە کە دەڵێ خودا زانایە و زانستەکەشی قەدیمە، هەروەها بەتاڵیشە کە خودا زانابێت و عیلمەکەشی تازە بێت، بۆیە ئەوەی هەڵوەشاندووەتەوە، تەنها ئەوە ماوەتەوە کە خودا لە زاتی خۆیدا زانایە، ئەبو هوذەیل بۆ ئەم قسەیەی خۆی کۆمەڵێك هاوشێوەی قسەکانی لای ئەهلی "تەوحید" دۆزیوەتەوە کە بەم شێوەیە تەئویلیان بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە کردووە کە خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّما نُطعِمُكُم لِوَجهِ اللهِ﴾ پێیان وایە کە "وجە الله" وەجهی خودا هەر خودی خودا خۆیەتی، چونکە بە تاڵە ئەگەر بڵێی خودا وەجهی هەیە و بەشێکە لە خودا ، یان "وجە" سیفەتێك بێت بۆ خودا و وەك زاتی خودا قەدیم بێت، کەواتە ماوەتەوە بوترێت کە "وجە"ی خودای گەورە هەر خودی خودا خۆیەتی، وەك

---

[١٤٧]ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل١٠٧.

دەوترێت "ئەمە ڕووی ڕاستەقینەیەی مەسەلەکەیە" یان " ئەمە ڕووی ڕاستەقینەی ئەم بۆچوونەیە " واتە ئەو "وجە" هەر خودی خودا خۆیەتی. هەروەك چۆن باس لەشتێك دەکرێت دەڵێی ئەمە ڕووی مەسەلەکەیە، بە پێی ئەم پێوەرە بێت ئەبو هوذەیل دەڵێ: زانستی خودا خودا خۆیەتی، ئەمەش ناکاتە ئەوەی کە خودا ببێت بە زانست، هەروەك چۆن بۆچوونەکەی پێشووش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە خودا تەنها ڕوو "وجە" بێت[148]).

## • موعەممەری کوڕی عوبادی سەلمی و بۆچوونی سەبارەت بە سیفەتەکان:

بینیمان کە واصلی کوڕی عەطاء ئینکاری سیفەتەکای خودایکرد و نەیسەلماند کە سیفەتی خودا بن، ئەمەش بۆ ئەوەی نەفی و نەرێ بوونێکی کۆن "قدیم" لەگەڵ خودادا نەکرێتە هاوبەش، پاش ئەو ئەبو هوذەیلی عەللاف هات و ئیسپاتی (علم و قدرة و حیاة)ی بۆ خودا کرد، هەر چەندە وتویەتی ئەم سیفەتانە بەشێکن لە زاتی خودا، ئەمەش بۆ خودی ئەو حیکمەت و دانایەی کە لەو سیفەتانەدا هەیە، تا چەند قەدیمێك لەگەڵ خودای گەورەدا دروست نەبێ، پاش ئەویش موعەممەری کوڕی عوباد هات و سیفەتەکانی ناونا "المعانی"، تا ئەوەی سیفەتێکی بۆ خودا سەلماند بۆ ئەوەی دوورکەوێتەوە لەوەی کە بڵێ چەند قەدیمێکمان هەیە، چونکە سیفەت لای ئەم بووە بە "معنی". موعەممەر دەڵێت: هەموو "عرض"ێك ـ دیوی دەرەوەی شتەکە کە دەبینرێ و هەستی پێ دەکرێت ـ لە شوێندا جێگیربووە بۆچی جێگیربووە، لەبەر مانایەك جێگیربووە،

---

[148] ـ بڕوانە: الإنتصار ـ ل٧٥، ٧٦، هەروەها زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل٦٥، ٦٦.

ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی زنجیرە لە دوای زنجیرە دروست ببێت، دیسانەوە دەڵێ: "عرض"ەكان لەهەموو جۆرەكان كۆتاییان نایەت، بۆ نموونە جوڵە لەبەر خودی خۆی دژی جێگیری نییە، بەڵكو لەبەر ئەو مەعنایەیە كە بۆی دانراوە، هەروەها جیاوازی لەگەڵ هاوشێوەدا لەبەر مەعنایەك دانراوە كە جیاوازە، یان دژایەتی دژ بۆ دژ لەبەر خودی دژایەتیەكە نییە، بەڵكو مانایەكە كە بۆی دانراوە، هەموو ئەمانە لای ئەو بە مانایە"[149].

ئینجا "خەیاط" ڕاڤەی قسەكەی موعەممەر دەكات و دەڵێ: (موعەممە دوو تەنی جێگیری داناوە ئەمیان بەدوای ئەوی دیكەیاندا دێ، دوای ئەوە یەكێكیان جولاوە و ئەوی دیكەیان نەجولاوە، لای ئەو ئەمە مانایە، بەدەر لە جوڵەكە كە مانایەكی تێدایە كە لە تەنە نەجولاوەكەدا هەیە، لەبەر ئەو مانایە جولاوە، خۆ ئەگەر لەبەر ماناكە نەبوایە كە بۆی دروستكراوە كە جوڵەیە، ئەو كاتە جوڵەكە لەپێشتر نەدەبوو لە نەجولانەكە، خۆ گەر ئەمە بڕیارێكی ڕاست و دروست بێت، ئەوا دەبێت مانایەك هەبێت كە ڕوویدابێ بۆ جوڵەكە كە لەپێناو ئەو مانایەدا جوڵە لە یەكێكیاندا بێجگە لەوی دیكەیان دروست بووبێت، ئەگەر نا هەبوونی ئەو مانایە لە یەكێكیاندا لەپێشتر نەدەبوو لەوی تریان، هەروەها ئەگەر پرسیار لەبارەی ئەو مانایە بكرێت بۆچی عیلەتی بوونی جووڵە لەیەكێكیاندا هەیە و لەوی دیكەیاندا نییە؟ دەڵێ لەبەر مانایەكی تر: خۆ گەر لەبارەی ئەو مانای ترەوە پرسیار بكرێت، ئەو كاتە وەڵامی موعەممەر هەمان وەڵامی ئەوەی پێشووی دەبێت"[150]. جا هەردوو تەنەكە "جولان و نەجولان" لەخودی خۆیاندا جیاواز نین لە یەكتر، چونكە هەردووكیان لە ڕووی خودەوە یەك شتن، بەڵام

---

[149]- الملل و النحل - جـ١ - ل٨٥.

[150]- الإنتصار ل٥٥ - زهدي جار الله - ل٦٧، ٦٨.

جیاوازن لەوەی پەیوەندی بەوانەوە هەیە لەڕووی سیفەتەوە وەك جوڵە و نەجوڵە، ئەم جوڵە و نەجولآنەش شتانێکی "عرضین" بایەخێکی ئەوتۆیان نییە، لەڕاستیدا موعەممەر ئەوەی بە باشتر زانیووە ئەمانە ناو لێبنێ مانا "معانی" نەك سیفات، چونکە ئەو پێی وایە کە بە مانە بڵێیت سیفەت لە جەوهەر و ناوەڕۆکی سیفەت کەم دەکاتەوە، هەروەها ئەگەر یەکێك لەم سیفەتانە بسەلمێنرێت، ئەو کاتە ئەو گرنگیەی نامێنێ،[151] بۆیە کاتێك موعەممەر دەڵێ خودای گەورە هەر بۆ خۆی زانستە، ئەمە لەبەر مانایە، واتە موعەممەر زاتی خودای گەورەی کردووە بە تاقانەیەکی قەدیم، ویستویەتی بیسەلمێنێت کە سیفەتەکان یان کۆمەڵێك مانای نا سەرەکین یان ئەوەتا هیچ گرنگ نییە، بەڵکو ئەوەی کە گرنگە زاتی خودای گەورەیە[152].

## • ئەبو هاشمی جەبائی و هەڵوێستی لەمەڕ سیفەتەکانەوە:

ئەبو هاشمیش بە هەمان ڕێگەی "موعەممەری کوڕی عوباد"دا ڕۆشتووە، خۆی ڕزگار کردووە لە مەسەلەی سیفەتەکان، بۆیە هەستا ناوی لە سیفات نا "حاڵ". کاتێك کە دەڵێین خودا زانایە لەسەر زاتی خۆی، واتە خودا خاوەنی حاڵەتێکە، ئەم حاڵەتەش "زانست"ە کە بریتی یە لەسیفەتێکی دیار لەپشتی ئەوەی کە ئەم زانستە زاتێکی موجود و دیارە[153].

---

[151] ـ بڕوانە ـ زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل٦٨.

[152] ـ الأشعري ـ مقالات الإسلاميين و إختلاف المصلين ـ ل٧٤ ـ تحقيق: محمد محيي الدين ـ مكتبة النهضة المصرية ـ ١٩٥٠م.

[153] ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٩٥.

ئەم حاڵەتانە یان ئەم سیفەتانە بە تاك تاك نایانناسین، بەڵکو سیفەتەکە لە خودی زاتەکەوە دەناسین، واتە: حاڵەتەکان خۆیان بە تەنها نەبوونیان هەیە و نە بوونیشن، نە دیارە و نە نادیاریشە، بۆیە خۆیان بە تەنها نا ناسرێن، بەڵکو لەگەڵ زاتی خودا دا دەناسرێن[١٥٤].

ئەبو هاشم زیاتر قسەکەی لەبارەی حاڵەوە ڕوونتر دەکاتەوە و دەڵێ: (عەقڵ هەست بە جیاوازییەکی زۆر پێویست دەکات لە نێوان ناسینی شتەکان بەشێوەیەکی ڕەها، وە لەگەڵ ناسینی شتەکان لەسەر سیفەتەکانیان، ئەوەی کە بە زانا ناسرا مەرج نییە زانا بێت، بۆیە دەبینین بوونەوەرەکان زۆرجار لە مەسەلەیەکدا هاوبەشن و لە مەسەلەیەکی دیکەدا جیاوازن، ئەم هاوبەشی و جیاوازییە ناگەڕێتەوە بۆ خوودەکە، وە ناشگەڕێتەوە بۆ شتەکانی پشتەوەی زاتەکە، ئەو کاتە پێویست دەکات کە وەك حاڵەت ناوزەد بکرێت، ئەوەی کە "زانا" زانا بێت ئەمە حاڵە کە بریتی یە لە سیفەتێك کە لە پشتی ئەوەوەیە کە هاوکات زاتیشە، واتە ئەو مانایەی کە لە سیفەت وەریدەگرین ئەو مانا نییە کە لە خودەکە یان زاتەکەوە وەری دەگرین، هەروەها ئەو مانایەی کە لە قودرەت وەریدەگرین مەرج نییە بە توانا بێت، ئەو مانایەش لە "حی" یەوە وەریدەگرین مەرج نییە لە زاتی "حی"یەوە وەری بگرین[١٥٥].

لە باسکردن و خستنەڕووی تیۆرەکەی ئەبو هاشم لە مەسەلەی "أحوال" "حاڵ"دا، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە تا ئاستێکی زۆر لەوە دەچێت موعەممەر تەنها ناوی سیفەتەکەی ناو نابێت "معانی" ئەگەرنا ئەوەندە جیاوازی بەدی ناکەین، هەروەك موعەممەر سیفەتەکانی بە "معانی"

---

[١٥٤]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

[١٥٥]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

جیاوازن لەوەی پەیوەندی بەوانەوە هەیە لەڕووی سیفەتەوە وەك جوڵە و نەجوڵە، ئەم جوڵە و نەجوڵانەش شتانێکی "عرضين" بایەخێکی ئەوتۆیان نییە، لەڕاستیدا موعەممەر ئەوەی بە باشتر زانیووە ئەمانە ناو لێبنێ مانا "معانی" نەك سیفات، چونکە ئەو پێی وایە کە بە مانە بڵێیت سیفەت لە جەوهەر و ناوەڕۆکی سیفەت کەم دەکاتەوە، هەروەها ئەگەر یەکێك لەم سیفەتانە بسەلمێنرێت، ئەو کاتە ئەو گرنگیەی نامێنێ،[151] بۆیە کاتێك موعەممەر دەڵێ خودای گەورە هەر بۆ خۆی زانستە، ئەمە لەبەر مانایە، واتە موعەممەر زاتی خودای گەورەی کردووە بە تاقانەیەکی قەدیم، ویستویەتی بیسەلمێنێت کە سیفەتەکان یان کۆمەڵێك مانای نا سەرەکین یان ئەوەتا هیچ گرنگ نییە، بەڵکو ئەوەی کە گرنگە زاتی خودای گەورەیە[152].

## • ئەبو هاشمی جەبائی و هەڵوێستی لەمەڕ سیفەتەکانەوە:

ئەبو هاشمیش بە هەمان ڕێگەی "موعەممەری کوڕی عوباد"دا ڕۆشتووە، خۆی ڕزگار کردووە لە مەسەلەی سیفەتەکان، بۆیە هەستا ناوی لە سیفات نا "حاڵ". کاتێك کە دەڵێن خودا زانایە لەسەر زاتی خۆی، واتە خودا خاوەنی حاڵەتێکە، ئەم حاڵەتەش "زانست"ە کە بریتی یە لەسیفەتێکی دیار لەپشتی ئەوەی کە ئەم زانستە زاتێکی موجود و دیارە[153].

---

[151] ـ بڕوانە ـ زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل٦٨.

[152] ـ الأشعري ـ مقالات الإسلاميين و إختلاف المصلين ـ ل٧٤ ـ تحقيق: محمد محيي الدين ـ مكتبة النهضة المصرية ـ ١٩٥٠م.

[153] ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٩٥.

ئەم حاڵەتانە یان ئەم سیفەتانە بە تاك تاك نایانناسین، بەڵکو سیفەتەکە لە خودی زاتەکەوە دەناسین، واتە: حاڵەتەکان خۆیان بە تەنها نەبوونیان هەیە و نە بوونیشن، نە دیارە و نە نادیاریشە، بۆیە خۆیان بە تەنها نا ناسرێن، بەڵکو لەگەڵ زاتی خودا دا دەناسرێن"[١٥٤].

ئەبو هاشم زیاتر قسەکەی لەبارەی حاڵەوە ڕوونتر دەکاتەوە و دەڵێ: (عەقڵ هەست بە جیاوازییەکی زۆر پێویست دەکات لە نێوان ناسینی شتەکان بەشێوەیەکی ڕەها، وە لەگەڵ ناسینی شتەکان لەسەر سیفەتەکانیان، ئەوەی کە بە زانا ناسرا مەرج نییە زانا بێت، بۆیە دەبینین بوونەوەرەکان زۆرجار لە مەسەلەیەکدا هاوبەشن و لە مەسەلەیەکی دیکەدا جیاوازن، ئەم هاوبەشی و جیاوازییە ناگەڕێتەوە بۆ خوودەکە، وە ناشگەڕێتەوە بۆ شتەکانی پشتەوەی زاتەکە، ئەو کاتە پێویست دەکات کە وەك حاڵەت ناوزەد بکرێت، ئەوەی کە "زانا" زانا بێت ئەمە حاڵە کە بریتی یە لە سیفەتێك کە لە پشتی ئەوەوەیە کە هاوکات زاتیشە، واتە ئەو مانایەی کە لە سیفەت وەریدەگرین ئەو مانا نییە کە لە خودەکە یان زاتەکەوە وەری دەگرین، هەروەها ئەو مانایەی کە لە قودرەت وەریدەگرین مەرج نییە بە توانا بێت، ئەو مانایەش لە "حی" یەوە وەریدەگرین مەرج نییە لە زاتی "حی"یەوە وەری بگرین"[١٥٥].

لە باسکردن و خستنەڕووی تیۆرەکەی ئەبو هاشم لە مەسەلەی "أحوال" "حاڵ"دا، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە تا ئاستێکی زۆر لەوە دەچێت موعەممەر تەنها ناوی سیفەتەکەی ناو نابێت "معانی" ئەگەرنا ئەوەندە جیاوازی بەدی ناکەین، هەروەك موعەممەر سیفەتەکانی بە "معانی"

---

[١٥٤]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

[١٥٥]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

لێکدایەوە، بۆ ئەوەی لە نرخ و بەهایان کەمکاتەوە، ئەبو هاشمیش هاتووە هەمان ڕێبازی موعممەری گرتەبەر، جا سیفەتەکان یان حاڵەکان هیچ بەهایەکیان نییە مەگەر کاتێك کە پەیوەست بن بە زاتی پەروەردگارەوە، کەواتە خۆیان بە تەنها ناتوانن دەرکەون، چونکە نرخەکەی لە بەهای زاتەوە هەڵقوڵاوە کە پەیوەستە بەوەوە، بۆیە دەبینین شتبوونی لەم حاڵەتانەدا نەفیکردووە، بۆ ئەوەی قوڵبوونەوە لە جەوهەر بوونیاندا کەمکاتەوە، وتویەتی نە بوونیان هەیە نە بوونیشیان نییە، لەم قسەشدا هیچ دژ یەکێکی تێدا نییە، خۆ گەر بیوتایە بوونیان هەیە، ئەوە دەیسەلماند شتێکن، هەروەها سەبارەت بە حاڵەتەکەش ئەگەر بیوتایە نییە، ئەو کاتە دەیسەلماند کە ئەویش شتێکە، ئەو کاتە ئەبو هاشمیش دەیووت نەبوو شتێکە.

## • پەیڕەو و میتۆدی موعتەزیلە لە ناسینی سیفەتەکاندا:

بینیمان کە پەیڕەو و پرۆگرامی موعتەزیلە لە مەسەلەی سیفەتەکاندا لەسەر پاککڕاگرتنی خودای گەورە و سەلماندنی کەماڵی یەکتاپەرستی ڕاوەستاوە، بەڵام با بزانین ئەو ڕێگایە کامەی کە موعتەزیلە گرتویەتیە بەر بۆ ئەوەی بگات بە ناسینی سیفەتەکانی خودا.

سەرەتا دەبێت سەرنج لەهەموو ئەو شتانە بدەین کە ئەوەتان بە دەور و پشتماندا، لە بێ گیان و گیانەوەر و مرۆڤ، دەبینین هەموویان دەتوانن قسە بکەن و توانای دەربڕینیان هەیە، "جاحظ" دەڵێت: (هەمور ئەوەی کە بە بەڵگە دەهێنرێتەوە دەبێت بە بەڵگە، بەڵام هەموو بەڵگەیەك نابێت بە بەڵگە بۆ هێنراوە، هەموو گیانەوەر و بێگیانێك بەدەر لە مرۆڤ بەشداری دەکات لەبوونی خۆی، ئەوەش ناودەبرێت بەدەربڕی خۆی... تەنە لاڵە بێدەنگەکان لەڕووی

زمانی حاڵەوە گۆیان، چونکە کۆمەڵێك ڕێکسازی و دانایی زۆر جیاوازیان تێدایە بۆ کەسێك کە لێیان وردبێتەوە و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکات، هەروەها دەبنە گۆیا و زمان حاڵ بۆ کەسێك بیەوێت بیانهێنێتە گۆ، هەروەك چۆن لاواز و زەرد هەڵگەڕاوەکان دەبینیت دەزانیت کە بارودۆخیان خراپ و ناجێگیرە... لە زاری "فەضلی کوڕی عیسا"وە هاتووە دەڵێت: (لە زەوی بپرسە و بڵێ کێ ڕووبارەکانتی تەقاندووە، کێ درەختەکانی تۆی ناشتووە و کێ بەروبوومەکانی تۆی چنیوەتەوە، خۆ گەر بە قسە وەڵامی نەدایتەوە، ئەوە بە زمانی حاڵ وەڵامت دەداتەوە[156]). ئەی لەپاش سەیرکردنی تەنەکان و ڕووداوە نوێکان چی ڕوودەدات؟ قازی عەبدولجەبار وەڵاممان دەداتەوە و دەڵێ: (...پێویستە مرۆڤ سەیری ئەم ڕووداوە نوێیانە بکات لە تەنەکان و غەیری تەنەکاندا، ئەو کاتە دەبینێ کە دەکرێت گۆڕانکارییان بەسەردا بێت، پاشان بزانێت کامیان نوێیە ئینجا سەیری دروستبوونەکەشی بکات، ئەوجا دەگاتە ئەو ڕاستیەی کە خۆیان بە دیهێنراون، ئینجا سەیری وەدیهاتنەکەشیان بکات، ئەو کاتە مرۆڤ ئەو زانستەی بۆ دروست دەبێت کە ئەمانە وەدیهێنەرێکیان هەیە بە پێی ئەو ڕوانینەی کە سەیری دەکات، ئەمەش یەکەم زانستە کە مرۆڤ لە ڕێگەیەوە خودای پێ دەناسێ، هەڵبەتە بە پێی ئەو ڕێگەیەی کە ئەبو هوذەیل دایناوە[157]).

دوای ئەوەی لەڕێگەی زانستەوە خودای گەورە دەناسێت و سەیری دروستی ئەو زانستە دەکات لەڕێی ناسینی خوداوە، ئەو کاتە دەزانێت کە خودا بە توانایە، وە لەڕاستێتی کردارەکانی خوداشەوە دەزانێت کە خودا زانایە، وە

---

[156]- الجاحظ - الحيوان - جـ١ - ل٥، تحقيق: عبد السلام هارون - ط٢ - القاهرة - ١٩٦٥م.

[157]- القاضي عبد الجبار - شرح الأصول الخمسة - ل١٥.

لەڕێگەی زانست و هێزەکەشیەوە دەزانێت کە زیندووە، لەم بارەوە قازی عەبدولجەبار دەڵێ: (پاش ئەوە سەیری ڕاستێتی کردارەکە دەکات، ئەو کاتە مرۆڤ لە ڕێگەی زانستەکەیەوە بۆی دەردەکەوێت کە خودا بە توانایە، پاشان سەیری ڕاستێتی کردارەکە دەکات بە پێی تۆکمەیی و ڕێکسازی، ئەو کاتە مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت کە خودا زانایە، ئەوجا کە زانی خودا بە توانا و زانایە، ئەو کاتە دەگات بەو زانستەی کە خودا زیندووە و هیچ کەمووکوڕییەکی نییە، هەر لەڕێگەی زانستەوە دەزانێت کە خودا بیسەر و بینایە، جا کاتێك کە زانی بیسەر و بینایە، بۆی دەردەکەوێت کە خودا هەیە، پاشان سەیری ئەو شتانە دەکات کە خودا بەدیهێناون، دەگاتە ئەو دەرئەنجامەی کە کۆتاییان دێت و دەگەنەوە بە خودا و پاش ئەو کۆتایی نایەت، ئەو کاتە لەڕێگەی ئەو زانستەوە بۆی دەردەکەوێت کە خودا قەدیمە[١٥٨]). بەم شێوە زانستی و ئەقڵیە جوانە مرۆڤ خودا و سیفەتەکانی خودا دەناسێ کە شیاوی شکۆ و گەورەیی خودا بێت، ئەگەر چی ئەم سیفەتانە ـ وەك موعتەزیلەکان پێیان وایە ـ لەگەڵ خودا دا قەدیم نین، چونکە لای ئەوان جگە لە خودا هیچ شتێك قەدیم نییە.

لەوەی کە ڕابورد بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە پەیڕەو و پرۆگرامی موعتەزیلە لە مەسەلەی سیفاتدا دەڕژێتە ناو نەفی هەر قسەیەك کە ئیسپاتی هەر قەدیمێك بکات جگە لە خودای گەورە، بۆیە ڕەخنە لە بۆچوونی سەلەف دەگرن کە دەڵێن سیفاتی خودا قەدیمە و شتانێکی زیادەن لە زاتی خودا، چونکە ـ بە بۆچوونی موعتەزیلە ـ ئەمە دەبێتە هۆی فرە قەدیمی، ئەمەش ئەوەیە کە موعتەزیلە هەوڵیداوە لێی دوورکەوێتەوە.

---

[١٥٨]ـ هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

بۆیە پێمان باشە ئەم ئەندازە لەمەسەلەی سیفات و هەڵوێستی موعتەزیلە لە بارەی سیفەتەکانەوە بوەستین، زۆر نەچینە ناو هەندێ مەسەلەی ناسەرەکیەوە، ئەمەش بە پشت بەستن بە ڕێسا گشتیەکان لەم مەسەلەیەدا، ئێستا دەچینە سەر مەسەلەیەکی دیکە لە مەسەلەکانی یەکتاپەرستی لای موعتەزیلەکان کە مەسەلەی خەلقی قورئانە.

## مەسەلەی دووەم:ـ خەلقی قورئان:

ئەوەمان باسکرد کە یەکەم کەس لەبارەی خەلقی قورئانەوە قسەی کرد "جەعدی کوڕی درهەم"[١٥٩] بوو، پاشان جەهمی کوڕی صەفوان هات و ئەم قسەیەی لە جەعدەوە وەرگرت، دواتر لەسەر دەستی "واصل" و هاوەڵانی ئەم قسەیە بڵاوبوویەوە. جا پێش ئەوەی ڕاوبۆچوونی موعتەزیلە سەبارەت بە خەلقی قورئان بخەینەڕوو، وا باشە سەرەتا هەڵوێستی سەلەف لەبارەی قورئانەوە بخەینە ڕوو بۆ ئەوەی زیاتر بابەتەکە بەسوود بێت.

### • هەڵوێستی سەلەف سەبارەت بە خەلقی قورئان:

هیچ شتێکمان لە سەلەفەوە بۆ نەهاتووە کە باس لەم مەسەلەیە بکات، بەڵام کاتێك سەرنج لە بۆچوونی هاوەڵان و کتێبەکانی تەفسیر دەدەین، دەبینین تەنها ئەوەیان وتووە کە قورئان کەلامی خودایە، نەیان وتووە کە قورئان مەخلوقە یان مەخلوق نییە، بەڵام ئەوانەی کە پشتیوانی لە مەزهەبی

[١٥٩]ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو، پەراوێزی ٥٤.

سەلەف دەکەن تەنها بەوە نەوەستان کە بڵێن قورئان کەلامی خودایە، بەڵکو بۆ دژایەتیکردنی موعتەزیلە وتیان: قورئان نە مەخلوقە وە نە مەخلوقیش نییە.

## • هەڵوێستی موعتەزیلە:

بینیمان کە موعتەزیلە بە ئاشکرا ئینکاری بۆچوونی سەلەفیان کردووە لەوەدا کە سیفاتی خودا قەدیم و ئەزەلی بن، بەڵکو وتویانە ئەم سیفەتانە بۆ خۆیان زاتن و لە پشتەوەی زاتی خوداوەن، چونکە گەر بڵێی سیفاتی خودا قەدیمە ئەمە دەبێتە هۆی فرە قەدیمی، ئەوەشمان زانی کە عەللاف کاتێك سیفەتی "علم و قدرة و حیاة"ی بۆ خودا سەلماند، نەیووت زاتی خودا نین، بەڵکو مەبەستی پێی ئەوەبوو کە ئەم سیفەتانە هەر خودی زاتی خودان، بەلاَم ناکرێت ئەم ڕێسایە بەسەر سیفەتی کەلامدا جێبەجێ بکرێت، چونکە دروست نییە بڵێیت کەلامی خودا هەر زاتی خودا خۆیەتی، چونکە حەقیقەتی کەلام لای موعتەزیلە بریتی یە لە کۆمەڵە دەنگێکی پچڕ پچڕ و کۆمەڵە پیتێکی ڕێکخراو، بۆیە مەحاڵە بە ئەقڵێکی سادە کەلام هەبێت و دەنگەکانیشی پچڕ پچڕ بێت، ئەمەش حەقیقەتی کەلامە لای موعتەزیلەکان[١٦٠].

موعتەزیلەکان لەبارەی کەلامی خوداوە ڕای جیاوازیان هەیە، ئایا کەلام "تەنە" یان "عرض"[١٦١]"؟ هەندێکیان وتویانە کەلام تەنە، بەلاَم ئەبو هوذەیل پێی وایە کە کەلام "عرض"ە، چونکە لەیەککاتدا لە چەندین شوێندا کەلام بوونی هەیە، هەرچی "نەظام" و هاوەڵەکانیشیەتی ئەوا پێیان وایە کەلامی

---

[١٦٠] ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ١ـ ل٩٣. القاضي عبد الجبار ـ المغني ـ بەشی حەوتەم ـ خلق القرآن ـ ل٢١ ـ تحقيق ـ إبراهيم الإبياري ـ ١٩٦١ م.

[١٦١] ـ "عرض" بە هەموو شتێك دەوترێت کە هەستی پێدەکرێت و دەبینرێت. "وەرگێڕ"

مەخلوقات "عرض"ە، چونکە تەنها جوڵە بەلای ئەوانەوە شتێکی "عرض"یە[162]. بەڵام کەلامی خودای گەورە تەنە، ئەوەی کە مرۆڤ دەیخوێنێتەوە ئەوە جوڵەیە، واتە: "عرض"یە، کەواتە ئەوە قورئان نییە کە ئێمە دەیخوێنینەوە بەڵکو شتێکی "عرض"یە داهاتەیە، چونکە ناکرێت قورئان لەیەککاتدا لەدوو شوێندا ببێت[163]. جا لەبەر ئەوەی قورئان کەلامی خودایە، ئەو کاتە دەبێت یان تەن بێت یان "عرض"، بەم پێیە کەلام جگە لە مەخلوق هیچی دیکە نییە. موعتەزیلە نکۆڵی ئەوە ناکەن کە خودا قسە دەکات، چونکە قسەکەر لای ئەوان کرداری قسەکردنە، نەك کەسەکە قسەی کردبێت، بەڵام ئەی خودا چۆن قورئانی دروستکردووە؟ ناکرێت خودا لە زاتی خۆیدا کەلامی وەدی هێنابێت، چونکە ئەگەر خودا قسە بکات، ئەوە لە زاتی خودادا دەنگی دروست کردووە ـ لای موعتەزیلە کەلام دەنگە ـ جا یان تەنە یان "عرض"ە ئەگەر وابوو ئەو کاتە زاتی خودا دەبێتە شوێنی شتە تازەکان کە ئەمەش مەحاڵە. هەروەها ناکرێت خودا لەغەیری شوێنێکدا دروستی کردبێت، چونکە تەن یان "عرض" پێویستی بە شوێنێك هەیە کە تێیدا بەرجەستە ببێت[164]. بۆیە هەندێ لە موعتەزیلەکان دەڵێن خودا قورئانی لە "لوح المحفوظ"دا دروستکردووە، ناکرێت بگوێزرێتەوە، چونکە مەحاڵە لە یەککاتدا شتێك لە دوو شوێندا بوونی هەبێت،

---

[162]ـ "نەظام" پێی وایە هەموو کرداری بەندەکان جوڵەیە، نەجوڵانیش جوڵەی متمانە بوونە، زانست و ویستەکانیش جوڵەی ناخە، مەبەستی بەم جوڵەیە جوڵەی گواستنەوە نییە، بەڵکو جوڵە لای ئەو بنەمای هەر گۆڕانێکە، سەرەتای هەر گۆڕانێکیش بریتی یە لە جوڵە. بڕوانە ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٧٤.

[163]ـ الأشعري ـ مقالات الإسلاميين ـ جـ١ ـ ل٢٤٥، ٢٤٦، زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل٧٧.

[164]ـ زهدي جار الله ـ هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

ئەوەی کە دەیخوێنینەوە تەنها گێڕانەوەی ئەو نوسراوەیە کە یەکەمجار لە "لوح المحفوظ"دا هەبووە[165].

بۆ سەلماندنی خەلقی قورئان موعتەزیلە تەنها پشتی بە بەڵگەی ئەقڵی نە بەستووە، بەڵکو لە هەمانکاتدا پشتی بە بەڵگەی نەقڵیش بەستووە، خودای گەورە لە پەیامەکەیدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا[166]﴾. واتە: (بێگومان ئێمە کردمان بە خوێندنەوەیەکی شێوە زمانی عەرەبی). خودا وای لێکردووە کە قورئان بە زمانی عەرەبی بخوێنرێتەوە، لەبەر ئەوەی قورئان گۆڕانی بەسەردا هاتووە کەواتە مەخلوقە، چونکە "مجعول" لای موعتەزیلە بە مانای " مخلوق " لێکدەدرێتەوە، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ مُحْدَثٍ﴾.[167] واتە: (ئەوانە هەر بەشێکی نوێ و تازەی قورئانیان لەلایەن خودای بەخشندەوە بۆ بێت...). جا وشەی " ذکر" - واتە قورئان - "محدث"یش واتە مەخلوق. لە ئایەتێکی دیکەدا خودا دەفەرموێت : ﴿الٓر ۚ كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ﴾.[168] واتە: (ئەم جۆرە پیتانەش هەر لەو پیتانەن کە ئەم قورئانەیان لێ پێکهاتووە، - ئەم پەیامە کە لەلایەن خوداوە نێرراوە - کتێبێکە گشت ئایەتەکانی ڕێك و پێکن دەستکاری ناکرێن، پاشان هەر لەلایەن خودایەکی کار دروستی ئاگادارەوە بە جوانی حەڵاڵ و حەرامەکانی شیکراونەتەوە). لای موعتەزیلە "محکم کتابە و مفصلە" واتە دروستکەر و وەدیهێنەری قورئان[169].

---

[165] - الملل و النحل - جـ١ - ل٨٧.

[166] - سورەتی - الزخرف - ئایەتی ٣.

[167] - سورەتی - الشعراء - ئایەتی ٥.

[168] - سورەتی - هود - ئایەتی ١.

[169] - بڕوانە: السیوطي - تأریخ الخلفاء - ل٣٦٧.

هۆكاری سەرەكی موعتەزیلە لە مەسەلەی خەلقی قورئاندا بەرگریكردن بوو لە یەكتایی و تاقانەیی خودا، ئەگەر قورئان مەخلوق نەبێت كەواتە قەدیمە، ئەو كاتە لەگەڵ خودای گەورەدا دەبێتە هاوبەش لە قەدیمیەتدا، بۆیە دەبینین كە خەلیفە مەئمون ـ كە لەسەر مەزهەبی موعتەزیلە بوو ـ لەو نامەیدا دەڵێ كە ناردی بۆ والیەكەی لە عێراق (ئاگاداربە كە زۆربەی زۆری ژێر دەستەكانت ... لەگەڵ خودای گەورەدا قورئانیشیان كردووەتە هاوبەش، وایاندانەوە كە قورئان قەدیمە و خودا خەڵقی نەكردووە و وەدی نەهێناوە.. [170]). لەلایەكی ترەوە موعتەزیلە لەوە ترساوە كە قورئان لە دڵی موسڵماناندا كە ـ دەڵێن قورئان قەدیمە ـ هەمان ئەو پێگەی مەسیحی هەبێت لای گاورەكان كە بڕوایان وابووە "كلمة الله" قەدیمە و مەسیحیش بەشێكە لە خودا[171]. بۆیە لە مەسەلەی خەلقی قورئاندا موعتەزیلەكان هەمان ئەو پەیڕەو و پرۆگرامەیان گرتە بەر كە لەمەسەلەی سیفاتدا گرتبوویانە بەر، پشت بە خودا لە بەشی چوارەمی ئەم كتێبەدا، لە ڕەهەندی سیاسیەوە باس لە مەسەلەی میحنەتی خەلقی قورئان دەكەین و هەموو ئاریشەكان لەو ڕووەوە دەخەینە ڕوو.

## • مەسەلەی سێهەم:ـ بینینی خودا:

لە قورئانی پیرۆزدا كۆمەڵێك ئایەت هاتووە كە بینینی خودا دەسەلمێنێ و كۆمەڵێك ئایەتیش هەیە كە نەفی بینینی خودای گەورە دەكات، یەكێك لەو ئایەتانەی كە بینینی خودا دەسەلمێنێ، ئەم ئایەتە پیرۆزەیە كە خودا

---

[170]ـ هەمان سەرچاوە و لاپەرە.

[171]ـ القاضي عبد الجبار ـ شرح الأصول الخمسة ـ ل٣٠٢.

دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ﴿٢٢﴾ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ﴿٢٣﴾ [172]﴾. واتە: (لەڕۆژی قیامەتدا ڕوومەت و ڕووخسار گەلێ گەشاوە و پاراو و پرشنگدارە و خۆشی و شادییان لێ دەبینرێ و بۆ پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن). یەکێك لەو ئایەتانەش کە نەفی بینی خودا دەکات ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾ [173]﴾. واتە: (هیچ چاوێك دەرکی ناکا و بۆی نابینرێ، لەکاتێکدا ئەو هەموو چاوەکان دەرك دەکا و دەبینێ و بە وردیش ئاگای لەهەموو شتێکە، تەنها ئەویشە کار ناسك و وردبین و ئاگادار بەهەموو شتێك). لێرەوە ڕای جیاواز لە نێوان پەیڕەوانی سەلەف لە لایەك، وە لە نێوان موعتەزیلەشدا لە لایەکی ترەوە دروست بوو، جا سەرەتا هەڵوێستی سەلەف سەبارەت بە بینینی خودا دەخەینە ڕوو، ئەوجا هەڵوێستی ئەهلی عەدل و تەوحید ـ موعتەزیلە ـ ش لەو بارەوە دەخەینە ڕوو.

- ## هەڵوێستی پێشین ـ سەلەف ـ سەبارەت بە بینینی خودای گەورە:

زۆربەی زانایانی سەلەف پێیان وایە خودای گەورە لە دونیادا نابینرێ، بە بەڵگەی ئەم ئایەتە پیرۆزە کە خودا دەفەرموێت: ﴿لَّا تُدْرِكُهُ ٱلْأَبْصَـٰرُ وَهُوَ يُدْرِكُ ٱلْأَبْصَـٰرَ ۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٠٣﴾﴾. بەڵام لە ڕۆژی دواییدا دەبینرێ بە

[172] ـ سورەتی ـ القیامة ـ ئایەتی ٢٢، ٢٣.

[173] ـ سورەتی ـ الأنعام ـ ئایەتی ١٠٣.

بەڵگەی ئەم دوو ئایەتە کە خودا دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٖ نَّاضِرَةٌ ۝ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٞ ۝﴾. ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ۝﴾.[174] واتە: (ئاگاداربن! بەڕاستی ئەوانە لەو ڕۆژەدا لە دیتنی خوداوەندیان مەحجوبن و نابینن). ئیبن کەثیر لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا پشتگیری لە مەزهەبی سەلەف دەکات و دەڵێ: (لەڕۆژی دواییدا بێباوەڕان لە بینینی خودا بێبەش دەبن، ئیمام عەبدوڵڵای شافیعی دەڵێ: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە بڕواداران لە ڕۆژی دواییدا خودا دەبینن، ئەوەی کە ئیمامی شافیعی وتی لەبارەی ئەم ئایەتەوە... بەڵگەیە لەسەر ئەوەی لەڕۆژی دواییدا خودای گەورە بەچاو دەبینرێت..[175]). کەواتە لەمەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەهلی سەلەف دەڵێن خودا لە ڕۆژی دواییدا دەبینرێ، بەڵام نەفی بینینی خودایان کردووە لە دونیادا.

## • هەڵوێستی موعتەزیلە سەبارەت بە بینینی خودا:

گومانی تێدا نییە کە موعتەزیلە نکۆڵی بینینی خودا دەکەن بە چاو چ لە دونیادا وە چ لە ڕۆژی دواییشدا، ئەم نکۆڵیکردنەش لەپێناو ئەوەدایە تا خودا بە یەکێك لە دروستکراوەکانی هاوشێوە پێنەکرێت، چونکە بینین پێویست بە تەن یان ئاڕاستەیەك دەکات تا لێی بڕوانی - دەی خوداش تەن یان ئاڕاستەیەکی نییە تا لێی بڕوانرێت - بۆیە موعتەزیلە نکۆڵی هەموو ئەوانەی کرد کە بدرێتە پاڵ خودای گەورە، ئیتر لێرەوە هاتن تەئویلی هەموو ئەو

---

[174] - سورەتی - المطففین - ئایەتی ١٥.

[175] - إبن کثیر - تفسیر القرآن العظیم - جـ٤ - ل٤٨٧- دار الحدیث - القاهرة - ١٤١٥ك - ١٩٩٤م.

ئایەتانەیان کرد کە لێکچوو یان هاوشێوە بۆ خودا دروست دەکات، ئەوەبوو نکۆڵی ئەوەیان کرد کە خودا " ڕوو یان چاو یان دەستی هەبێت"، بۆ ئەم مەبەستەش هاتن دەستیان بە واتای هێز لێکدایەوە، چاویش بە واتای زانست و "وجە" یان ڕووی خوداشیان هەر بە خودی خودا زانیووە، چونکە بەتاڵە ئەگەر بڵێی خودا وەجهی هەیە و بەشێکە لە خودا ، یان "وجە" سیفەتێك بێت بۆ خودا و وەك زاتی خودا قەدیم بێت، کەواتە ماوەتەوە بوترێت کە "وجە"ی خودا یان ڕووی خودای گەورە هەر وەك دەوترێت "ئەمە ڕووی ڕاستەقینەیەی مەسەلەکەیە[176] ".

موعتەزیلە بەمەش نەوەستان هاتن تەئویلی "کورسی" یان لەم ئایەتە پیرۆزەدا کرد کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ ۖ﴾.[177] "کورسی" یان بە زانست لێکداوەتەوە، واتە لای ئەوان ئەم ئایەتە بەم شێوەیە تەفسیر دەکرێت (زانستی خودا تەواوی ئاسمانەکان و زەوی داگرتووە)، چونکە گەر بە "کورسی" لێکمان دایەوە ئەو کاتە لەسەریشی دادەنیشێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت جەستەیەکی دیاریکراومان بۆ خودا داناوە.[178] لەسەر ئەم پەیڕەو و پرۆگرامە موعتەزیلە بەردەوام نکۆڵی ئەوەیان کردووە کە خودای گەورە بە چاو ببینرێت چ لە دونیا و چ لە دواڕۆژدا. گەرچی موعتەزیلە نکۆڵی بینینی خودای گەورەیان کرد کە بەچاو ببینرێت،

---

[176] ـ الإنتصار ـ ل٧٠.

[177] ـ سورەتی ـ البقرة ـ ئایەتی ٢٥٥.

[178] ـ الأشعري ـ مقالات الإسلامیین ـ جـ١ ـ ل١٥٧.

بەڵام زۆربەی موعتەزیلەکان پێیان وایە کە: خودا بە دڵ دەبینرێ و هەستی پێدەکرێت.[179]

یەکێك لە بەڵگە ئەقڵیەکانی موعتەزیلە ئەوەیە دەڵێن هەر شتێك لەڕێی هەستەوەری چاوەوە ببینرێت، ئەوە دەبێت لە گۆشەیەکەوە ببینیت، ئەگەر نا نابینرێ، لەڕاستیدا لای موعتەزیلە ئەوە سەلمێنراوە کە خودای گەورە نابینرێ. ئەوەتا دەڵێن خودای گەورە نابینرێ چونکە بینینی خودا شتێکی مەحاڵە، نەك لەبەر ئەوەی بینین قەدەغەکراوە، ئەگەر دروست بووایە خودا ببینرێت، ئەوە دەبوو ئێستاش بمانبینیایە، جا لەبەر ئەوەی خودا نابینین ئیتر ئەوە ئاشکرایە کە ئێمە ئێستا خودا نابینین.[180]

هەرچی ئەشعەرییەکانیشە بەپێچەوانەی موعتەزیلەکانەوە پێیان وایە کە خودای گەورە لە ڕۆژی دواییدا دەبینرێ، بەڵگەشیان بۆ ئەمە بەڵگەی بوونە،[181] ئێمە خودی شتەکە و دیوی دەرەوەی شتەکە دەبینین، بۆیە هەرشتێك بوونی هەبوو دەبینرێ، جا خودی شتەکە و دیوی دەرەوەی شتەکە لە ڕووی سروشتەوە هەردووکیان لەیەکتر جیاوازن، بۆیە دەبێت لە نێوانیاندا عیلەتێکی هاوبەش هەبێت کە هەر یەك لەو دوو ناوبراوەی لەسەر بونیادنرابێت، ئەوجا خودی شتەکە و دیوی دەرەوەی شتەکە کە بریتی یە لە "وجود" و "حدوث"، "حدوث"یش نابێت وەك ئەوی دیکە وابێت کە لەپێناویدا دەبینرێ، چونکە "حدوث" بریتی یە لەو شتەی کە لەنەبوونەوە دێتە بوون، کەواتە نەبوون

---

[179] ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٢١٨.

[180] ـ بڕوانە ـ القاضي عبد الجبار ـ شرح الأصول الخمسة ـ ل٢٨٤...

[181] ـ ئەشعەرییەکان پێیان وایە: کاتێك خودا بوونی هەبێت، کەواتە خودا دەبینرێت. ـ وەرگێڕ ـ

بەشێك نییە لە عیلەت، خودای گەورەش بۆیە دروستە ببینرێ لەبەر ئەوەی بوونی هەیە.[182] یەكێك لەو بەڵگە نەقڵیانەی كە موعتەزیلە پشتی پێدەبەستن ئەم ئایەتە پیرۆزەیە: ﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَ﴾.[183] واتە: (هیچ چاوێك دەركی ناكاو بۆی نابینرێ، لەكاتێكدا ئەو هەموو چاوەكان دەرك دەكا و دەبینێ و بە وردیش ئاگای لە هەموو شتێكە). زەمەخشەری لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: (بینین بۆ خودای گەورە نەشیاوە، چونكە دەركی پێناكرێ و لەزاتی خۆیدا نابینرێ، بینین پەیوەستە بەوەی كە لە گۆشەیەكەوە بێت یان جەستە بێت بۆیە ناكرێت خودا ببینرێت..).[184]

موعتەزیلە ئەم ئایەتە لەڕیزبەندی ئایەتە "مُحكم"ەكاندا دادەنێن، هەموو ئەو ئایەتانەش كە لەبارەی بینینی خوداوە هاتوون لە ڕیزبەندی ئەو ئایەتانەدان كە "مُتشابە"ن، جا كاتێك ئایەتی "مُحكم" سەرەكی بوو كەواتە ئایەتی "مُتشابە" نا سەرەكیە و دەبێت لە كاتی ڕاڤەكردنی ئایەتەكەدا بیگێڕینەوە بۆ ئایەتە سەرەكیەكە، چونكە ئایەتی " مُتشابە" دەبێت بگێڕدرێتەوە بۆ ئایەتی "مُحكم"، قازی عەبدولجەبار دەڵێت: (ئایەتی "مُحكم " دەبێت بە بنەما بۆ بەڵگە هێنانەوە، ئەو ئایەتە "مُحكم"ە ناسەلمێنرێ دەبێت ئایەتە " مُتشابە"ەكە بگێڕێتەوە بۆ لای ئەو، بۆ ئەوەی بەهۆی ئایەتە "مُحكم

---

[182] ـ بڕوانە ـ الأشعري ـ الإبانة في أصول الديانة ـ ل١٧ و دوای ئەو ـ مطبعة الجمل المصرية ـ ١٣٤٨ك.

[183] ـ سورەتی ـ الأنعام ـ ئایەتی ١٠٣.

[184] ـ الزمخشري ـ تفسير الكشاف ـ جـ٢ ـ ل٥٣.

"ە کەوە ئایەتە "مُتشابە"ەکەمان بۆ ڕۆشن ببێتەوە..).[185] ئەوەبوو بینیمان کە چۆن سەلەف ئەم ئایەتەیان وەك بەڵگە دەهێنایەوە بەوەی کە خودا تەنها لە دونیادا نابینرێ، ئیبن کەثیریش لە تەفسیرەکەیدا باس دەکات کە خاتوو عائیشە (خودای لێ ڕازی بێت) ئەم ئایەتە وەك بەڵگە دەهێنێتەوە بۆ سەلماندنی بینینی خودا لە ڕۆژی دواییدا، بەڵام نکۆڵی دەکات لەوەی کە لە دونیادا ببینرێت..).[186]

هەروەها موعتەزیلە پشت بەم ئایەتە دەبەستێت کە خودا دەفەرموێت: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَـٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ قَالَ رَبِّ أَرِنِىٓ أَنظُرْ إِلَيْكَ ۚ قَالَ لَن تَرَىٰنِى وَلَـٰكِنِ ٱنظُرْ إِلَى ٱلْجَبَلِ فَإِنِ ٱسْتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوْفَ تَرَىٰنِى ۚ فَلَمَّا تَجَلَّىٰ رَبُّهُۥ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُۥ دَكًّا وَخَرَّ مُوسَىٰ صَعِقًا ۚ فَلَمَّآ أَفَاقَ قَالَ سُبْحَـٰنَكَ تُبْتُ إِلَيْكَ وَأَنَا۠ أَوَّلُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿١٤٣﴾﴾.[187] واتە: (کاتێك کە موسا هات بۆ شوێنی موناجاتەکە لەگەڵمان و پەروەردگاری کەوتە قسە و گفتوگۆ لەگەڵی و گوێی لە دەنگیبوو، موسا بە پەرۆشیەوە وتی: پەروەردگارم! خۆتم پێ نیشان بدە، زۆر ئارەزوومە بتبینم، خودا فەرمووی: موسا! هەرگیز لەم دونیایەدا تۆ ناتوانی بمبینی، ـ چونکە بونیەی ئادەمیزادی ئێستای ئەم دونیایە، توانای بینینی خودای نییە ـ بەڵام لەم کێوە بڕوانە، من خۆمی پێ نیشان دەدەم، جا گەر ـ ئەو کە بونیەی لە تۆ پتەوترە ـ لە جێی خۆی مایەوە، نەبزووت، ئەوسا تۆش

---

[185] ـ بڕوانە ـ القاضي عبد الجبار ـ المغني ـ جـ١٢ ـ النظر و المعارف ـ ل٧ ـ تحقيق: د. إبراهيم مدكور ـ ١٩٦٢م.

[186] ـ تفسیر أبن کثیر ـ جـ٢ ـ ل١٥٤.

[187] ـ سورەتی ـ الأعراف ـ ئایەتی١٤٣.

دەتوانی بمبینی، ئەگەر نا هەرگیز نامبینی، جا هەر کە پەروەردگاری بۆ کێوەکە خۆی دەرخست، بە جاریٚ کێوەکەی ڕووناککردەوە و هەپروون هەپروونی کرد و موساش بێهۆشکەوت و بوورایەوە، کاتیٚ بەهۆش هاتەوە وتی: خودایە! پاکو خاوێنی و بێخەوشی هەر بۆ تۆیە، هەر شتێکیش تۆ لەکەدار بکا، دوور ڕاتدەگرم لێی و پەشیمانیشم لە داواکەم، وە من یەکەمین کەسم لەناو بەنی ئیسرائیلیە بڕوادارەکاندا بڕوام بە گەورەیی و دەسەلاٚتی تۆیە). ئەوەی کە نامۆیە ئەوەیە نەیارانی موعتەزیلە هەمان ئایەت بە بەلگە دەهێننەوە بۆ سەلماندنی بینینی خودا بە پێچەوانەی موعتەزیلە کە ئایەتەکە بۆ نەفی بینینی خودا دەهێننەوە، ئەشعەری دەلێت: ئایەتی "أَرِنِيٓ أَنظُرۡ إِلَيۡكَۚ" بەلگەیە لەسەر ئەوەی خودا دەبینریٚ، چونکە گەر خودا نەبینریٚ موسا لێی نەدەپرسی خۆتم پیٚ پیشان بدە، خۆ گەر موسا داوای شتێکی بکردایە ئەستەم بووایە کەواتە موسا خودای باش نەناسیووە و سەرکێشی کردووە، دەی نەزانین و سەرکێشیش بۆ پێغەمبەران مەحالە، ئەمە بەلگەی یەکەم.[188]

هەروەها ئەوەی کە دەفەرموێت " فَإِنِ ٱسۡتَقَرَّ مَكَانَهُۥ فَسَوۡفَ تَرَىٰنِيۚ " ئەم بینینەی پەیوەستکردووە بە جێگیربوونی کێوەکەوە، جێگیربوونی کێویش مەحالٚ نییە، جا لەبەر ئەوەی ئەمیش پەیوەستکراوە بەوەی کە دەکرێت ببێت، کەواتە بینین مەحالٚ نییە و دەکرێت خودا ببینرێت، ئەمەش بەلگەیەکی دیکەیە.[189]

---

[188]- الأشعري - الإبانة في أصول الديانة - ل١٧.

[189]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو - بڕوانە محمد صالح الزركان - فخر الدين الرازي - و آراؤة الكلامية و الفلسفية - ل٢٦٦ - دار الفكر العربي - بيروت - ١٩٦٣م.

موعتەزیلە بەرپەرچی ئەم تەئویلاتانە دەداتەوە و دەڵێت " رؤية " لەم ئایەتەدا بە مانای " زانست " دێت، لەبەر ئەوەی "رؤية " بە تەنها باس دەکرێت، بەڵام ئەگەر لە بری "رؤية" " نظر" بهاتبایە ئەوە بە مانای زانست نەدەبوو.[190]

موعتەزیلە پێی وایە خودای گەورە پرسیارەکەی موسای زۆر بەگەورە زانیووە، بەڵکو سزای هەر کەسێکش دەدا لەو بارەوە پرسیار بکات، ئەوەتا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَـٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَـٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ۚ﴾.[191] واتە: (خاوەن نامەکان، داوات لێدەکەن کە کتێبێکی تایبەتیان لە ئاسمانەوە بۆ بێنی، نوسرابێ بۆ فلانەکەس، هەر وەك چۆن تەورات بە کاملی و گشت پێکەوە هات بۆ موسا، دیارە قورەیش هەمان بیانوویان لێگرتی و وتیان: بڕوات پێناکەین تا لەم زەوییە کانییەکمان بۆ هەڵدەقوڵێنی، ئەوانە مەزنتر و گەورەتر لەوەیان لە موسا خواستبوو، وتیان: دەبێ بە ئاشکرا خودامان پێ پیشان بدەیت! جا لە سزای ئەو قسە ناڕەوا و ناهەقیانەدا، هەورە بروسکەیەکی سەخت گرتنی).

"جاحظ" لە تەئویلی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەڵێ: (ئەگەر خودای گەورە دروست بێ و بگونجێ بە چاو ببینرێ و بە هەندێ لە هەستەوەرەکان دەرکی پێ بکرێ، ئەوە دروست بوو، چونکە خەڵکەکە پرسیاریان لە شتێك کرد کە مەحاڵ نەبوو، بەڵام کاتێ خودا بەم شێوەیە تووڕە بووە، ئەم پرسیارەی

---

[190] ـ القاضي عبد الجبار ـ شرح الأصول الخمسة ـ ل٢٦٢.

[191] ـ سورەتی ـ النساء ـ ئایەتی١٥٣.

ئەوانی بە قورس داناوە، کردوونی بە نموونە بۆ خەڵکانی تر و کردویەتی بە جورئەت بەسەریانەوە کە دەیانەوێت لە پێگەی پەروەردگارییەتی خودا کەم بکەنەوە).[192]

بێگومان خودای گەورەش وەڵامی موسای دایەوە و پێی فەرموو: (..لَن تَرَىٰنِي(. بۆیە لێرەدا دەڵێن "لن" " نفی تأبید"ە، بۆیە موعتەزیلە ئەمەیان کردووە بە بەڵگە بۆ نەبینی خودا چ لە دونیادا وە چ لە دوارۆژدا.[193]

هەروەها موعتەزیلە هەموو ئەو ئایەتانەیان تەئویلکردووە کە پەیڕەوانی ڕیبازی سەلەف و ئەشعەری پشتیان پێ بەستووە بۆ سەلماندنی بینینی خودا، ئەوەتا بەم شێوەیە تەئویل بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە دەهێننەوە کە خودا دەفەرموێت: ﴿وُجُوهٌ يَوۡمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ ۝٢٢ إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ ۝٢٣﴾.[194] واتە: (لەڕۆژی قیامەتدا ڕوومەت و ڕووخسار گەلێ گەشاوە و پاراو و پرشنگدارە و خۆشی و شادییان لێ دەبینرێ و بۆ پەروەردگاری خۆیان دەڕوانن). موعتەزیلە دەڵێت مەبەست لە "إِلَىٰ " کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە بۆ نیعمەتە، ئەم بینینە مەبەست پێی بینینی خودا نییە، بەڵکو مەبەست پێی چاوەڕوانیە، واتە چاوانێك چاوەڕوانی نیعمەتی خودا دەکەن نەك بینینی خودا.[195]

---

[192]- رسائل الجاحظ - جـ٤ - ل١٠ - تحقيق: عبد السلام هارون - مكتبة الخانجي - ١٩٧٩.

[193]- تفسير إبن كثير - جـ٢ - ل٢٣٤.

[194]- سورەتی - القيامة - ئایەتی ٢٢، ٢٣.

[195]- بڕوانە - تفسير إبن كثير - جـ٤ - ل٤٥١، یان - الأشعري - الإبانة - ل١٧.

سەبارەت بە ئایەتی : ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ ﴿١٥﴾﴾.[196]

واتە: (ئاگاداربن! بەڕاستی ئەوانە لەو ڕۆژەدا لە دیتنی خوداوەندیان مەحجوبن و نابینن). هەر یەك لە شافیعی و سەلەف ئەم ئایەتەیان کردووە بە بەڵگە بۆ بینینی خودا و دەڵێن: خودای گەورە کە پەردە لەنێوان خۆی و خراپەکاراندا دروست دەکات، دڵنیایە لەوەی کە چاکەکاران بە دڵنیاییەوە خودا دەبینن.[197]

موعتەزیلە لەم بارەوە دەڵێت: ئەمە بەڵگە هێنانەوەیە بە "مفهوم المخالفة"،[198] دەی ئەمەش لە شتە ناسەرەکیەکانی فیقهدا پشتی پێ نابەسترێت، ئیتر چۆن لە شتە سەرەکیەکانی دیندا پشتی پێ دەبەسترێت، ڕواڵەتی ئایەتەکە هیچی تیا نییە کە بەڵگە بێت لەسەر ئەوەی بێباوەڕان لە ڕۆژی دواییدا خودا نابینن، چونکە خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿كَلَّآ إِنَّهُمۡ عَن رَّبِّهِمۡ يَوۡمَئِذٖ لَّمَحۡجُوبُونَ﴾ نەیوتووە "عن رؤية ربهم" واتە "بینینی خودا"ی بەکار نەهێناوە. تەنانەت وتویانە مەبەستی ئایەتەکە "عن ربهم" واتە "رؤية

---

[196] ـ سورەتی ـ المطففین ـ ئایەتی١٥.

[197] ـ تفسیر إبن كثیر ـ جـ٤٥١ ـ ٤.

[198] ـ لای زانایانی "أصول الفقه" مەبەست پێی مانای لەفزە بۆ سەلماندنی ـ مفهوم المخالفه ـ واتە پێچەوانەی حوکمی ئەوەی کە دەوترێت بۆ ئەوەی کە نەوتراوە، ئەمەش لەکاتێکدایە بۆ نەهێشتنی یەکێك لە کۆت و بەندە موعتەبەرەکانی ناو حوکمی وتراوەکەیە (لەو نموونەی پێشوو کە خودا فەرمووی بێباوەڕان لە ڕۆژی دواییدا خودا نابینن، ئەو حوکمە وتراوە بەڵگەیە بۆ سەلماندنی پێچەوانەی ئەوەی کە نەوتراوە، واتە بڕواداران خودا دەبینن. سەبارەت بە ـ مفهوم المخالفه ـ لای هەریەك لە شافیعی و کۆڕای زانایان بەڵگەی پێدەهێنرێتەوە، بەڵام لای حەنەفیەکان بەڵگەی پێناهێننەوە. بڕوانە: د. محمد فرحات ـ أصول الفقه ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ ل١٥٩ ـ ١٦١.

ربهم" بینینی خودایە، ئێمەش دەڵێین ئەو ئایەتە ئەوە مەبەستەکەی نییە، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە ئەوان لەپاداشتی خودا بێبەشن، چونکە گەر ئێوە لە ڕواڵەتی ئایەتەکە لادەن، ئەوە ئێوە لە مەسەلەی تەئویلکردندا لە ئێمە لەپێشتر نین، ئەو کاتە ئێمەش بە شێوەیەك تەئویلی ئایەتەکە دەکەین کە گونجاو بێت لەگەڵ بەڵگەی ئەقڵیدا.[199]

سەبارەت بەو فەرموودەی "جەریر"[200] کە ئیسپاتی بینینی خودا دەکات لە ڕۆژی دواییدا، ئەوە تانەیان لەم فەرموودە داوە، دەڵێن ئەم فەرموودەیە لە قەیسی کوڕی حازمەوە دەیگێڕێتەوە ئەویش لە جەریرەوە فەرموودەکەی وەرگرتووە، قەیسیش کەسێکی متمانە پێکراو نییە و تانەی لێدراوە، چونکە هەمان بۆچوونی خەواریجەکانی هەبوو، هەروەها لە کۆتایی تەمەنیشیدا شتی لەبیر دەچوویەوە و لە مێشکیدا شتی تێکەڵ دەکرد، بۆیە سەنەدی ئەم فەرموودەیە لاوازە، تەنانەت ئەگەر سەنەدەکەشی تەواو بێت و ڕاوییەکانیش

---

[199] ـ القاضي عبد الجبار ـ شرح الأصول الخمسة ـ ل٢٦٧.

[200] ـ ئەم فەرموودە لە هەردوو صەحیحی موسلیم و بوخاریدا هاتووە کە جابر دەڵێت: (نظر رسول الله صلى الله عليه وسلم إلى القمر ليلة البدر فقال: إنكم ترون ربكم كما ترون هذا القمر، فإن استطعتم أن لا تغلبوا على الصلاة قبل طلوع الشمس ولا قبل غروبها فافعلوا). واتە: "پێغەمبەر ـ درودی خودای لێبێت ـ لە شەوی بەدردا سەیری مانگی کرد و وتی: ئێوە خوداکەتان دەبینن هەروەك چۆن مانگ دەبینن، ئەگەر توانیتان زاڵبن بەسەر نوێژەکەدا پێش خۆر هەڵهاتن ـ نوێژی بەیانی ـ یان پێش خۆر ئاوابوون ـ نوێژی عەسر ـ ئەوە نوێژەکەتان بکەن". بڕوانە ـ تەفسیری ئیبن کەثیر ـ جـ٤ ـ ل٤٥٠.

ڕاستگۆبن، یەکێکە لە فەرموودەی ئاحاد،[201] فەرموودەی ئاحادیش لە مەسەلەی عیلمیدا پشتی پێ نابەسترێ. چونکە عیلمی یەقین نابەخشێ.[202]

پوختەی ئەم بابەتە ئەوەیە موعتەزیلە بۆ ئەوەی بەرگریی لەیەکتایی و تاقانەیی خودا بکات لە دوو ئاڕاستەوە هەنگاویان گرتەبەر: ئاڕاستەی یەکەم نکۆڵیکردنی فرە قەدیمی بوو، لەم پێناوەدا نکۆڵی هەر سیفەتێکان کرد کە لە زاتی خودا خۆی زیاتر بێت، بەڵام کاتێك ئیسپاتی سیفەتی خوداشیان کرد وتیان سیفەتەکان خودی خودا خۆیەتی، هەندێکی دیکەشیان سیفەتەکانیان بە "معانی" "مانا" لێکدایەوە و هەندێکی دیکەش بە "حاڵ"، هەموو ئەمانەش بۆ ئەوەبوو لە بەها و ناوەڕۆکی سیفەتەکان کەمکەنەوە و نەیدەنە پاڵ خودا، هەروەها وتویانە قورئان مەخلوقە و کەلامی خودا نییە، تا جگە لە خودای گەورە هیچ شتێك قەدیم نەبێت، هەرچی ئاڕاستەی دووەمیشە ئەوا خۆی لە بنەمای نەفی هەر جۆرە هاوشێوە و تەندارکردنێکدا دەبینێتەوە، بۆیە هاتن هەموو ئەو ئایەتانەی کە تەشبیهی خودا وەك یەکێك لە دروستکراوەکان دەکات تەئویلیان کرد و بە "مجاز" لە قەڵەمیاندا، تا گەیشتە ئەوەی نکۆڵی بینینی خوداشیان کرد لە ڕۆژی دواییدا، بۆیە خاڵی دەستپێك لای موعتەزیلە بەرگرییکردن و پاککڕاگرتنی خودای گەورە بوو لەهەموو ئەو شتانەی کە هۆش

---

[201] ـ فەرموودەی "ئاحاد" بریتی یە لەو فەرموودانەی کە لەم سێ چینە وەرنەگیراوە، هاوەڵان، شوێنکەوتوان، شوێنکەوتەی شوێنکەوتوان، یان لە هاوەڵ و شوێنکەوتووانەوە وەرنەگیراوە، بەڵکو لە پاش ئەوانەوە وەرگیراوە. زۆربەی ئەم فەرموودانەش ناچنە ڕیزبەندی یەقین و زانستەوە، بەڵکو تەنها گومانە، بڕوانە: د. عبد المجيد مطلوب ـ المدخل في التعريف بالفقه الإسلامي ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ ل١٧٤.

[202] ـ القاضي عبد الجبار ـ شرح الأصول الخمسة ـ ل٢٦٩.

و بیری مرۆڤ دەوروژێنێ لەبەرامبەر ئەو ئایەتانەی کە هاوشێوە یان لێکچوو بۆ خودای گەورە دروست دەکات، خاڵی دەستپێکیشیان بۆ ئەمە بریتی بوو لەم ئایەتە پیرۆزە کە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾.[٢٠٣]

واتە: (هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو خودایە، نە لە زاتیا، نە لە سیفاتیدا، نە لەکرداریدا، بۆ خۆی تەنیایە و لە هەموو شتێك بێ نیازە و هەموو شتێکیش نیازمەندە بەو).

## بنەمای دووەم: دادپەروەری "العدل"

گومانی تێدا نییە ئازادی و بەرپرسیارێتی هەردوو تەواوکاری یەکترن، ناگونجێ کە بەرپرسیارێتی سەر شانی کەسێك هیچ ئازادییەکی لەگەڵدا نەبێ، گەر ئەمە ڕوو بدات ئەوە خۆی لە خۆیدا ستەمە. ئەم تەواوکارییەی نێوان ئازادی و بەرپرسیارییەتی ناسراوە و کارپێکراوە لەبواری پەیوەندییە مرۆییەکاندا، بەڵام ئایا ئەم تەواوکارییە لە نێوان ئازادی و بەرپرسیاریەتیدا بوونی هەیە بەهەمان پلە لە نێوان پەیوەندی مرۆڤ و پەروەردگاردا؟ جا گەر ئەم تەواوکارییە بوونی هەیە ئاستەکەی چەندە؟ ئایا تێکڕای کردەوەکان دەگرێتەوە یان بۆ هەندێ لە کردەوەکانە؟ ئایا ئازادی مرۆیی لە سەلماندنی کردەوەکاندا شتێکی ڕەهایە یان ڕێژەییە، بە مانایەکی دیکە ئایا مرۆڤ خۆی کردەوە و ئەنجامەکەی دەخوڵقێنێت یان ئەوەتا خۆی کردەوە دەخوڵقێنێت بەڵام ئەنجامەکەی خودا دەیخوڵقێنێت؟

---

[٢٠٣] ـ سورەتی ـ الشوری ـ ئایەتی١١.

ئەم پرسیارانە و چەندین پرسیاری دیکە بە تێپەڕبوونی سەدەکان هەمیشە فیکر و بیری مرۆڤایەتی بە خۆیەوە سەرقاڵکردووە و دیدی زۆریش لەو ڕووەوە خراونەتە ڕوو، تەنانەت زۆر ئەستەمە کە بتوانین لەم ڕووەوە تیۆرێك بدۆزینەوە و ڕەخنەباران نەکرابێت یان بەدەر بووبێت لە کەموکوڕی ـ بە پێچەوانەی تیۆرەکانی قورئان کە بوار نییە ئێستا وەك نموونە بیانهێنینەوە ـ هەندێك پێیان وایە کە مرۆڤ ئازادە و ویست و ئیرادەی هەیە، هەندێکیش پێیان وایە مرۆڤ تەنها وەك ئامێرێك وایە بۆ جێبەجێکردنی کارێك ئەگەر نا هیچ ویست و ئیرادەیەکی بە دەست نییە، جا گەر ئێمە بە دیدێکی ئیسلامیەوە لەم بابەتە بڕوانین، دەبینین ئەم مەسەلەیە لە زۆر ڕووەوە قسەی تێدا کراوە، لەڕاستیدا دید و تێڕوانینی جیاواز لەم ڕووەوە لە نێوان بیرمەندە ئیسلامیەکاندا هەبووە، سەرچاوەی سەرەکی هەمووشیان بریتی بووە لە قورئانی پیرۆز، ئەوەتا کۆمەڵێك ئایەت هاتووە کە تیایدا ئاماژە بە ئازادی ویستی مرۆڤ دەکات، لەوەی چی بە باش دەزانێ ئەنجامی بدات، لەبەرامبەر ئەمەدا کۆمەڵێك ئایەتی دیکە هەن کە ئاماژە بەوە دەکات مرۆڤ لەم بوونەوەرەدا ئازاد نییە و هیچ بەدەستە لەو کارانەی کە ئەنجامی دەدات، نموونەی ئەو ئایەتانەی کە ئاماژە بە ویست و ئازادی مرۆڤەکان دەکات بریتی یە لەم ئایەتانەی لای خوارەوە: خودای گەورە دەفەرموێت : ﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡ﴾.[٢٠٤] واتە : (پێیان بڵێ، ئەی موحەممەد "درودی خودای لێبێت" هەق و ڕاستی تەنها هەر ئەوەیە کە لەلای پەروەردگارتانەوە هاتووە بۆتان، پاش دەرکەوتنی هەق و ڕاستی سەربەستن کێ باوەڕ دێنێ و موسڵمان دەبێ با بڕوا

[٢٠٤] ـ سورەتی ـ الکهف ـ ئایەتی ٢٩.

بێنێ، کێش دەیەوێ کافر و بێ بڕوابێت، با هەر کافر بێت). ﴿إِنَّا هَدَيْنَٰهُ ٱلسَّبِيلَ إِمَّا شَاكِرًا وَإِمَّا كَفُورًا ﴿٣﴾﴾.[٢٠٥] واتە: (بێگومان ئێمە ڕێگەی ـ چاك و خراپەمان ـ پیشاندا، سەرپشکمان کرد، یان سوپاسگوزار ـ بڕوادار دەبێ ـ یان سپڵە و بێباوەڕ و خوانەناس). ﴿فَمَنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِوَكِيلٍ﴾.[٢٠٦] واتە: (هەر کەسێك ڕێی ڕاست بەدی بکا، دیارە هەر بۆ خۆی ڕێنوێنە و کەڵکی هەر بۆ خۆی دەبێت، هەر کەسێکیش گومڕا و سەر لێشێواو بوو، هەر خۆی زیانی لێدەکەوێت، خۆ منیش بریکاری ئێوە نیم، هەتا کار و کردەوەتان بپارێزم و ڕاستتان بکەمەوە).

ئەو ئایەتانەی کە ئاماژە بە"جەبر" دەکات و مرۆڤ هیچ بە دەستە لە کردارەکانیدا بریتین لەم ئایەتانەی لای خوارەوە:[٢٠٧] خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَمْلِكُ لِنَفْسِى نَفْعًا وَلَا ضَرًّا إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُ ۚ﴾.[٢٠٨] واتە: (بڵێ: من خاوەنی هیچ شتێك ـ چ سوود، چ زیان ـ بۆ خۆشم نیم، مەگەر ئەوەندە خودا مەیلی هەبێت).

---

[٢٠٥] ـ سورەتی ـ الإنسان ـ ئایەتی٣

[٢٠٦] ـ سورەتی ـ یونس ـ ئایەتی ١٠٨.

[٢٠٧] ـ خودا دوو ڕێگەی بۆ مرۆڤەکان داناوە، ڕێگای باش و ڕێگای خراپ، جا هەر ڕێگایەکی گرتەبەر ئەوە تووشی دەرئەنجامی ئەو ڕێگایە دەبێت کە خودا بۆ هەر یەك لەو دوو ڕێگایەی داناوە، نەك ئەوەی خودا کارەکەی پێ ئەنجام بدات. "وەرگێڕ"

[٢٠٨] ـ سورەتی ـ الأعراف ـ ئایەتی ١٨٨.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ سَوَآءٌ عَلَيْهِمْ ءَأَنذَرْتَهُمْ أَمْ لَمْ تُنذِرْهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ۝٦ خَتَمَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ وَعَلَىٰ سَمْعِهِمْ ۖ وَعَلَىٰٓ أَبْصَٰرِهِمْ غِشَٰوَةٌ ۖ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ۝٧﴾.[٢٠٩] واته: (بێگومان ئەوانەش سەبارەت بە بەڵگە و ئایەتەکانی خودا خوانەناس و بێباوەڕن وەك یەك وایە، ئایا بیانترسێنیّ یان نەیانترسێنی، واتە: ئاگاداریان بکەیت یان نا، هەر باوەڕ ناهێنن، کەوابوو لە باوەڕ نەهێنانیان دڵنیابە و بە تەمایان مەبە و خەریکی کاری خۆتبە).

﴿وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِيٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ۝٣٤﴾.[٢١٠] واتە: (خۆ گەر خودا بیەویّ گومڕاشتان بکا و ڕێتان لێتێك بدا، ئیتر من هەر چەندە ئامۆژگاریتان بکەم بۆ سوود و کەڵکی ئێوە، سوود و کەڵکی نابیّ بۆتان، چونکە خودا خۆی دەیەویّ گومڕا بن، دیارە کە ئیتر هەرگیز ناتوانن لە ئیرادەی ئەو دەرچن، هەر ئەویشە پەروەردگارتان و هەر بۆ لای خۆیشی دەچنەوە و حیساب و لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکات).

﴿قُل لَّن يُصِيبَنَآ إِلَّا مَا كَتَبَ ٱللَّهُ لَنَا هُوَ مَوْلَىٰنَا ۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ۝٥١﴾.[٢١١] واتە: (بڵێ: ئەی موحەممەد ـ درودی خودای لیّ بێت ـ هەرگیز شتێکمان تووش نایە، خودا خۆی لە "لوح المحفوظ"دا بڕیاری نەدا بیّ

---

[٢٠٩] ـ سورەتی ـ البقرة ـ ئایەتی ٦، ٧.

[٢١٠] ـ سورەتی ـ هود ـ ئایەتی ٣٤.

[٢١١] ـ سورەتی ـ التوبة ـ ئایەتی ٥١.

بۆمان، هەر ئەویش بۆ خۆی گەورە و سەروەرمانە، موسڵمانان دەبێ پشت و پەنایان هەر خودا بێت).

هەروەها کۆمەڵە ئایەتێکیش هاتوو پێکەوە لە یەککاتدا ئاماژە بە ئازادی و جەبریەتی مرۆڤ دەکات، بە جۆرێك کە ئایەتێك ئاماژە بە ئازادی دەکات ڕاستەوخۆ ئایەتی پاش ئەو ئاماژە بە جەبرییەت دەکات، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ هَـٰذِهِۦ تَذْكِرَةٌ ۖ فَمَن شَآءَ ٱتَّخَذَ إِلَىٰ رَبِّهِۦ سَبِيلًا ﴿٢٩﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٣٠﴾﴾.[٢١٢] واتە: (بەڕاستی ئەم سورەتە و هەموو ئایەتەکانی قورئان پەند و ئامۆژگارییە بۆ جیهانەکانی پەری و ئادەمیزاد، واتە ـ مرۆڤە ژیرەکان کەڵکی لێوەردەگرن و نەفامەکانیش پێی قەڵس دەبن ـ جا ئەوەی ویستی ڕزگاری ببێ لە دواڕۆژدا، ڕێگایەکی ڕاست دەگرێ بۆ لای پەروەردگار، وە هیچ شتێك لەم شتانە ئارەزوو ناکەن، مەگەر کاتێ ویستی خودای لەسەر بێت. بەڕاستی ئەو خودایە زۆر زانا و کار جوان و کار دروستە).

هەروەها دەفەرموێت: ﴿لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ وَمَا تَشَآءُونَ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢٩﴾﴾.[٢١٣] واتە: (یادەوەرییە بۆ ئەو کەسەتان بیەوێ لەسەر ڕێی ڕاست ئیستیقامەی ببێ، ئێوە ئارەزووی ئیستیقامە ناکەن، مەگەر خودای خاوەن جیهانەکان ئارەزووی بکات).

پاش خستنەڕووی ئەم ئایەتانە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بیرمەندەکانی ئیسلام کەوتوونەتە چ گێژاوێك بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفت و

---

[٢١٢] ـ سورەتی ـ الإنسان ـ ئایەتی ٢٩، ٣٠.

[٢١٣] ـ سورەتی ـ التكوير ـ ئایەتی ٢٨، ٢٩.

ئاریشانە، ئەوەبوو کۆمەڵێك بیروڕا دەرکەوتن لەسەر وردەکاری زۆر جیاواز لە نێوان ئەوانەی کە نکۆڵی قەدەری خودا دەکەن لەگەڵ ئەوانەی کە قەدەری خودا دەسەلمێنن.

## • هەڵوێستی هاوەڵان و سەلەف لە مەسەلەی قەدەردا:

بینیمان کە هاوەڵان و پەیڕەوانی ڕێبازی سەلەف لە ئیسپاتکردنی قەدەردا زۆر لەیەکەوە نزیکبوون، دەگێڕنەوە کە عەمری کوڕی عاص بە ئەبو موسای ئەشعەری وتووە: ئایا خودای گەورە شتێکم لەسەر دەنوسێت و دواتر لەسەر ئەوە سزام بدات؟ وتی: بەڵێ. عەمر وتی: بۆچی؟ ئەشعەری وتی: لەبەر ئەوەی ستەمت لێ ناکات. ئیتر عەمریش بێدەنگبوو زۆر لەسەری نەڕۆشت.[٢١٤]

بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە ئیسپاتی قەدەریان کردووە، نەفی ئەوەیان نەکردووە کە مرۆڤ جوزئێکی ئیختیاری بە دەستە و لە هەندێ کردەوەشدا ئیختیاری بەدەست نییە، بۆیە کاتێك کە دەڵێن ئەمە قەدەری خودایە، مەبەست پێی ئەوە نییە کە مرۆڤ هیچ بژاردەیەکی لەبەردەستدا نییە، هەواڵێك هەیە کە ئەم بۆچوونە پەیوەندەکاتەوە کە بۆچوونی عەلیە (خودای لێ ڕازی بێت)، جا لەبەر درێژی هەواڵەکە پێم باشبوو تەنها دەقەکە بێنمەوە بۆ ئەوەی زیاتر سوود بە بابەتەکە بگەیەنێت، دەگێڕنەوە پیاوێکی بە تەمەن پاش ئەوەی لە جەنگی "صفین" گەڕایەوە هات بۆ لای عەلی و پێی وت: پێمان بڵێ ڕۆشتنمان بۆ شام ویست و قەدەری خودای لەسەر بوو. عەلی وتی: سوێند بەو کەسەی کە بەهەشت و شنەبای بە پاکی دروستکردووە نەچووینەتە هیچ جێگەیەك و هیچ بەرز و نزمی شیوێکمان نەبڕیوە... ئەوا بێگومان ویست و قەدەری خودای

---

[٢١٤]ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل١٠٦.

لەسەر بووە. پیاوە بە تەمەنەکە وتی: وا نازانم لای خودا هیچ پاداشتێکم بۆ نەنوسرێت، عەلی پێی وت: بێدەنگبە ئەی پیرە پیاوە. خودای گەورە پلە و پایەی بەرزی بۆ نوسیوون لە ڕۆشتننتان و گەڕانەوەتاندا. لە هیچ حاڵەتێکدا ئێوە بە زۆر ڕاپێچ نەکراون و ناچار نەکراون و بە ویستی خۆتان چوون. پیاوە بە تەمەنەکە وتی: چۆن؟ قەزا و قەدەر ئێمەی بردووە؟ عەلی وتی: هاوار بۆ تۆ! ـ تۆ بە هەڵە تێگەیشتوویت ـ گومانت وایە قەزا و قەدەر هەر ئەبێت وابێ و هیچ ملە جەڕێیی تێدا نەبێ و ئەو شتە دەبێت هەر بێتە دی، ئەمە ئەوە نییە کە تۆ لێی تێگەیشتوویت. ئەگەر وا بوایە ئیتر پاداشت و سزا و فەرمان بە چاکە و بەرگریکردن لە خراپە نە ئەبوو، ئەو کاتە خودا سەر زەنشتی هیچ تاوانبارێکی نە دەکرد و ستایشی کەسی چاکەکاریش نەدەکرد. کەسی چاکەکاریش لای خودا باشتر نەبوو لە خراپەکار لە پاداشتدا، بە هەمان شێوە خراپەکاریش سەرزەنشتی زیاتر نە دەکرا لە کەسێك کە چاکە کاربێت. ئەم جۆرە قسانە قسەی بت پەرست و سەربازانی شەیتان و ئەوانەن کە شایەتی درۆ دەکەن و کوێرن لە ئاست پاداشتدا. ئەوانە قەدەرییەکانی ئەم ئوممەتە و مەجوسەکانن. خودای گەورە کاتێك فەرمانیکردووە بژاردەی بۆ دیاریکردووە، کاتێکیش قەدەغەی لێکردووە ئاگاداریشی کردووەتەوە، ئەرکێکیشی ڕاسپاردووە کە ئاسانە و لە توانای مرۆڤدا هەیە ئەنجامی بدات، هیچ کەس بە زۆر سەر پێچی خودا ناکات و کەسیش بە زۆر فەرمانبەرداری خودا ناکات. هەروا بە هەوانتە و بێهوودە پێغەمبەرانی بۆ مرۆڤەکان نەناردووە. ئاسمانەکان و زەویشی هەروا بە بێ هوودە دروست نەکردووە.[٢١٥]

---

[٢١٥] ـ د. موحەممەد بەدر (خودا لێی خۆش بێت) ـ کە مامۆستای فەلسەفەی قانونە لە کۆلێژی ماف لە زانکۆی "عین الشمس" لە کتێبەکەیدا بە ناوی " القيم الديمقراطية الأثينية و سيادة

لەم وتەی عەلیەوە (خودای لیٚ ڕازی بێت) دەتوانین ڕاوبۆچوونی سەبارەت بەم مەسەلەیە لەم خالاٌنەی لای خوارەوەدا کورتکەینەوە و بیانخەینەڕوو:

١ـ هەر شتێك کە ڕوو دەدات لە بوونەوەردا ـ لە نێویشیاندا کردەوەکانی ئادەمیزاد ـ هەمووی بە ویستی خودای گەورە ڕوو دەدات.

٢ـ قەزا و قەدەریش ناکاتە ئەوەی کە مرۆڤ ویستی لە بژاردەی کردەوەکانیدا نییە و بە زۆر پەلکێشی کارێك دەکرێت.

٣ـ لەبەر ئەوەی کە ئادەمیزاد سەر پشکە لە هەڵبژاردنی کردەوەکاندا، کەواتە پاداشت و سزا و تۆڵە و موژدە و دانایی لە ناردنی پێغەمبەراندا ڕۆڵ دەبینیٚ.

٤ـ خودای گەورە داوای ئەرکێکی لە مرۆڤەکان کردووە کە لە توانایدا هەیە ئەنجامی بدات، خودای گەورە ئەرکێك نادات بەسەر کەسێکدا کە لە توانایدا نەبیٚ.

---

القانون في التوراة و الإنجيل و القرآن" باسیکردووە. ـ چاپی ١٩٩٥ ـ ل١٧٤ ـ پەراوێزی ژمارە ١٤٥. کە لە کتێبی "المواقف فى علم الكلام" وەرگیراوە لە "ئەیجی" ـ نزیکتر لەم هەواڵەش ئەو قسەی عەلیە سەبارەت بە قەزا و قەدەری خودا، کە سیوطی لە کتێبەکەیدا "تأریخ الخلفاء" باسی لێوەکردووە لە ـ ل٢١٤ ـ دا کە دەڵیٚ: حارث وتی: پیاوێك هات بۆ لای عەلی و سەبارەت بە قەدەر لێی پرسی! پێی وت: ڕێگەیەکی تاریکە پیایدا مەڕۆ. دیسانەوە سەبارەت بە قەدەر لێی پرسیەوە! وتی: دەریایەکی قوڵە مەچۆرە ناوییەوە. لێی پرسیەوە قەدەر چی یە! وتی: نهێنیەکی خودایە مەگەڕیٚ بە شوێنیدا. وتی: هەواڵم لەبارەی قەدەرەوە بدەریٚ! وتی: ئەی پیاو خودا بە ویستی خۆی تۆی دروستکردووە یان بە ویستی تۆ؟ وتی: بە ویستی ئەو من دروست بووم. وتی: دەی کەواتە تۆش بە ویستی ئەو کارەکان دەکەیت.

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە "سەلەف" پێشین ئەگەر چی سەبارەت بە قەزا و قەدەری خودا وتویانە هەموو شتێك بە ویستی خودا بەڕێوە دەچێت، بەلام لەگەلّ ئەوەشدا ویست و ئیرادەیان لە ئادەمیزاد وەرنەگرتووەتەوە، بەلام هەروا مەسەلەکەیان هێشتووەتەوە و زۆر لەسەری نەڕۆشتوون.

## • هەلّوێستی جەهمیە و ئەشعەرییەکان سەبارەت بە مەسەلەی قەدەر:

بینیمنان کە یەکەم کەس لەبارەی قەدەرەوە قسەیکرد مەعبەدی جوهەنی و غیلانی دیمەشقی بوو، بۆیە ناویان لێنان "قەدەریەکانی سەرەتا" بێگومان ئێمەش لەڕیزی موعتەزیلەکاندا هەژمارمان کردوون، بەلّکو پێشمان وتوون موعتەزیلەکانی سەرەتا.[٢١٦]

ئەمە لەکاتێکدا قەدەرییەکان نەفی قەدەریان کردووە و زۆر لەو مەسەلەیەدا ڕۆچووبوون، هەرچی جەبرییەکانیشە ئەوا لەوەدا ڕۆچووبوون کە دەیانووت مرۆڤ هیچی بەدەست نییە و هەموو کردەوەکانی خودا پێی دەکات.

بۆیە دەبینین "جەهمی کوڕی صەفوان" لەبەرامبەر قەدەرییەکاندا وەستایەوە و لە مەسەلەی "جبر"دا زیادەڕەوی زۆریکرد، تا گەیشتە ئەوەی شەهرستانی جەهم و شوێنکەوتوانی ناو لێنا بە "الجبرية الخالصة"[٢١٧] واتە "جەبرییە دلّسۆزەکان". "جەهم" پێی وایە کردەوەکانی مرۆڤ خۆدا خولّقێنەریەتی، بەلام بەشێوەی"مجاز"ی دراوەتە پالّ مرۆڤ. لێرەدا

---

[٢١٦] ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

[٢١٧] ـ بڕوانە ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٩٩.

شەهرستانی ئەو وتەی جەهم لەبارەی قەدەرەوە ڕووندەکاتەوە و دەڵێ: (مرۆڤ توانای هیچ شتێکی نییە و بەوەش وەسف ناکرێ کە تواناداره، بەڵکو زۆری لێکراوە، هیچ ویست و ئیرادە و بژاردەیەکی نییە تیایاندا، بەڵکو خودا خۆی وەك تەواوی بێ گیانەکانی دیکە کردەوەی تێدا دروستکردووە، بەڵام بەشێوەیەکی "مجاز"ی کردەوەکان دەدرێتە پاڵ مرۆڤەکان، وەك چۆن دراوەتە پاڵ بێگیانەکانی تر، وەك دەوترێت: درەختەکە بەری گرت، ئاوەکە ڕۆشت.. جا وەك چۆن کردەوەکان ویستی مرۆڤەکانی تێدا نییە، بە هەمان شێوە پاداشت و سزاش بە زۆر دەدرێت بەسەر مرۆڤەکاندا و ویست و ئیرادەی مرۆڤەکەی تێدا نییە، کەواتە ئەرکیش هەر بەزۆر دەدرێت بەسەر مرۆڤەکاندا.[٢١٨]

هەرچی ئەشعەرییەکانیشە پێیان وابوو کە "جەهم" سەبارەت بە مەسەلەی قەدەر پەرگیری زۆری کردووە، چونکە هەموو ئیرادەیەك لە مرۆڤ دەگرێتەوە، هەروەها پێیان وابووە هەریەك لە بۆچوونی قەدەری و موعتەزیلەش لەبارەی قەدەرەوە پەرگیری زۆری تێدایە، چونکە ئەوانیش بۆچوونیان وەهابووە کە خودا هیچ قودرەت و ویستێکی بەسەر مرۆڤەکاندا نییە و مرۆڤەکان بۆ خۆیان کردەوەکانیان دەخوڵقێنن، بۆیە لێرەدا لەگەڵ ئەشعەرییەکاندا بۆچوونیان یەکناگرێتەوە، ئەشعەرییەکان پێیان وایە هەندێ کردەوەی مرۆڤ ناچارییە و هیچ توانا و ئیرادەی مرۆڤەکەی تێدا نییە، بەڵام هەندێ کردەوەی دیکە هەیە کە مرۆڤ تیایدا سەر پشکە، بەڵێ خودا کردەوەکە دروست دەکات، بەڵام ئەنجامدانەکەی بە دەست مرۆڤەکە خۆیەتی، خودا کردەوەکە دروست دەکات و هاوکات ئەو توانایەش دەدات بە مرۆڤەکە کە بتوانێت ئەو کردەوە ئەنجام بدات و لەگەڵ ئەو کردارەدا یەکدەگرێتەوە، شەهرستانی دەڵێت: (لەسەر وتەی

---

[٢١٨] ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل١٠٠.

ئەبولحەسەنی ئەشعەری: ئەو قودرەتەی کە ڕووداوەکەی تێدا ڕوویداوە لەبنەڕەتدا ئەو قودرەتە ڕۆڵێکی سەرەکی نییە، بەڵکو ڕۆڵی سەرەکی قودرەتی خودای گەورەیە..چونکە خودای گەورە بە جۆرێك کاروبارەکانی خۆی ڕێکخستووە کە لە دوای قودرەتەکەوە ڕووداوەکە ڕوو دەدات، یان لەژێر توانایی ئەودا یان لەگەڵیدا، جا گەر کەسەکە بیەوێت ئەو کارە بکات ئەوا خودای گەورەش بۆ دێنێتە پێشەوە، دەکرێت کارەکەش دووبارە بێتەوە یان نویێ بێتەوە، ئا بەم کارە دەوترێت دەستی خۆی تێدایە، خودای گەورە یەکەمجار هێناویەتی و جێبەجێی کردووە، بەڵام ئەنجامدەری کارەکە لەلایەن کەسەکە خۆیەتی و بە گوێرەی توانای کەسەکە ئەو کارە ڕوویداوە)[٢١٩].

لەڕاستیدا ئەشعەری هێندە ڕایان جیاواز نەبوو لەگەڵ جەبرییەکاندا تەنها لە هەندێ ئامرازی دەربڕیندا نەبێ کە پێچەوانە بوو ـ بۆیە هەردوو مەزهەبەکەمان پێکەوە خستەڕوو ـ جیاوازییەکانی نێوانیشیان لە وردەکارییەکاندا بوو نەك لەسەر شتە سەرەکیەکان، بەجۆرێك ناوکرۆکی دید و بۆچوونی هەردوولا وەك یەك وابوو، ئەگەر چی زۆر هەوڵیدا پێچەوانەی ڕاوبۆچوونی جەبرییە بێتەوە بەڵام هەوڵەکان بۆ ئەو مەبەستە بێ ئاکام بوو، چونکە ئەشعەرییەش دانی نەناوە بەوەدا کە مرۆڤ ئازادییەکی ئەرێنی هەیە لەبەرامبەر ئەو ئەرکەی کە ئەنجامی دەدا، لای جەبرییەکان هەموو کردەوەکانی مرۆڤ خودا دروستی دەکات، بەڵام بە شێوەی "مجاز" دەدرێتە پاڵ مرۆڤ، بەڵام ئەشعەرییەکان پێیان وایە خودا کردەوەکان دروست دەکات، بەڵام ئەنجامدانی کردەوەکە خودی مرۆڤەکەیە نەك خودا، لێرەدا نوسەر پێی وایە ئەشعەری شتێکی تازەی

---

[٢١٩]ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ ل١٠٩.

ئەوتۆی نەهێناوە کە جیاواز بێت لەڕاو بۆچوونی جەبرییەکان بۆیە تاڕادەیەك نزیکن لەیەکەوە.[220]

بێگومان کاتێك کە "ئەشعەری" وازی لە موعتەزیلە هێنا، هەموو پەرۆشیەکی بۆ ئەوەبوو کە بەرپەرچی موعتەزیلەکان بداتەوە و بەڵگەکانیان پوچەڵ بکاتەوە، بەڵام بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت لایدابوو بەلای بۆچوونی جەهەمیەکاندا.

دوای ئەوەی کە دید و بۆچوونی هەریەك لە مەزهەبی هاوەڵان و سەلەف لەگەڵ مەزهەبی جەهەمیە و ئەشعەرییەکاندا سەبارەت بە قەدەر خستەڕوو، وا باشە ئێستا مەزهەبی موعتەزیلەش لەو ڕووەوە پیشان بدەین.

## • هەڵوێستی موعتەزیلە سەبارەت بە قەدەر:

موعتەزیلە بەرگری لە ئازادی مرۆیی کرد و وتویان مرۆڤ ئازادە لە کردەوەکانیدا، ئەمەش لەپێناو بەرگریکردن لە عەدالەتی خودایی کە یەکێکە لە گرنگترین بنەماکانیان، تەنانەت خۆشیان بە "ئەهلی عەدل و توحید" ناوزەد کردووە، لەڕاستیدا "عەدل" لای موعتەزیلەکان پێناسە و چەمکێکی تایبەت بە خۆی هەیە: ئەگەر چی ئازادی و ئیرادەی مرۆڤ خۆی لە گرنگترین پایەی ئەم بنەمایەدا دەبینێتەوە. شەهرستانی دەڵێ: موعتەزیلە لەوەدا یەکدەنگبوون کە مرۆڤ توانای دروستکردنی کردەوەکانی خۆی هەیە بە خێر و شەڕیەوە، شایستەی ئەوەیە کە لەدواڕۆشدا بە پێی ئەو کردەوەی کە ئەنجامیداوە پاداشت و سزای لەسەر وەربگرێت، خودای گەورەش بە دوورە لەوەی ستەمێك

---

[220] ـ بڕوانە: د. محمد بدر ـ سيادة القانون في التوراة و الإنجيل و القرآن ـ ل١٨٤، ١٨٦.

یان شەڕێکی بدرێتە پاڵ، یان کردەوەیەکی بدرێتە پاڵ کە کوفر و سەرپێچیکردن بێت، چونکە گەر خودا زوڵم و ستەمی دروستکرد ئەوە خودایەکی زاڵم و ستەمکارە، هەروەك چۆن گەر عەدلیشی دروستکرد ئەوە خودایەکی دادپەروەرە، لەسەر ئەوەش یەکدەنگبوون کە خودا جگە لە کردەوەی خێر و چاکە هیچ کردەوەیەکی تر ناخوڵقێنێت، لەڕووی حیکمەت و داناییشەوە ئەوە دەخوازێ کردەوەکانی خودا بەرژەوەندی بەندەکانی تێدا پارێزراو بێت. هەرچی "أصلح" و "لطف"یشە ئەوا لای ئەوان ڕای جیاوازی لەسەرە، ئەم جۆرەش بە عەدل ناو دەبەن).[221]

ئەمە پوختەی چەمك و پێناسەی "عەدل" بوو لای موعتەزیلە، سەبارەت بە مەسەلەی قەدەریش ئەوە لەو کردەوانەیە کە مرۆڤ توانای بەسەریدا نییە، لەم مەسەلەشدا هیچ جیاوازییەك لەنێوان موعتەزیلە و ئەشعەرییەکاندا نییە، چونکە ئاشکرایە کە ئەو کردەوانە هیچ کات مرۆڤ توانای ڕوودانی ئەو کردەوانەی نییە و بێ توانایە لەبەرامبەریاندا، بەڵام سەبارەت بەو کردەوانەی کە مرۆڤ تیایدا سەر پشکە، ئەوە ئەنجامدانەکەشی بەدەستی مرۆڤ خۆیەتی، لەسەر ئەوە موحاسەبەی لەگەڵدا دەکرێت، گەر کردەوەی چاکەی ئەنجامدا ئەوە ستایشی لەسەر دەکرێت، گەر کردەوەی خراپیشی ئەنجامدا سەرزەنشت و سەرکۆنە دەکرێت، بۆیە ئەو کردەوانەی کە مرۆڤ بۆ خۆی ئەنجامی دەدا ئەرکی لێ داوا دەکرێت.. بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی کە موعتەزیلە ئینکاری ئەو زانستە بکات کە خودا دەیزانێ، چونکە خودای گەورە ئاگای لە کردەوەکانیان هەیە و هیچی لێ شاراوە نییە، هەمیشە زانایە بەوەی بزانێ کێ بڕوادارە یان بێ باوەڕ.[222]

---

[221] ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٦٦.

[222] ـ الإنتصار ـ ل١١٨ ـ بڕوانە زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل٩٢.

هەروەها ئەو توانایەش کە مرۆڤەکە پێی هەڵدەستێ بۆ ئەنجامدانی کردەوەکە ئەوە هەر خودا خوڵقاندویەتی، خودا ئەو توانایە لە مرۆڤدا دروست دەکات لە کاتی ئەنجامدانی هەر کردەوەیەکدا، توانایی شتێکە پەیدا دەبێ جیاوازە لەگەڵ تەندروستی و لەش ساغیدا، ئەمە بە پێی وتەی ئەبو هوذەیل.[223]

هەندێکی تر دەڵێن ئەم توانایە خودا هەر لە یەکەم ساتی دروستکردنی مرۆڤدا تێیدا خوڵقاندویەتی، لەوانە "نەظام"، ناوبراو پێی وایە توانایی بریتی یە لە " نییەتی باش و تەندروست بوونی ئەندامەکانی جەستە".[224].

لەم بارەوە قازی عەبدولجەبار دەڵێ: (لای موعتەزیلە دروست نییە مرۆڤ خۆی کردەوە بهێنێتە بوون، بەڵکو دەبێت ویست و ئیرادەی خودای لەگەڵدا بێت و توانایی پێ بەخشی بێت و هیچ لەمپەرێکی لەبەر دەستدا نەبێ بۆ ئەنجامدانی).[225] چونکە گەر خودا توانایی لە مرۆڤدا بەدی نەهێنێت ناتوانێ هیچ کردەوەیەک ئەنجام بدات.[226]

---

[223]ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٧١، ـ نهاية الإقدام ـ ل٥٧.

[224]ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٧٤.

[225]ـ المغني ـ جـ٨ ـ المخلوق ـ ل٢٩٠ ـ تحقيق: د. توفيق الطويل.

[226]ـ ئەوەی کە لەمەوە نزیکە تیۆرەکەی ئیبن حەزمە لە مەسەلەی "إستطاعة" تواناداا کە دەڵێت: (توانا بریتیە لە تەندروست بوونی ئەندامەکانی جەستە لەگەڵ ئاستی بەرزی بەرگریدا. ئەم دوو ڕووەش هەردووکیان پێش کردارە. هێزێکی تریش هەیە کە لەلایەن خودای گەورەوەیە. ئەمەیان لەگەڵ کرداردایە، جا بە کۆبوونەوەی هەردووکیان ئەو کاتە دەبێتە کردار، ئەو هێزەی کە لەلایەن خوداوە بۆ بەندە دێ چاکەی پێ دەکات و بە کۆی دەنگ پێی دەوترێت خودا تەوفیقی داوە و پاککراپگرتووە و پشتگیریکردووە، هەمان ئەو هێزەی کە لە خوداوە بۆ بەندەکەی دێ کردەوەی خراپی پێدەکات، بە کۆی دەنگ پێی

قازی عەبدولجەبار بەرپەرچی گروپی دژ بە موعتەزیلە دەداتەوە و دەڵێت: (ئەوان دەڵێن هەموو کردەوەی بەندەکان خودا دروستیکردووە، کەواتە ئەوە دەخوازێ کە خودا دروستکەری کردەوە ناشرین و خراپەکانیشە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ڕێکسازییەکانی خودا هەمووی خراپ بن، ئەمەش مانای ناتەواوی لە قەدیمی خودادا دەگەیەنێت، بۆچی؟ چونکە ڕێکسازییەکی خراپی داوەتە پاڵ، هەروەها لەو ڕووەشەوە کەخودا کردەوەکانی خۆی دەرهێناوە لەوەی کە کردەوەیەکی باش و بەسوود بن).[227]

لەڕاستیدا ئەوەی کە موعتەزیلە وتی سەبارەت بە "ئازادی و ویستی مرۆڤ" شتگەلێکی زۆرمان بۆ ڕووندەکاتەوە، لەوانە: ڕاست و دروستی ئەو ئەرکەی کەخودا خستوویەتیە سەر شانمان، حیکمەتی پاداشت و سزا، بەڵگەی ناردنی پێغەمبەران، نەفی ستەم و نادادی بەرامبەر بە خودای گەورە، ئەمەش بە نزیکی لەهەمان ئەو وتەی عەلی دەچێت (خودای لێ ڕازی بیت) کە پێشتر هێنامانەوە،[228] ئێستاش باس لەو کاروبارانە دەکەین.

## أ- ڕاستێتی ئەرك و پاداشت و سزا:

لەڕاستیدا باوەڕبوون بە جەبر ئەرکی خودا لەسەر بەندەکانی خالیێ دەکاتەوە لەبەرامبەر ئەو کردەوانەی کە پاداشت یان سزای لەسەر

---

دەوترێت سەرشۆڕی. ئەو هێزەی کە لەلایەن خوداوە دێت بۆ بەندە، پەرستش نییە و خراپەش نییە، پێی دەوترێت یارمەتی یان هێز. بڕوانە - الفصل في الملل و الأهواء و النحل - جـ٣ - ل٣٠.

[227] - المغني - جـ٨ - ل٢٨٩.

[228] - بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

وەردەگرێت، ئەو کاتە ئەم قسەیە لەبەهای ناوەڕۆکەکەی خاڵی دەکاتەوە و ئەرك و پاداشت و سزاش بە تاڵ دەکاتەوە، ئیتر چۆن ئەکرێت بەندەکانی خودا لەسەر کۆمەڵێك کردەوە لێپرسینەوەیان لەگەڵدا بکرێت کە بەزۆر پێیان ئەنجامدراوە. باوەڕبوون بە "جەبر" وا دەکات کە جیاوازی نەکرێت لەنێوان چاکەکار و خراپەکاردا و پاداشت و سزا و چاکە و خراپە لەیەك ئاستدا بەرزکاتەوە.[229]

ئەگەر مرۆڤ لە کردەوەکانیدا زۆر لێکراو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەرکێك خرابووە سەرشانی، ئەو کاتە ئەو ئەرکە لەگەڵیدا گونجاو نییە، خودای گەورە لە کتێبەکەیدا دەفەرموێت: ﴿رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦ﴾.[230] واتە: (خودایە شتێك مەدە بەسەرماندا کە توانای هەڵگرتنیمان نەبێ). ئەوەی کە لێرەدا نامۆیە ئەوەیە دەبینین ئەشعەرییەکان بە جۆرێك لەم نزایە حاڵی بوون کە خودا هەندێ جار ئەرك دەدات بەسەر خەڵکیدا کە لە ئاستی تواناداا نەبێت، بە پێی مەزهەبی ئەشعەری ئەرکێك کە لە ئاستی توانادا نەبێت دروستە،[231] قازی عەبدولجەبار ئەم تەئویلکردنە هەڵدەوەشێنێتەوە و دەڵێت: (لەوانەیە بوترێت ئەمە مانای دروستبوونی ئەرکێکە کە لە ئاستی توانادا نەبێت، ئەگەر نا بۆ ئەم ـ نزایە ـ هیچ مانایەك نامێنێتەوە. وەڵامی ئێمەش بۆ ئەمە ئەوەیە مەسەلەی شتێك مانای ئەوە ناگەیەنێت کە پێچەوانەکەی باش وایە کە بکرێت. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿قالَ رَبِ آحكُمْ بالحَقِ﴾ واتە: (خودایە حوکم بە حەق بکە) خۆ ناکرێت خودا حوکم بە غەیری حەق بکات، یان ئەوەی کە

---

[229] ـ القاضي عبدالجبار ـ شرح الأصول الخمسة ـ ل٢٢٣.

[230] ـ سورەتی ـ البقرة ـ ئایەتی ٢٨٦.

[231] ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل١٠٩.

ئیبراهیم (سەلامی خودای لێبێت) فەرمووی: ﴿وَلَا تُخْزِنِي يَوْمَ يُبْعَثُونَ﴾. واتە: (خودایە لە ڕۆژی زیندوو بوونەوەدا سەرشۆڕم مەکە). خۆ خودا پێغەمبەران سەر شۆڕ ناکات.. دەکرێت مەبەستی ئایەتەکە ئەوە بێت (خودایە لە ڕۆژی دواییدا سزایەك مەدە بەسەرماندا کە لە تواناماندا نەبێت، سۆز و ڕەحمەتت بەرامبەرمان هەبێ، هەتا بەرەو ئەو ئامانجە بڕۆین کە مایەی سەرفرازییە).[٢٣٢]

ئەشعەری بۆ ئەوەی مەزهەبەکەی سەر بخات هەوڵدەدات ئایەتێکی تر وەك بەڵگە بهێنێتەوە، بەڵگەکەشی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە خودا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يُكْشَفُ عَن سَاقٍ وَيُدْعَوْنَ إِلَى ٱلسُّجُودِ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٤٢﴾﴾.[٢٣٣] واتە: (ڕۆژێك دێت و پەردە لەسەر هەموو شتێك لادەدرێت و لاق دەردەکەوێت، خودا نەناسان بانگ دەکرێن بۆ سوژدە بردن، بەڵام ناتوانن). ئەشعەری دەڵێت: (ئەوە نییە خودای گەورە لە دوارۆژدا فەرمانیان پێ دەکات کڕنووش بەرن؟ لە هەواڵدا هاتووە کە مونافیق و دوو ڕووەکان لەڕۆژی دواییدا جەستەیان ڕەق دەبێت ناتوانن کڕنووش بەرن؟ ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کاتێك خودا فەرمانیان پێ دەکات مەرج نییە پێویست بێ لەسەری توانای جێبەجێکردنی فەرمانەکەیان پێ بدات).[٢٣٤]

قازی عەبدولجەبار وەڵامی ئەم تەئویلکردنە دەداتەوە و دەڵێ: (لەوانەیە لە تەفسیر و ڕاڤەی ئەم ئایەتەدا بوترێت چۆن دروستە لە ڕۆژی دواییدا داوای کڕنووش لە کەسێك بکرێت لەکاتێکدا نەتوانێت ئەنجامی بدا؟ وەڵاممان لەم

---

[٢٣٢]- القاضي عبد الجبار - تنزيه القرآن عن المطاعن - ل٥٥ - دار النهضة الحديثة - بيروت - د. ت.

[٢٣٣]- سورەتی - القلم - ئایەتی ٤٢.

[٢٣٤]- الإبانة في أصول الديانة - ل٥٢.

ڕووەوە ئەوەیە کە ئەم ئایەتە مانای دوعا و نزا ناگەیەنێت، بەڵکو مانای ئەوە دەگەیەنێت کە خودا سەر زەنشتیان دەکات بەوەی کە پێشتر کڕنووشیان نەبرد لەکاتێکدا تواناییان هەبوو ئەم کڕنووشە بەرن). [235]

لەم باسەدا ئەوەمان بۆ ڕوون بویەوە کە باوەڕبوون بە "جەبر" دژە لەگەڵ حیکمەتی ئەرك لە دونیادا، هەروەك چۆن دژە لەگەڵ پاداشت و سزادا لەڕۆژی دواییدا، لەم بارەوە "ثومامەی کوڕی ئەشرەش" دەڵێت: (کردەوەی بەندەکان لە سێ شت بەدەر نییە: یان ئەوەیە کردەوەکە هەمووی هی خودایە و مرۆڤ هیچ کارەیە تیایدا و هیچ پاداشت و سزا و پیاهەڵدان و سەر زەنشتێکیش نایگرێتەوە، یان کردەوەکان هاوبەشن و هەندێکیان مرۆڤەکە خۆی سەرپشکە ئەنجامی بدات، هەندێکیشیان لە دەستی قودرەتی خودایە، ئەو کاتە پیاهەڵدان و سەرزەنشت دەیانگرێتەوە. یان ئەوەیە کردەوەکە تایبەتە بە بەندەکان خۆیانەوە، ئەو کاتە پاداشت و سزا و پیاهەڵدان و سەرزەنشتیش دەیانگرێتەوە). [236]

## ب ـ حیکمەت لە ناردنی پێغەمبەران (سەلامی خودایان لێ بێت):

گەر هاتوو مرۆڤ زۆر لێکراوبوو لە هەموو ئەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدات، ئەو کاتە مرۆڤی بێباوەڕ ویستی خۆی تێدا نییە کە بێباوەڕە و مرۆڤی

---

[235] ـ تنزيه القرآن عن المطاعن ـ ل٤٢٢. زەمەخشەریش ـ کە یەکێکە لە موعتەزیلەکان ـ هاوڕایە لەگەڵ قازی عەبدولجەباردا لە تەئویلکردنەکەی پێشوودا.

[236] ـ إبن المرتضى ـ المنية و الأمل ـ ل٢٥، بڕوانە: زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل٩٦.

باوەڕداریش بەهەمان شێوە، گەر کارەکە بەوشێوە بوایە کەواتە ناردنی پێغەمبەران (سەلامی خودایان لێ بێت). هیچ حیکمەتێکی تێدا نییە.

گەر وەك جەبرییەکانمان وت، ئەو کاتە پێغەمبەران هیچ بەڵگەیەکیان نییە بەدەستەوە بۆ سەلماندنی مرۆڤی بێباوەڕ، چونکە ئەو کاتە مرۆڤە بێباوەڕەکە بە پێغەمبەرەکە دەڵێت، چۆن بانگهێشتمان دەکەیت بۆ ئیسلام، کێ تۆی ناردووە بۆ ناومان لە کاتێکدا بەبێ ویستی خۆمان بێباوەڕ بووین ئەوەی لێمان ویستووە کە بێباوەڕ بین، تەنانەت ناتوانین لە کوفر و بێباوەڕی جیاببینەوە، بۆچی بانگمان دەکەیت؟

جا گەر تۆش بۆ ئەوە بانگهێشتمان دەکەیت بۆ ئەو شتەی کە خودای گەورە لە سروشتی ئێمەدا دروستیکرووە، ئەوە هیچ سودێکی نییە، گەر بۆ شتێکیش بانگهێشتمان دەکەیت کە خودا لە سروشتی ئێمەدا دروستی نەکردووە، ئەوە توانای ئەو کارەمان نییە.

کەواتە ئەوەی کە جەبرییەکان دەیڵێن دەبێتە هۆی ئەوەی کە یەکسانی لەنێوان پێغەمبەران و ئیبلیسدا دروست بکات، چونکە پێغەمبەران خەڵکی بۆ شتێك بانگهێشت دەکەن کە پێچەوانەی ئەوەیە کە خودا داوای دەکات، هەروەك چۆن "ئیبلیس" مرۆڤەکان بۆ شتێك بانگهێشت دەکات کە خودای گەورە نایەوێت.[٢٣٧] بەمەش موعتەزیلە ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەوەی جەبرییەکان دەیڵێن تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ حیکمەت لە ناردنی پێغەمبەراندا.

---

[٢٣٧] ـ القاضي عبد الجبار ـ المغني ـ جـ ٨ ـ ل١٧٧.

## جـ ـ دوورخستنەوەی ستەم و کردەوە خراپەکان لە خودای گەورە:

ئەو بۆچوونەی کە دەڵێ خودای گەورە خوڵقێنەری تەواوی کردەوەکانی مرۆڤە و مرۆڤیش بۆ خۆی هیچ رۆڵێك نابینێت لە هەڵبژاردنی کردەوەکانیدا، دواتر خودا لەسەر ئەم کردەوانەی لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکات و سزاشی دەدات گەر هاتوو کردەوەی خراپی ئەنجام دابێت. هەر کەس ئەم بۆچوونەی هەبێت ئەوە زوڵم و ستەمی داوەتە پاڵ خودای گەورە، خودای گەورەش زۆر لەوە دوورە و لەوەش بالا دەسترە.[238]

گەر وتمان خودای گەورە خوڵقێنەری ئەم کردەوانەیە، دەی هەندێ لەو کردەوانە ستەم و نادادی و خراپەیە، ناکرێت ستەم و خراپە و کردەوەی نابەجێش بدرێتە پاڵ خودای گەورە، ناشکرێت خودای گەورە کردەوەیەك لە بەندەکانی داوا بکات و پێچەوانەی ئەو کردەوە مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، یان شتێکیان بەسەردا بسەپێنێت و دواتر لەسەر ئەو شتە سزایان بدات، بۆیە پێیان وایە کە مرۆڤ خۆی سەر پشکە و بکەری کردەوەی چاك و خراپ و باوەڕ و بێباوەڕییە، خودای گەورەش ئەو توانایەی تێدا فەراهەم هێناوە.[239]

خودای گەورە کردەوەی خراپ و ناقۆلا ئەنجام نادات، چونکە خودا زانایە بە کردەوەی خراپ و ناقۆلا، بێ نیازیشە پێی و پێویستیشی پێی نییە، جا گەر ئەمە حاڵەتی خودایەك بێت، ئەوە هەرگیز کردەوەی خراپ هەڵنابژێرێت بۆ هیچ کەسێك.[240]

---

[238] ـ بڕوانە، الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٦٦.

[239] ـ بڕوانە ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٦٨.

[240] ـ القاضي عبد الجبار ـ المغني ـ جـ ٦.

لێرەوە موعتەزیلە هەستا بە تەئویلکردنی هەموو ئەو ئایەتانەی کە ئاماژە بەوە دەکات مرۆڤ لە کردەوەکانیدا هیچ بە دەستە و هەموو ئەو کردەوانەی دەیکات لەچارەی نوسراوە و خودا خوڵقێنەری کردەوەکانیەتی، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَخَلَقَ كُلَّ شَيْءٍ﴾.[241] واتە: (خودا هەر خۆی هەموو شتێکی دروستکردووە). موعتەزیلە لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا دەڵێ: مەبەست پێی خەڵقی ئاسمانەکان و زەوی و تێکڕای وەدیهێنەرەکانە، بۆیە ناکرێت کە خودای گەورە ستەمکار و درۆزن بێت.[242]

هەروەها لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەشدا کە خودا دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ۝٩٦﴾.[243] واتە: (هەم خۆتان و هەم ئەو بتانەی دروستیان دەکەن لە دار و بەرد، خودای گەورە بەدیهێناون). دەڵێن: ئەمە هەواڵێکە لەبارەی ئیبراهیمەوە (سەلامی خودای لێبێت) کە بە گەلەکەی وتووە: ئێوە بۆ خۆتان لە تەختە بتێکتان داتاشیوە، دواتریش پەرستووتانە، خودا ئێوەش و تەختەکەشی دروستکردووە کە کردووتانن بە بت و دەیپەرستن. دروستکردنی بتەکەشی کردووە بە ئافراندنی خودا و داویانەتە پاڵ خودا.[244]

ئەگەر خودای گەورە زوڵم و ستەمی نەکردووە و کردەوەی ناقۆڵای وەدی نەهێناوە، ئایا ئەو خودایە توانای هەیە بەسەر ستەمدا؟ لەم بارەوە موعتەزیلە

---

[241]- سورەتی ـ الأنعام ـ ئایەتی ١٠١.

[242]- القاضي عبد الجبار ـ شرح الأصول الخمسة ـ ل٣٥٨.

[243]- سورەتی ـ الصافات ـ ئایەتی ٩٦.

[244]- شرح الأصول الخمسة ـ ل٣٨٢، هەمان تەفسیر بۆ ئەم ئایەتە پیرۆزە لە هەر دوو تەفسیری ئیبن کەثیر و تەفسیری " الجلالين" دا هەیە.

ڕای جیاوازیان هەیە، "نەظام" پێی وایە خودا توانای شەڕ و خراپەی نییە، چونکە ئەو کەسەی دارای عەدلە، بەوە وەسف ناکرێت کە توانای زوڵم و ستەمی هەیە.[٢٤٥]

قازی عەبدولجەبار وەڵامیان دەداتەوە و دەڵێ: (لەڕاستیدا خودای گەورە ئەوەی سەلماندووە کە بە تواناترە لەو هەڵسوکەوتەی کە دایناوە بۆ مرۆڤەکان و بە تواناتریشە لەوەشدا کە پێیان جێبەجێ بکات، جا خودای گەورە کە توانای ئەوەی هەیە ئێمە فێری ئەم کاروبارانە بکات، کەواتە خۆی باشتر زانیویەتی ئەم کارە باشە یان خراپ، هەروەك چۆن گەر فێری ئەوەمان بکات بۆ ئەوەی لەم کارانە شارەزابین، کەواتە زاتی خۆی زاناترە.[٢٤٦] وەڵام دەداتەوە: دەڵێین: بە چ عیلەتێك کۆتان کردنەوە؟ هیچ ڕێگە چارەیەکیان نییە بۆ وەڵامدانەوە. پاشان پێیان دەوترێت ئەگەر زاتێك توانای هەبێت بەسەر شتێکدا ئایا توانای بەسەر شتەکانی تریشدا نییە. خودای گەورە کە توانایی لە ئێمەدا دروستکردووە ئەوا دەشتوانێ ئەو توانایەی ئێمە بەو شێوەیە جێبەجێ بکات کە خۆی دەیەوێت. ئەگەر خودا توانای بەسەر کارێکدا هەبێت ئەو کاتە توانای بەسەر هەڵسوکەوتی ئێمەشدا هەیە. بەڵام پێویست نییە ئەمە بکات).[٢٤٧]

بەڵام زۆربەی موعتەزیلەکان بۆچوونیان وایە کە خودای گەورە توانای بەسەر کردەوەی بەندەکانیدا هەیە چ کردەوەی چاك چ کردەوەی خراپ، بەڵام خودا کردەوەی خراپ بە بەندەکانی ناکات، چونکە کارێکی نەشیاو و خراپە.[٢٤٨]

---

[٢٤٥]ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ١ـ ل٧٣.

[٢٤٦]ـ شرح الأصول الخمسة ـ ل٣٧٦.

[٢٤٧]ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٣٧٧.

[٢٤٨]ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٧٣.

ئەبو هوذەیل دەڵێ: خودا توانای هەیە بەسەر زوڵم و ستەمدا، بەڵام لەبەر حیکمەت و بەزەیی زاتی خۆی نایکات.[٢٤٩]

لەڕاستیدا موعتەزیلە ڕەخنەیان لە بۆچوونەکەی "نەظام" گرتووە، چونکە بۆچوونەکەی ئەوە دەگەیەنێت کە خودا بێ توانایە و هیچ دەسەڵاتێکی نییە، تەنانەت بەهۆی ئەو بۆچوونەیەوە موعتەزیلە بەصرییەکان تەکفیریان کردووە.[٢٥٠]

بەڵام لە بەرامبەردا "خەیاط" پاکانە دەکات بۆ بۆچوونەکەی "نەظام" و دەڵێ: (بۆیە ئەم قسەیەی وتووە، چونکە پێی وایە زوڵم و ستەم لە تەنێکدا دروست دەبێت کە کەموکورتی ڕووی تێ بکات و تەنێکی خراپ بێت، دەڵێن خودای گەورە توانای ستەمی هەیە کەواتە تەنێکی نەخۆشە، جا ئەوەی توانای بەسەر شتێکدا هەبێت کەواتە مەحاڵ نییە ئەو شتە لەوەوە ڕوو بدات).[٢٥١]

کەواتە "نەظام" پێی وایە گەر خودا دارای ستەمی هەبوو، ئەوا دەکرێت لە هەر حاڵەتێکدا بێت ستەم بکات، جا هەموو ئەو پێشەکیانە بوونە هۆی ئەوەی کە "نەظام" بگات بەم دەرئەنجامە و هاوەڵەکانی لۆمەی بکەن و بگرە گەیشتە ئاستی ئەوەی تەکفیریشیان کرد.

پاش ئەم خستنەڕووە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە موعتەزیلە بەو بەگژداچوونەی کە لەبەرامبەر جەبرییەکاندا ئەنجامیاندا و ئازادی و ویستی مرۆڤایەتیان سەرخست، زۆر شتیان بۆ ئێمە تەفسیر کردووە، ئەوەتا تەفسیری ئەوەیان کردووە کە حیکمەت (چییە لە ڕاستێتی ئەرك و پاداشت و سزا،

---

[٢٤٩] ـ الأشعري ـ مقالات الإسلاميين ـ جـ٢ ـ ل٦٠، یان بڕوانە: زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل٩٨.

[٢٥٠] ـ زهدي جار الله، ل٩٩.

[٢٥١] ـ الخياط ـ الإنتصار ـ ل٢٦.

هەروەها تەفسیری ناردنی پێغەمبەرانیان کردووە، نەفی و نەرێی هەر ستەمێکیان بۆ خودا کردووە، لەبەرامبەردا ئازادیان بەرامبەر بە بەرپرسیاریەتی داناوە، بەڵام ئایا مرۆڤ پێش ناردنی پێغەمبەران یان پێش ناسینی کتێبە ئاسمانیەکان داوای لێکراوە خودای گەورە بناسێت، یان کردەوەی چاکە ئەنجام بدات و دوورکەوێتەوە لە کردەوەی خراپ، ئایا لەم حاڵەدا بەرپرسە لەسەر کردەوەکانی، ئایا لەسەر کردەوە چاکەکانی ستایش دەکرێت و لەسەر کردەوە خراپەکانیش سەر زەنشت دەکرێت؟؟ دەبینین موعتەزیلە لەم مەسەلەیەدا بۆچوونێکی تایبەتی هەیە کە خۆی لەم ڕێسایەدا دەبینێتەوە "بیرۆکە پێش بیستنە" یان "ئەقڵ پێش نەقڵە"، بۆیە لەمەو دوا بەشێوەیەکی درێژ و تەواو باس لەم ڕێسایە دەکەین.

## • بیرکردنەوە پێش بیستنە:

موعتەزیلە لەسەر ئەوە ڕێککەوتون کە پێویستە مرۆڤ خودای گەورە بناسێت و هەر کردەوەیەکیش باشە ئەنجامی بدات و دووریش کەوێتەوە لە هەر کردەوەیەك کە خراپ و ناقۆڵایە، ڕێگەی ناسینی خودا و جیاکردنەوەی باش و خراپیش لە یەکدی دەبێت لەڕێگەی تێڕوانینی ئەقڵیەوە بێت، ئەم ناسینەش ـ لای موعتەزیلە ـ لەسەر ناردنی پێغەمبەران و ئەرکەکانی خودای گەورە نەوەستاوە، چونکە ئەقڵ توانای ناسینی خودای هەیە تەنانەت پێش هاتنی شەریعەتی خوداش، بەڵام سەبارەت بە ناردنی پێغەمبەران ئەوە وەك سۆز و بەزەییەك وایە لەلایەن پەروەردگارەوە تا مرۆڤەکانی پێ تاقی بکاتەوە و ببێتە پەند و وانە بۆیان.

ئەبو هوذەیل پێی وایە پێویستە مرۆڤ لەڕێگەی بەڵگەوە خودای گەورە بناسێت بەبێ هیچ جۆرە بیرکردنەوەیەك، گەر هاتوو لەم ناسینەشدا کەمتەرخەم بوو، ئەوە سزا دەدرێت، هەروەها پێویستە لەسەریشی کە بزانێت چ کردەوەیەك چاکەیە و چیش خراپەیە.[252]

هەرچی "نەظام"میشە ئەوا وتویەتی پێویستە مرۆڤ لەڕێگەی بەڵگەوە خودای گەورە بناسێت، بەڵام ئەوەی نەوتووە کە مرۆڤ بە بێ بیرکردنەوە و تێڕامان بۆی هەیە خودای گەورە بناسێت، بەڵکو وتویەتی دەبێت ناسینی خودای گەورە لە ڕێگەی بیرکردنەوە و بەڵگەهێنانەوە بێت، ئەو کەسەشی دەیەوێت بە دوای بەڵگەدا بگەڕێ پێویستە کەسێکی ئاقڵ و ژیر بێت و توانای بیرکردنەوەی هەبێت.

بەڵام ثومامەی کوڕی ئەشرەش دەڵێ: هەندێ لە کافر و بێباوەڕ هەیە کە خودا ناناسێت، ئەوە عوزری هەیە چونکە نەیتوانیووە لەڕێگەی ئەقڵیەوە هەوڵی ناسینی خودا بدات، جا ئەوانە وەك تێکڕای ئاژەڵەکانی تر بۆ عیبرەت و بەکارهێنان دروستکراون.[253]

بەڵام ئەی چۆن ئەقڵ دەگات بە ناسینی خودای گەورە؟

قازی عەبدولجەبار لەڕێگەی ئەقڵەوە ڕێگای ناسینی خودامان بۆ ڕوون دەکاتەوە، سەرەتا ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە خودا لەڕێگەی زۆرکردنەوە ناناسرێت، هاوکات لەڕێگەی بینینیشەوە ناناسرێت، بۆیە قازی عەبدولجەبار لەم بارەوە دەڵێ: لەڕاستیدا ئەگەر ناسینی خودا لە ڕێگەی زۆرەوە گرنگ بووایە، کەواتە ئەو کەسەی نایناسێت عوزری هەیە، چونکە ئەوە پەیوەستە بەخودای

---

[252]ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٧٢.

[253]ـ هەمان سەرچاوە ـ ل٧٨.

گەورە خۆیەوە، ئەگەر بڵێین خودا بەزۆر خۆی بە خەڵکی دەناسێنێت، ئەو کاتە کافر و بێباوەڕەکان عوزریان هەیە کە خودایان نەناسیوە، چونکە ئەو کاتە ناسینی خودا لەڕێگەی ئەقڵیانەوە نەبووە، بەڵکو خودا زۆری بۆ هێناوون بۆ ئەوەی بیناسن، خۆ گەر ناسینی خودا گرنگ و پێویست بوایە، دەبوو لەنێو کەسە ئاقڵەکاندا هیچ جیاوازیەکیان تێدا نەبوایە، هەروەك چۆن لە شتە گرنگەکانی تریشدا کەس ناتوانێ نکۆڵیان لێ بکات وەك تاریکی شەو و ڕووناکی ڕۆژ، کەواتە لەنێو خەڵکیدا لەسەر ناسینی خودای گەورە جیاوازی هەیە، کۆمەڵێك ئیسپاتی خودای گەورە دەکەن و کۆمەڵێکی تر نکۆڵی خودا دەکەن.[254]

هەروەها لەڕێگەی بینینیشەوە خودای گەورە ناناسرێتەوە، چونکە بینینی خودا واتە ناسینی خودا لەڕێگەی هەستەوەرەکانەوە، دەی ئەمەش مەحاڵە بۆ خودای گەورە.[255]

پاشان قازی عەبدولجەبار باس لەجۆرەکانی بەڵگە دەکات و دەڵێ: بەڵگەکان چوار جۆرن، لەوانە: بەڵگەی ئەقڵی، قورئان، سوننەت، کۆڕای زانایان. ناسینی خودای گەورەش تەنها بە بەڵگەی ئەقڵی دەناسرێتەوە، لەبەر ئەوەی بەڵگەکانی دیکە هەموو لقێکن لەناسینی خودای گەورە، لەوەدا کە خودا تاقانەیە و دادپەروەرە، ئەگەر یەکێك لەمانە بکەینە بەڵگە بۆ ناسینی خودای گەورە لەکاتێکدا ئەمان بۆ خۆیان لقێکن لە یەکتایی خودای گەورە، ئەوە

---

[254]- شرح الأصول الخمسة ـ ل٦٢.

[255]- هەمان سەرچاوە ـ ل٦٣.

بەڵگەمان بە لقەکە هێناوەتەوە لەبری سەرەکیەکە بۆ ناسینی خودای گەورە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا دروست نییە.[256]

بەڵام لەڕاستیدا قازی عەبدولجەبار مەبەستی لەم قسەیەدا ئەوە نەبوو کە "أدلة سمعية" بە کەم بگرێت و پشتگوێیان بخات، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەبوو کە ناسینی خودا لەڕێگەی ئەقڵەوە سەرەکیە و "أدلة سمعية"کانیش هەموو دەچنەوە سەر بەڵگەی ئەقڵی، بۆیە کاتێك ئێمە دەتوانین قورئان بکەین بە بەڵگە کاتێك بسەلمێنرێ کە ئەم کەلامە دادپەروەر و دانایە و درۆ ناکات و دروستیش نییە درۆی تێدا بێ، دەی هەموو ئەمانە لەڕێگەی ئەقڵەوە پەییان پێ دەبرێت و دەناسرێنەوە، بەهەمان شێوە سوننەت و کۆڕای زانایانیش هەر بەو شێوەیە. قازی عەبدولجەبار ئەو ڕێگەیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە ئەقڵ دەیگرێتە بەر بۆ ناسینی خودای گەورە، دەڵێ گەر چار نەبێ بە ئەقڵ لێکۆڵینەوە لە ناسینی خودای گەورە بکەین، ئەوە پێویستە سەیری ئەو ڕووداوانە بکەین کە ڕوو دەدات لە تەنەکان و غەیری تەنەکاندا، جا کاتێك بینی گۆڕانیان بەسەردا دێت کەواتە "حادیثە" تازەیە و قەدیم نییە، ئەوجا سەیری ئەوە دەکات تا بزانێ هۆکاری ڕوودانەکەی چی یە، ئەو کاتە بۆی دەردەکەوێت کە وەدیهێنەرێکی هەیە، ئەمەش لە دەرئەنجامی ئەوەی کە ئێمە دەیبینین ئەگەر چی ئێمە بۆ خۆمان خودای گەورە نابینین، ئەمەش یەکەم ڕێگەی ناسینی خودای گەورەیە لای ئەبو هوذەیلی عەللاف.[257]

(پاشان سەیر دەکات کە وەدیهێنەرەکە وەك ئەو شتە نییە کە حادیسە، وە دروستیش نییە وەك ئەو وەهابێت، کە ئەوەش خودای گەورەیە، ئەو کاتە

---

[256] ـ هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

[257] ـ هەمان سەرچاوە ـ ل١٥.

دەگاتە ئەوەی کە ئەم وەدیهێنەرە جیاوازە لەو شتەی کە ڕوویداوە، لای ئەبو عەلی ئەمە یەکەم ناسینی خودایە کە لەڕێگەی بەڵگە هێنانەوە و تێڕوانینی ئەقڵییەوە خودای گەورە دەناسێت).[258]

(پاشان سەیری دروستی کردارەکە دەکات، ئەو کاتە بۆی دەردەکەوێت کە خودا بە توانایە، پاشان سەیری دروستی کردارەکە دەکاتەوە لەڕووی ڕێکسازییەوە، بۆی دەردەکەوێت کە خودا زانایە، پاشان سەیری بە توانایی و زانایی خودا دەکات، بۆی دەردەکەوێت کە خودا زیندووە لە خودی خۆیدا، پاشان سەیری ئەوە دەکات دەبێت خودا زیندوو بێت و دووربێت لەهەموو کەموکوڕییەك، ئەو کاتە بۆی دەردەکەوێت کە خودا بیسەر و بەتوانایە و پەی بەهەموو شتەکان دەبات، پاشان سەیری زانایی و توانایی خودا دەکات، بۆی دەردەکەوێت کە خودا بوونی هەیە، پاشان سەیری هەموو ڕووداوەکان دەکات و بۆی دەردەکەوێت کە هەموو سەرچاوەکان دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا، بەڵام خودا سەرچاوەی نییە تا بگەڕێتەوە بۆ لای، ئەو کاتە ئەوەی بۆ ئاشکرا دەبێت کە خودا بۆ خۆی قەدیمە و هیچ قەدیمێکی تر جگە لە خودا بوونی نییە).[259]

(پاشان سەیری ئەوە دەکات کە خودا قەدیمە، ئەوەی بۆ دەردەکەوێت کە خودا تەن نییە و شێوازیشی نییە، کەواتە ئەوەی بۆ تەن یان شێوازێك دروستە بۆ خودا دروست نییە، وەك: لەپاڵیدایە یان لەشوێنێکدا جێی بووەتەوە، سەرکەوتن یان دابەزین لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، دروست نییە خودا زۆری یان کەمی بۆ بڕیار بدرێت).[260]

---

[258]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

[259]- هەمان سەرچاوە.

[260]- هەمان سەرچاوە.

(پاشان سەیری ئەوە دەكات كە دروست نییە خودا زۆری یان كەمی بۆ بڕیار بدرێت، دەگاتە ئەوەی كە خودا دەوڵەمەندە و نیازی بە هیچ كەس نییە، چونكە پێویستی بۆ كەسێك دروست دەبێت كە كەم و زۆری ڕووی تێ بكات).[261]

(پاشان سەیری ئەوە دەكات كە دروست نییە ئەوەی لە تەنەكاندا ڕوو دەدات لەویشدا ڕوو بدات، وەك لە پاڵی یان لە بەرامبەریدا یان بەریەككەوتن یان چوونە ناو شتێكەوە، ئەو كاتە ئەوەی بۆ ڕوون دەبێتەوە كە خودا بە چاوی سەر نابینرێ و بە هیچ یەكێك لە هەستەوەرەكانیش پەی پێ نابردرێ).[262]

(پاشان سەیری ئەوە دەكات گەر جگە لە خودا خودایەكی دیكە هەبوایە، ئەوە دەچوون بە گژ یەكدا و پێچەوانەی یەكتر دەجولانەوە، دەی ئەمەش دەبێتە هۆی لاوازی بۆ خودا و دروست نییە، بەلام بۆ تەنەكان دروستە، ئەو كاتە بۆی دەردەكەوێت كە خودا تاك و تەنهایە و هیچ شتێك هاوبەش نییە لە قەدیمی و خوداداریدا، ئەو كاتە دەگاتە ئەوەی كە خودا كەماڵ و تاك و تەنهایە).[263]

(پاشان سەیری ئەوە دەكات كە خودا زانایە بەوەی كە شتی خراپ خراپییەكەی لە كوێدایە و پێویستی پێی نییە، زاناشە بەوەی كە بێ نیازە لە هەر شتێك، ئەو كاتە بۆی دەردەكەوێت كە خودا عەدل و دانایە، كردەوەی خراپ ئەنجام نادات، هەركارێك پێویست بێت كەمتەرخەمی تێدا ناكات،

---

[261]- هەمان سەرچاوە.

[262]- هەمان سەرچاوە.

[263]- هەمان سەرچاوە.

فەرمانیش ناکات بەکردەوەی خراپ و ڕێگریش لە کردەوەی چاکە ناکات، تەواوی کردەوەکانیشی چاکن).[264]

بەم شێوەیە ئەقڵ لە ڕێگەی تێڕوانین و بەڵگە هێنانەوە خودای گەورە دەناسێت و دەگات بەوەی کە خودا تاك و تەنها و تاقانەیە، دەگات بەوەی کە خودا زانایە، بە توانایە، زیندووە، دانایە، قەدیمە، هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو خودایە، نە لە زاتیا، نە لە سیفاتیدا، نە لەکرداریدا، بۆ خۆی تەنیایە و لەهەموو شتێك بێ نیازە و هەموو شتێکیش نیازمەندە بەو.

ئەگەر ئەمە ئەو ڕێگا ئەقڵیە بوو بێت بۆ ناسینی خودای گەورە لای موعتەزیلەکان، ئەی ئەقڵ چۆن دەتوانێت پێش ئەوەی ئەرکی پێ بدرێت چاك و خراپ لە یەکتری جیا بکاتەوە؟

دەبینین کە موعتەزیلە وتویانە ئەقڵ خاوەنی دۆزینەوەی چاك و خراپە، چاك و خراپیش دەبێت لەڕێگەی ئەقڵەوە بیانناسین، چونکە هەردووکیان لەناو کردەوەکەدا بوونیان هەیە، کردەوەی چاکە لە خودی خۆیدا چاکە و کردەوەی خراپیش لە خودی خۆیدا خراپە لەهەموو کات و ساتێکدا، هیچ کەس لاری لەمەدا نییە.[265]

پاشان یارمەتیدانی هەژار و نەدار بە بەردەوامی و ئەنجامدانی کاری باش و سەردانیکردنی نەخۆش و ڕاستگۆیی... هەموو ئەمانە هاوڕان لەسەر ئەوەی کە کردەوەی چاکن، تەنانەت پێش هاتنی شەریعەتی خوداش، هەروەها درۆ و ساختەکاری و دزیش.. کۆمەڵە کردەوەیەکن کە هەمووان هاوڕان لەسەر ئەوەی

---

[264]- هەمان سەرچاوە.

[265]- بڕوانە - الشهرستاني - الملل و النحل - جـ١، الإيجي - المواقف - جـ٨، زهدي جار الله - المعتزلة - ل١٠٨.

که خراپن، بۆیه ئەو بۆچوونەی که ئەقڵ هەموو چاکه و خراپەیەك دەزانێت هەمیشه جێگەی ڕەخنەلێگرتن بووه ـ به تایبەت لای ئەشعەرییەکان ـ چونکه تەواوی ئەرکەکان ـ لای ئەشعەرییەکان ـ هەموویان له "بیستنەکانن" ئەقڵیش هیچ شتێك پێویست ناکات و بڵێ ئەم کردەوه چاکه یان خراپ، لەبەر ئەوەی کردەوەکان به خراپ یان به چاك نازانرێ هەتا شەرع چاکی یان خراپیان دیاری نەکات، هەروەك چۆن کردەوەی چاك و خراپ خودی نییه، بەڵکو دوو سیفەتی دەرەوەی خۆیەتی بۆیان هەیه گۆڕانیان بەسەردابێت، بۆیه جاری وابووه شەریعەتێك هاتووه شتێکی به چاك داناوه، کەچی شەریعەتێکی تر هاتووه هەمان ئەو شته چاکەی هەڵوەشاندووەتەوه و به خراپی لەقەڵەمداوه، جاری واش هەبووه کردەوەیەك لەکاتێکدا چاکبووه و له کاتێکی تردا خراپبووه، بۆ نموونه: کوشتن، گەر به ناڕەوا کەسێك کەسێکی تر بکوژێت ئەوه کردەوەیەکی خراپه، بەڵام گەر کەسێك به ڕەوا خۆی له بری تاوانێکدا که ئەنجامیداوه بکوژرێتەوه، ئەوه کردەوەیەکی چاکه. ئەگەر خراپی کوشتن خودی بوایه، ئەو کاته له هیچ حاڵەتێکی تردا کوشتن کردەوەیەکی چاك نەدەبوو.[٢٦٦]

کاتێك ئەم ڕەخنەی کۆتاییه ـ سەبارەت به خودی چاکی و خراپی کردەوەکان ـ له جێی خۆیدا بوو، دەبینین موعتەزیلەکان وازیان لەوتەی خودی چاکی و خراپی کردەوەکان هێنا، به تایبەت لای ـ موعتەزیلەکانی دوایین ـ بۆیه هاتن وتیان کردەوەی چاك یان خراپ ئەوەیه که ئەقڵ دیاری بکات ئەو کردەوه چاکه یان خراپ، گەر هاتوو به ناڕەوا کوشتن ڕوویدا، ئەوه کردەوەیەکی خراپه، بەڵام گەر هاتوو کوشتنەکه لەبری تۆڵەی کردەوەیەکدا ڕوویدا، ئەوه

---

[٢٦٦] ـ بڕوانه ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل١١٤، محمد الزرکان ـ فخر الدین الرازي ـ ل٥١١ ـ زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل١٠٩.

کردەوەیەکی چاکە،[267] قازی عەبدولجەبار دەڵێ:(کردەوەی ناشرین و خراپ لە خودی خۆیدا خراپ نییە، تا ئەو کاتەی ئەم کردەوە لە شوێنێکدا دەرکەوێت کە کردەوەیەکی خراپە، چونکە ئێمە ناتوانین سیفەتەکانی ئەو کردەوەی کە ڕووینەداوە بزانین تا کردەوەکە ڕوو نەدات، کەواتە کاتێك کردەوەکە بە خراپە دادەنرێت کە ئەنجامدرا بێت، لەبەر ئەوە گەر ڕووداوێکمان بەم شێوەیە بینی دەڵێین خراپە با نەشزانین هۆکاری تاوانەکە (چییە، گەر چاکی و باشی کردەوەکەمان بۆ دەرنەکەوت ناتوانین ئەو کردەوە بە خراپ هەژمار بکەین).[268]

قازی عەبدولجەبار باس دەکات و دەڵێ زیان کە ـ کردارێکی خراپە ـ لە هەندێ ڕووەوە دەبێتە کرداری چاك، کاتێك کە دەبێتە هۆی لابردنی خراپەیەك.. بۆ نموونە ئێش و ئازار خۆی بۆ خۆی زیانە، بەڵام جاری وا هەیە چاکەیە بۆ ئەوەی گەورەترین زیانت لە کۆڵکاتەوە، یان جاری وا هەیە بۆ ڕزگارکردنی گیانی مرۆڤێك وا چاکە بەشێك لە ئەندامی جەستەی ئەو کەسە لێ بکەیتەوە، یان کاتێك کە لە دڕندەیەك دەترسی وا چاکە ڕاکەیت و هەڵبێیت بەناو دڕك و داڵدا، هەموو ئەمانە لای کەسە ئاقڵ و ژیرەکان بە چاکە دەزانرێت ئەگەر چی لەو پێناوەدا توشی زەرەر و زیانیش ببیتەوە.[269]

بەهەر حاڵ لای موعتەزیلەکان مرۆڤ ـ پێش هاتنی شەریعەت و ناردنی پێغەمبەران ـ لەسەری پێویست بووە کە واز لە کردەوەی خراپ بهێنێت و کردەوەی چاك ئەنجام بدات، چونکە ئەقڵ خۆی کردەوەی چاك و خراپ دیاری

---

[267] ـ بڕوانە ـ محمد الزركان ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٥١٢.

[268] ـ بڕوانە ـ القاضي عبد الجبار ـ المحيط بالتكليف ـ تحقيق: محمد السيد عزمي ـ ل١٥٣ ـ الدار المصرية للتأليف و الترجمة.

[269] ـ بڕوانە ـ المغني ـ جـ١٣ ـ اللطف ـ لە ل٣١٥ تا ٣٣٦ ـ تحقيق: د. أبو العلا عفيفي.

دەكات، جا ئایا كردەوە چاك و خراپەكە خودی بێت یان بەو شێوەیە بێت تا كردەوەكە ڕوو نەدات نازانرێت چاكی و خراپی كامەیە..بەڵام سەبارەت بە ئەركەكان ـ لای موعتەزیلە ـ ئەوە سۆز و میهرێكە بۆ بەندەكانی، خودای گەورە لە ڕێی پێغەمبەرەكانەوە ناردوویەتی بۆ بەندەكانی تاوەكو تاقیان بكاتەوە.

ئەگەر چی موعتەزیلە لەسەر كردەوە ڕاستەوخۆكان هاوڕابوو كە مرۆڤ تیایدا سەر پشكە لە كردنی ئەو كردەوانە یان نەكردنیدا، بەڵام لەڕاستیدا سەبارەت بە دەرئەنجامی ئەو كردەوانەی كە لەكردەوە ڕاستەوخۆكەوە پەیدا دەبێت ڕایان جیاوازە، بۆیە وا باشە ئێستا دەرەنجامی ئەو كردەوانە بخەینەڕوو.

## • دەرئەنجامی كردەوەكان:

موعتەزیلەكان لە پێناسەكردنی دەرئەنجامی كردەوەكاندا ڕای جیاوازیان هەیە، لێرەدا هەندێ لەو پێناسانە دێنینەوە بۆ ئەوەی مانایەكی ڕوون و دیاریكراومان دەستكەوێت سەبارەت بە دەرئەنجامی كردەوەكان، تا لەو كردەوانەی جیاكەینەوە كە ڕاستەوخۆ مرۆڤ خۆی ئەنجامی دەدات:

١ـ هەموو كردەوەیەكە كە ئامادەسازی بۆ دروستبوونی دەكرێت، بە بێ ئەوەی مەبەست یان ویستێك هەبێت لە ئەنجامدانیدا، یان هەموو كردەوەیەكە كە مرۆڤ ئەنجامی بدات بە مەبەست و هەموو بەشێكیش لەو كردەوەدا ویست و مەبەستی تۆی تێدا بووە، بۆیە ئەمە لە دەرەوەی دەرئەنجامی كردەوەكە هەژمار دەكرێ.

٢ـ هەموو كردەوەیەك هۆكارەكەی هاتبێتە دی و لەوە دەرچووبێت كە بتوانم ئەو واز لەو كردەوە بێنم و هەندێ جار خۆم ئەو كردەوە دەكەم، هەندێ جاریش لە كەسانی ترەوە.

٣ـ بريتيه له كردەوەی سێهەم كه له پاش مەبەستەوە دێت، وەك ئەو ئازارەی كه له پاش لێدانەوە پەیدا دەبێت، یان وەك ئەو ڕۆشتنە وایە كه لەپاش پاڵ پێوە نانێكەوە دروست دەبێت.[٢٧٠]

لەكۆی ئەم پێناسانە دەتوانین بەم شێوەیە دەرئەنجامی كردەوەكان پێناسە بكەین كه: (بریتی یه لەو كردەوانەی كه له ئەنجامی ئەو كردەوانەوە پەیدا دەبن كه ڕاستەوخۆ كەسێك پێی هەستاوە، ئەم كردەوانەش هیچ ویستێكی مرۆڤی تێدا نییە).

به دەستەواژەیەكی تر بریتی یه لەدەرئەنجامی كردەوە كەڵەكەبووەكانی مرۆڤ، بۆ ئەوەی زیاتر ڕوونیكەینەوە ئەم نموونە دەهێنینەوە، ئەگەر مرۆڤێك ویستی به بەردێك له كەسێك بدات، ئەو كاتە بەردەكە هەڵدەگرێت و به ئاڕاستەی ئەو كەسەی كه مەبەستێتی دەیهاوێژێ، هەڵدانی ئەو بەردەی كه بەدەست مرۆڤەكەوەیە بریتی یه له سەرەتای كردەوەی ئەو كەسەی كه هەستاوە بەوەشاندنی بەردەكە، بەڵام وەشاندنی بەردەكە ڕووە و كەسەكەی تر و لێدانی یان برینداربوونی یان كوشتنی، هەموو ئەمانە له ئەنجامی ئەو كردەوە ڕاستەوخۆوە پەیدابووە، بۆیە هەموو ئەو كردەوانەی له دەرئەنجامی كردەوەكەی سەرەتاوە پەیدابووە پێیان دەوترێت ئەنجامی كردەوەكە.

قازی عەبدولجەبار دەڵێ: (دەرئەنجامی كردەوەكان تەسپیت بووە له كردەوەكانی دڵ و كردەوەی ئەندامەكاندا، سەبارەت به كردەوەكانی دڵ هیچ شتێكیان لێ پەیدا نابێ كه ببێتە هۆكار جگە له زانین نەبێ، بەڵام كردەوەی ئەندامەكان دەرئەنجامی كردەوەكە تیایدا پەیدا دەبێ، وەك: ئازار، ئامادەسازی له شتێكدا، دەنگەكان، بوونی ئەو شتە، پشت بەستن به شتێك،

---

[٢٧٠]ـ بڕوانە ـ الأشعري ـ مقالات الإسلاميين ـ ل٨٣.

بۆیە هەموو کردەوەی ئەندامەکان لەم پێنچ شتە بەدەر نییە، هەموو ئەمانە دەرئەنجامی کردەوەیان بۆ دروست دەبێت، ئەگەر چی هەندێکیان وەك چۆن بوون بە دەرئەنجامی کردەوەکان بە هەمان شێوە بوون بەو کردەوە سەرەتاییەی کە مرۆڤەکە پێی هەڵساوە، هەندێکیشیان هەر دەرئەنجامی کردەوەی مرۆڤەکە خۆیەتی).[٢٧١]

لەڕاستیدا موعتەزیلەکان ڕای جیاوازیان هەیە سەبارەت بە هەر یەکێك لەو کردەوانەی کە لەدوای کردەوە سەرەتاکەوە دێت، ئاخۆ کام لەو کردەوانە دەرئەنجامی کردەوەکانە و کامیان ئەو نییە، هەروەها ڕای جیاوازیان هەیە سەبارەت بە دانە پاڵی دەرئەنجامی کردەوەکە بۆ لای بکەری کردەوەکە، ثومامەی کوڕی ئەشرەس پێی وایە دەرئەنجامی کردەوەکە بکەریان نییە، شەهرستانی دەڵێ: ثومامەی کوڕی ئەشرەس نەیتوانیوە دەرئەنجامەکەی بداتە پاڵ ئەو کردەوەی کە هۆکاری ئەو بکەرەیە، چونکە گەر ئەمەی بکردایە ئەو کاتە پێویست دەبوو لەسەری کە کردەوەکە بداتە پاڵ کەسێك کە مردووە، یان وەك ئەوەی کەسێك تیرێك دەهاوێژێ و پاش وەشاندنی تیرەکە کەسەکە دەمرێت، پاشان بەهۆی وەشاندنی تیرەکەوە کەسێك دەکوژرێت ـ کە ئەمە دەرئەنجامی وەشاندنی تیرەکەیە ـ لەپاش مردنەکەوە. نەشیتوانیووە کردارەکە بداتە پاڵ خودای گەورە، چونکە کوشتن کردەوەیەکی خراپە و ئەمەش بۆ خودا مەحاڵە، بۆیە وتویەتی: دەرئەنجامی کردەوەکان بکەریان نییە.[٢٧٢]

لای ئەبو هوذیل هەر کردارێك لای مرۆڤەوە پەیدا ببێ ئەوە دەرئەنجامی کردەوەیە و کردەوەی خۆیەتی، جگە لە ڕەنگ و تام و بۆن، چونکە هەر شتێك

---

[٢٧١]ـ المحیط بالتکلیف ـ ل٢٨٩.

[٢٧٢]ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٨٨.

نەزانی چۆن ڕوویداوە ئەوە کردەوەی خودایە، هەر بۆیە خودا دەرك پێکردن و زانینی لە بیستن و فێربووندا دروستکردووە، چونکە ئەمە کردەوەی مرۆڤەکان نییە[٢٧٣].

سەبارەت بە پاڵدانی کردەوەیەك بۆ لای مردوویەك - وەك ئەوەی لەپێشەوە ڕوونیکردەوە - دەڵێ: کوشتنەکە بریتی یە لە کردەوەی تیر هاوێژەکە کە مردووە، چونکە ناکرێت ئەوە کردەوەی خودای گەورە بێت، یان کردەوەی خودی تیرەکە بێت، هەروەها ناکرێت کردەوەیەکیش بێت بە بێ بکەر[٢٧٤].

لای نەظامیش، هەر شتێك لە سنووری توانای مرۆڤ تێپەڕیکرد، ئەوە دەبێت بە کردەوەی خودای گەورە، چونکە خودا ئەو شتەی تێدا خەلق کردووە، خودا سروشتی بەردی وا دروستکردووە گەر کەسێك بیهاوێژێت دەڕوات، هاوێشتنەکەشی بە پێی هێزی پاڵ پێوەنەرەکەیەتی، کاتێ بەردەکە گەیشتە ئەو شوێنەی خۆی، ئیتر لە شوێنی خۆیدا دەوەستێت و لەوە زیاتر ناڕوات.[٢٧٥]

بەم ئەندازەیە کۆتایی بەم مەسەلەیە دێنین و دەچینە سەر باسی مەسەلەیەکی تر کە پەیوەستدارە بە عەدلی خودای گەورە لای موعتەزیلەکان، ئەویش مەسەلەی " الصلاح و الأصلح"ە.

## • (چاك و چاکتر): الصلاح و الأصلح:

بینیمان کە موعتەزیلە وتیان خودا ستەم ناکات و کردەوەی خراپیش ناکات، هەندێکیان وتویانە خودای گەورە توانای ستەمکردنی نییە[٢٧٦]، لەگەڵ ئەم

---

[٢٧٣]- هەمان سەرچاوە - ل٧١.

[٢٧٤]- بڕوانە - الخیاط - الإنتصار - ل٧٧، یان - زهدي جار الله - ل٩٥.

[٢٧٥]- الملل و النحل - جـ١ - ل٧٤.

[٢٧٦]- بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

بۆچوونەدا بۆچوونێکی تریشیان ڕێکخستووە، ئەویش ئەوەیە کە خودا لە دنیادا هیچ کردەوەیەك لەگەڵ بەندەکانیدا ناکات جگە لەکردەوەی چاکە نەبێت، ناوترێت کە خودای گەورە توانای بەسەر شتێکدا هەیە کە چاکتر بێت لەمەی کە لەگەڵ بەندەکانیدا کردوویەتی...[٢٧٧].

ئەبو عەلی جەبائی و ئەبو هاشمی کوڕی پێکەوە یەککڕایان هەبووە و وتویانە: خودای گەورە هیچ شتێکی هەڵنەگرتووە بەرامبەر بە بەندەکانی کە ئەنجامی نەدابێ کە زانیبێتی ئەگەر ئەم کردەوەیان لەگەڵدا بکات ئەوە باشتر گوێڕایەڵ دەبن و تەوبە دەکەن، بۆیە خودای گەورە هەر دوو کردەوەکە "چاك و چاکتر"ی لەگەڵدا ئەنجامداون، چونکە خودای گەورە بە توانا و بە دەسەڵاتە، زانایە، بەخشندەیە، دانایە، هیچ زیانێکی پێ ناگات گەر ببەخشێت، وە هیچ لە گەنجینەکەشی کەم ناکات ئەگەر ببەخشێت، هەڵگرتنیش هیچ لە موڵك و سامانی زیاد ناکات، دەبێت ئەوە بزانین کە ئەصلح "چاکتر" بە چێژ تر نییە، بەڵکو "ئەصلەح"ئەوەیە کە لە کۆتاییدا دەمێنێتەوە و لە دونیاشدا ڕاستر و دروسترە، ئەگەر چی ئەمەیان ئازار بەخشە و دڵ پێی ناخۆشە، وەك نەخۆشی و خواردنەوەی دەرمان[٢٧٨].

لەسەر ئەم بنەمایە، هەندێ جار مرۆڤ تووشی زیان دەبێت بەڵام لەوانەیە لە پشت ئەم زیانەوە حیکمەتێك هەبێت کە خودای گەورە دەیزانێ لەو زیانەدا چاکە و خێری تێدایە بۆی. موعتەزیلە دەڵێ خودای گەورە دەزانێ گەر ئەو منداڵانە بمانایە بڕوایان دەهێنا یان ئەو فاسیقانەی گەر ژیانیان بەردەوام بوایە تەوبەیان دەکرد، ئەوە خودای گەورە پێش ئەوە نەیدەمراندن، هەرکەس

---

[٢٧٧] - بڕوانە - الملل و النحل - جـ١ - ل٧٣، ٩٤.

[٢٧٨] - هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٩٤.

خودای گەورە بزانێ گەر بژی ئەوا کردەوەی باش ئەنجام دەدات و ئیمانی بەهێز تر دەبێت ئەوا خودا دەیهێڵێتەوە، بۆیە خودای گەورە ئەو کەسانە دەمرێنێت گەر بزانێ بمێننەوە بە ئەندازەی چاو تروکانێکیش کردەوەی چاکە ئەنجام نادەن، بەڵکو ڕەنگە کافر و فاسقیش ببن ...[279].

دەگێڕنەوە کە ئەشعەری ویستویەتی ئەبو عەلی جبائی کەمامۆستای خۆی بووە ئیحراج بکات، بۆیە ئافرەتێکی بە تەمەنی ڕاسپارد بۆ ئەوەی پێی بڵێ: کە من سێ کوڕم هەبوو: یەکێکیان زۆر کەسێکی دیندار و دنیانەویست بوو، دووەمیشیان کەسێکی کافر و خراپکار بوو، سیهەمیشیان منداڵێك بوو هێشتا باڵغ نەبووبوو. هەرسێکیان لەسەر ئەم سیفەتانە مردن. ئەی شێخ هەواڵی هەرسێکیانم پێ بڵێ حاڵیان چۆنە. جەبائی وتی: کەسە دیندار و دنیا نەویستەکە ئەوە لە بەرزاییەکانی بەهەشتایە.. کافرەکەشیان ئەوە لەقوڵایی دۆزخدایە. هەرچی منداڵە بچووکەکەشە ئەوە سەلامەتە و بێوەیە. ئەشعەری وتی: پێی بڵێ: ئەگەر ئەو منداڵە بیەوێت بڕوات بۆ لای برا چاکەکەی کە پلە بەرزەکانی بەدەستیهێناوە. دەتوانێ ئەو کارە بکات؟ جەبائی وتی: نەخێر. چونکە خودا پێی دەڵێ ئەوەی کە ئەو گەیشتووە بەو پلە بەرزە بە هۆی ئەوەوە بووە کە خۆی ماندووکردووە لە دنیادا بە زانست و کردەوەی چاکەوە بۆیە گەیشتووە بەو پلە باڵایە. بەڵام تۆ ئەو زانست و کردەوە چاکەی ئەوت پێ نییە بۆیە ناتوانی بڕۆیت بۆ لای ئەو. ئەشعەری وتی: پێی بڵێ: گەر منداڵە بچووکەکە لەو کاتەدا بڵێ: ئەی پەروەردگاری جیهانیان خۆ ئەوە تاوانی منی تێدا نییە، چونکە پێش ئەوەی باڵغ ببم تۆ گیانت کێشام و منت مراند. گەر مۆڵەتت پێم بدایە، لەوانەیە لە برا دیندار و دنیا نەویستەکەم زیاتر دیندار تر و

---

[279] ـ بڕوانە ـ مقالات الإسلاميين ـ ل٢٦٤ ـ يان ـ زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل١٠٤.

دنیا نەویستر بوومایە. جەبائی وتی: خودا پێی دەڵێ: زانیم گەر تۆ بژیایتایە یاخی دەبوویت و بێباوەڕ دەبوویت و ئەو کاتە لەو کەسانە دەبوویت کە ئاگر بۆت واجب دەبوو، بۆیە پێش ئەوەی بگەی بەو حاڵەتە بەرژەوەندی تۆم لەبەرچاو گرت و تۆم مراند تا ڕزگارت ببێت لە سزا. ئەشعەری وتی: پێی بڵێ: ئەگەر برا کافرەکەی لە قوڵای دۆزەخدا سەری بەرزکردەوە و وتی: ئەی پەروەردگاری جیهانیان، ئەی داناترینی داناکان، ئەی میهرەبانترینی میهرەبانان: تۆ زانیت کە برا بچوکەکەم گەورە بێت و باڵغ بێت کافر دەبێت، زانیشت من وام لێ دێ، ئەی بۆ بەرژەوەندی ئەوت پاراست، بەڵام بەرژەوەندی منت نەپاراست[٢٨٠]؟

ئەوەی لەم دیدارەدا بۆمان دەردەکەوێت ئەوەیە سەرکەوتن لە بەرژەوەندی ئەشعەرییدا بووە، جا عەقیدەی "صەلاح و ئەصلەح" لای موعتەزیلە بە ڕێگەیەکی زۆر ژمێریاری ورد دانراوە، بەڵام ئەوەیان لە بیر چوو بوو کە خودای گەورە لە هەموو کردەوەکانیدا حیکمەتێکی هەیە کە نە لە ئێستاش و نە لە ڕابردووشدا ئەقڵی مرۆڤایەتی نەیتوانیووە پێی بگات، گەر ئەوەمانزانی کە ئەشعەری پێشتر یەکێك بووە لە پیاوانی موعتەزیلە و شارەزای شێوازی مشتومڕکردنی ئەوان بووە، ئەو کاتە دەزانین کە چەند ئاسان بووە ئەشعەری لەم جۆرە دیدارانەدا سەرکەوتوو بێت.

لە کۆتایی قسەکانمان سەبارەت بە عەدالەتی خودایی وەك ئەوەی کە موعتەزیلەکان گوزارشتیان لێوە کردووە، دەڵێین: لە ڕاستیدا موعتەزیلە لەبارەی ئازادی و یستی مرۆییەوە کاروبارێکی زۆریان ڕاڤەکردووە، زۆر شتیان لە بارەی حیکمەت و دانایی خودای گەورە ڕوونکردووەتەوە، ئەگەر بڵێین

---

[٢٨٠]- بڕوانە - تفسیر الرازي - جـ٤ - ل١٤٦، ١٤٧.

مرۆڤەکان هیچ ویستێکیان لە کردەوەکانیاندا نییە و بەزۆر پێیان دەکرێت ئەوە لێی تێنەدەگەیشتن، بۆیە ئەوەیان بۆ ڕاڤەکردووین کە مرۆڤ لەبەرامبەر ئەو کردەوانەی کە دەیکات بەرگەی ئەو لێپرسراویەتیە دەگرێت، هەروەها حیکمەتی ئەرك و ناردنی پێغەمبەرانیشیان بۆ ڕوونکردوینەتەوە و زوڵم و ستەمیشیان لاداوە لە خوای گەورە، بۆیە دەبینین لەپێناو بەرز ڕاگرتنی ئەقڵی مرۆڤایەتی وتیان فیکر پێش هاتنی شەریعەتی خودایە. بەڵام ئەوان لەپێناو بەرگریکردن لە عەدالەتی خودایی عەقیدەی "صەلاح و ئەصلەح"یان هێنایە ئاراوە، ئەوەبوو لەهەندێ کاروباردا زێدەڕەوییان کرد کە ئەستەم بوو ئەقڵی مرۆڤایەتی دەرك بە دانایی بکات و لە پەیوەندییەکانی حاڵی ببێت، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی ئەشعەری بە ئاسانی بتوانێت تێکی بشکێنێت.

بەهەرحاڵ موعتەزیلە تووشی تاقیکردنەوەیەکی باش بوویەوە کاتێ بەرگرییان لە عەدالەتی خودایی کرد، جا ئایا لە هۆکارەکانی بەرگریکردنیاندا هەڵەیان کردبێ یان پێکابێتیان، ئەمەش لەهەموو مەزهەبێکدا ڕوو دەدات، خۆ هەڵە تەنها لەسەر "ئەهلی عەدل و تەوحید" تاپۆنەکراوە.

## بنەمای سێهەم: پاداشت و سزا: "الوعد و الوعيد"

پاداشت و سزا "الوعد و الوعيد" لای موعتەزیلەکان مانای تایبەت بە خۆی هەیە، ئەویش ئەوەیە گەر مرۆڤی بڕوادار لە دنیادا لەسەر تاعەت و فەرمانبەرداری خودا دەرچوو تەوبەیکرد، شایستەی ئەوەیە لەبری ئەو تەوبەی کە لە دنیادا کردوویەتی بە بەهەشت پاداشت بدرێتەوە، گەر هاتوو ئەو مرۆڤە لەدنیادا بەبێ تەوبە گەڕایەوە و گوناهێکی گەورەشی ئەنجامدا بوو، ئەوە شایستەی ئەوەیە کە بە هەمیشەیی لە ئاگردا بمێنێتەوە، بەڵام سزای ئەم

مرۆڤە بڕواداره سوکتره له سزای کەسێکی بێباوەڕ، ئەم شێوازه پێی دەوترێت پاداشت و سزا "الوعد و الوعید"[٢٨١].

پاداشت "الوعد": بریتی یه له گەیاندنی هەواڵێك به کەسی بەرامبەر به مەبەستی ئەوەی له ئایندەدا سوودی پێ بگەیەنێت یان زیانێکی لێ دوور بخاتەوه.

سزا "الوعید": بریتی یه لەگەیاندنی هەواڵێك به کەسی بەرامبەر جا ئایا ئەم هەواڵه زیانی تێدایه بۆ کەسی بەرامبەر له ئایندەدا یان ئەوەیه سوودێکی بەرامبەری تێدا دەفەوتێنرێت[٢٨٢].

خودای گەورەش بێگومان چ له پاداشت چ له سزاشدا ڕاستگۆیه، پەیمانیشیداوه پاداشتی ئەو بەندانەی بداتەوه که له دنیادا گوێڕایەڵیبوون، هەروەها پەیمانیشی بەکەسانی یاخی و سەرپێچیکار داوه که سزایان بدات، خودای گەورەش هەر پەیمانێکی به بڕواداران دابێت جێبەجێی دەکات و تۆڵەش له کەسانی گوناهکار دەکاتەوه و هیچ جۆره گۆڕانکاریەك بەسەر پەیمانی خودادا نایەت، هەرگیز خودا پێچەوانەی پاداشتێك نابێتەوه که به بڕوادارانی داوه، درۆش ناکات که پەیمانی داوه سزای گوناهکاران دەداتەوه.[٢٨٣]

درۆ "الکذب": بریتی یه لەهەر هەواڵێك ـ گەر هەواڵدەرێکیشی هەبوو ـ لەسەر ئەو پەیمانه نەبێت که هەواڵی لەسەر دراوه. مەبەست لەوەی گەر هەواڵدەرێکیشی هەبوو ئەوەیه هەندێ هەواڵ هەیه هەواڵدەری هەر نییه، وەك ئەوەی که خودایەکی تر نییه لەگەڵ "الله"دا...) بەڵام پێچەوانەی قسه: بریتی

---

[٢٨١] ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٦٦.

[٢٨٢] ـ القاضي عبد الجبار ـ شرح الأصول الخمسة ـ ل١٣٤.

[٢٨٣] ـ هەمان سەرچاوه ـ ل١٣٥.

یە لەوەی هەواڵیداوە کە لەئایندەدا کارێك بکات بەڵام نایکات، ئەمەش مەحاڵە بۆ خودا کەس ناتوانێ قسە لەکارێکدا بکات کە خودا وا بکات، خیلافیش لەحەقی خودای گەورەدا نییە، گەر وابێت ئەوە دەبێتە درۆ، گەورەیی و بەرزی هەر بۆ خودایە[284].

لای موعتەزیلە هەرکەس بۆچوونی پێچەوانەی ئەم بۆچوونەی پاداشت و سزایە هەبێت، لەم دوو قسەیە دەرناچێت: یان ئەوەیە لەبنەڕەتدا خۆی پێچەوانەی بنەمای پاداشت و سزایە، دەڵێ خودا نە پەیمانی بە بڕوادارانداوە پاداشتیان بداتەوە نە پەیمانیشیداوە ئەوانەی تەوبە ناکەن لە گوناهی گەورە خودا سزایان دەدات. ئەم قسەیە ڕەتدەکرێتەوە، چونکە ئەمە پێچەوانەی پێغەمبەرایەتی موحەممەدە (درودی خودای لێبێت)، ئێمە لەڕێی ئاینەکەیەوە دەزانین کە ئەمە پێویستیەکی دینە و خودا پاداشت و سزای هەیە لەڕۆژی قیامەتدا.

یان ئەوەتا پێچەوانە مامەڵە دەکات و دەڵێ: خودای گەورە پاداشت و سزای هەیە، بەڵام ئەکرێت خودا چاوپۆشی لە سزا دانەکەدا بکات، ئەم قسەیەش ڕەتدەکرێتەوە، چونکە چاوپۆشی لەحەقی خودای گەورەدا مەحاڵە و ئەوەی کە پێشوو لێوەی دواین بەدرۆ دەخاتەوە، درۆش بۆ خۆی شتێکی ناشرین و ناقۆلایە و خوداش کاری ناشرین و ناقۆلا ئەنجام نادات، چونکە دەزانێ کە کارێکی ناقۆلایە و بێ نیازیشە پێی. گەر دروست بێ چاوپۆشی لەسزای گوناهکارێکدا بکات، ئەوە چاوپۆشی لەپاداشتی چاکەکارێکیشدا دەکات، چونکە بەم پێیە هەردوو بابەتەکە وەك یەك وایە. گەر دەڵێن جیاوازی لە نێوانیاندا هەیە، چونکە چاوپۆشیکردنی خودا لە سزادا بەخشندەییە بەڵام لە

---

[284]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕە.

پاداشتدا بەو جۆرە نییە، ئەوا ئێمەش دەڵێین مەسەلەکە بەو شێوەیە نییە، چونکە بەخشندە لە چاکەکاندایە و درۆش بەهەموو شێوەکانیەوە کارێکی ناشرینە و چۆن دەبێتە بەخشندە. ئەوانەی کە پێچەوانەی ئەم بۆچوونەن دەڵێن: خودا پاداشت و سزای هەیە، دروست نییە خودا چاوپۆشی یان درۆ بکات، بەڵام بەگشتی لە سزادا دەکرێت لەبەر هەندێ مەرج و تایبەتمەندی چاوپۆشی بکات، بەڵام خودا مەرجی ئەو کەسانەی دیارینەکردووە کە لێی خۆش دەبێت. ئەمەش ڕەتدەکرێتەوە، چونکە خودا کە کارساز و کار بەجێیە ناکرێت ئاماژەی بەشتێك دابێت و پێچەوانەی ئەو ئاماژەیەی مەبەست بێت و ڕۆشنی نەکردبێتەوە لە کێ خۆشدەبێت و لە کێ خۆش نابێت، چونکە گەر وابوو واتە لە قورئاندا بەجۆرێك دەستەواژەکان بەکاردێنێت کەس لێی تێ ناگات، یان شتێك بە گشتی باس دەکات و دواتر ئەو شتە ڕۆشن ناکاتەوە، دەی ئەمەش بۆ خودا دروست نییە بڕیار بدرێت[285].

بەپێی ئەم قسەی پێشوو خودای گەورە پاشگەز نابێتەوە نە لە پاداشت و نە لە سزادا، چونکە پاشگەز بوونەوە درۆیە بەرامبەر بەحەقی خودا، خوداش زۆر لەوە گەورەترە کە درۆی بدرێتە پاڵ، سزاش پێوەست نەکراوە بە هیچ مەرجێکەوە، چونکە هەرکەس لەخودا یاخیبوو سەرپێچی فەرمانەکانیکرد، ئەوە شایستەی ئەوەیە کەخودا سزای بدات، هەرکەسێکیش بمرێت و تاوانێکی گەورەی ئەنجام دابێت و تەوبەی نەکردبێت، ئەوا شایستەیە کە خودا بە هەمیشەیی لە ئاگردا بیهێڵێتەوە، لێرەشەوە هەڵوێستی خۆیان لەبارەی شەفاعەتەوە خستووەتەڕوو.

---

[285] ـ هەمان سەرچاوە ـ ل١٣٦، ١٣٧.

## • هەڵوێستی موعتەزیلە سەبارەت بە شەفاعەتی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت):

لە قورئانی پیرۆزدا هەندێ ئایەت هاتووە ئیسپاتی شەفاعەت دەکات و هەندێ ئایەتی دیکەش نەفی شەفاعەت دەکات، ئەو ئایەتانەی کە ئیسپاتی شەفاعەت دەکات بریتیە لەم ئایەتانەی لای خوارەوە:

١ـ ﴿مَن ذَا ٱلَّذِی یَشۡفَعُ عِندَهُۥۤ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦ﴾[٢٨٦].واتە: (کێ بێت ـ لەڕۆژی دواییدا ـ بتوانێ شەفاعەت بکات لای ئەو، هەتا ئەو خۆی مۆڵەتی نەدا).

٢ـ ﴿مَا مِن شَفِیعٍ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ إِذۡنِهِۦۚ﴾.[٢٨٧] واتە: (لە خۆی بەدواوە هیچ تکاکارێك نییە تکایان بۆ بکات، مەگەر کەسێك ئەو بۆ خۆی مۆڵەتی بدا).

٣ـ ﴿یَوۡمَىِٕذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَـٰعَةُ إِلَّا مَنۡ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحۡمَـٰنُ وَرَضِیَ لَهُۥ قَوۡلًا﴾.[٢٨٨]

واتە: (لەو ڕۆژەدا تکا و لالآنەوە لای خودا هیچ سوود نابەخشێ، مەگەر بۆ کەسێك کە خودای گەورە خۆی مۆڵەتی پێدابێ شەفاعەت بکا و وتار و قسەکەشی پەسەند بکا).

٤ـ ﴿وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَـٰعَةُ عِندَهُۥۤ إِلَّا لِمَنۡ أَذِنَ لَهُۥۚ﴾[٢٨٩]. واتە: (تکاکردن لای خودا ـ لەو ڕۆژی ناڕەحەتی و ترس و لەرزەدا ـ سودی نابێ، نە بۆ پەرستراوەکان و نە بۆ پەرستیارەکانیان، چونکە لەناو دڵەڕاوکێ و

---

[٢٨٦] ـ سورەتی ـ البقرة ـ ئایەتی ٢٥٥.

[٢٨٧] ـ سورەتی ـ یونس ـ ئایەتی ٣.

[٢٨٨] ـ سورەتی ـ طه ـ ئایەتی ١٠٩.

[٢٨٩] ـ سورەتی ـ سبأ ـ ئایەتی ٢٣.

بێزاریدابوون، ئێستاش حەپەسا و و چاوەڕوانن، تا بزانن خودا مۆڵەتی کێ ئەدا بۆ تکاکردن و کێش تکا بکات؟).

ئەو ئایەتانەش کە نەفی شەفاعەت دەکات، بریتین لە:

١ـ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَنفِقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَـٰكُم مِّن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَ يَوۡمٞ لَّا بَيۡعٞ فِيهِ وَلَا خُلَّةٞ وَلَا شَفَـٰعَةٞۗ وَٱلۡكَـٰفِرُونَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴾.[290] واتە: (ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! ببەخشن هەندێك لەو ماڵ و سامانەی پێمانداون، پێش لە هاتنی ڕۆژێك هیچ کڕین و فرۆشتنێکی تێدا نییە ـ تا بە ماڵ خۆتان بکڕنەوە ـ هەروەك هیچ دۆستی و تکا و شەفاعەتێك سوودی نابێ، هەر کافر و بێباوەڕان نا هەقیکار و ستەمکارن).

٢ـ ﴿وَأَنذِرۡ بِهِ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ أَن يُحۡشَرُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ لَيۡسَ لَهُم مِّن دُونِهِۦ وَلِيّٞ وَلَا شَفِيعٞ ﴾.[291] واتە: (تۆ بەم قورئانە ئەو کەسانە بترسێنە کە دەترسن ڕۆژێك پێشبێت لای پەروەردگاریان کۆبکرێنەوە و دەشزانن کە جگە لەویش هیچ دۆست و یارمەتیدەر و تکا کارێکیان نییە).

٣ـ ﴿مَا لَكُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا شَفِيعٍۚ أَفَلَا تَتَذَكَّرُونَ ﴾[292]. واتە: (ئەی کافران! بۆتان نییە هیچ دۆست و تکاکارێك ـ جگە لە خۆی ـ لەسزا ڕزگارتان بکات، دە ئایا ئامۆژگاری وەرناگرن و لەسەر کوفر و شیرکی خۆتان بەردەوام دەبن؟!).

---

[290] ـ سورەتی ـ البقرة ـ ئایەتی ٢٥٤.

[291] ـ سورەتی ـ الأنعام ـ ئایەتی ٥١.

[292] ـ سورەتی ـ السجدة ـ ئایەتی ٤.

شەفاعەتی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) لای ئەهلی سوننەت تەسپیتە بە پێی ئەو فەرموودەی کە هەریەك لە بوخاری و موسلیم لە پێغەمبەرەوە ڕیوایەتیان کردووە کە دەفەرموێت: (شفاعتي لأهل الكبائر من أمتي). واتە: (شەفاعەتی من لە ڕۆژی قیامەتدا بۆ کەسانێکە لە ئوممەتی من کە تاوانی گەورەی ئەنجامداوە).

بەلاّم لای موعتەزیلە ئەوەبوو بینیمان هەموو جیاکارییەك ڕەتدەکەنەوە لەسەر سزای خودا بۆ کەسانی تاوانبار، هەر کەس لەخودا یاخیبوو سەرکەشی نواند، ئەوە شایستەی ئەوەیە سزا بدرێت، چونکە خودای گەورە پاشگەز نابێتەوە لەو سزایەی کە بۆ گوناهکارانی بڕیار داوە، بۆیە ـ لای موعتەزیلەکان ـ پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) شەفاعەت بۆ کەسانێك ناکات کە تاوانی گەورەیان ئەنجامداوە، بەڵکو شەفاعەتی پێغەمبەر بۆ بڕوادارانێکە کە تەوبەیان کرد بێت لە گوناهوتاوان تا پلەیان پێ بەرزبێتەوە، شەفاعەت بۆ ئەهلی پاداشتە نەك بۆ ئەهلی سزا، بۆ دۆستانی خودایە نەك بۆ دوژمنانی خودا، ئەو کەسەی کە شافیعە دەبێت ڕازی بێت لەو کەسەی کە دەیەوێت شەفاعەتی بۆ بکات.[٢٩٣] بۆ ئەمەش بەلگە بەم ئایەتە پیرۆزە دەهێننەوە: ﴿مَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ حَمِيمٖ وَلَا شَفِيعٖ يُطَاعُ ١٨﴾.[٢٩٤] واتە: (ئەو کات ستەمکاران هیچ پشتیوان و دۆستێکیان نییە، بتوانێ کەڵکیان پێ بگەیەنێت و هیچ تکا کارێکیشیان نییە تکای وەربگیردرێ، هەموو پەیوەندییەك دەپچڕێ).

---

٢٩٣ـ بڕوانە ـ القاضي عبد الجبار ـ شرح الأصول الخمسة ـ ل٦٩٣.

٢٩٤ـ سورەتی ـ غافر ـ ئایەتی ١٨.

گەر کەسێك تاوانی گەورەی ئەنجامدابێ و بزانێ هیچ سزایەکی نادرێت و خودا لێی خۆش دەبێت، ئەو کاتە دوور ناکەوێتەوە لەگوناهو تاوان، بەڵکو ئەمە وای لێدەکات بەردەوامبێت لە تاوانەکانی و گوناهی زیاتر ئەنجام بدات و لەوەشی ئەنجامیداوە پاشگەز نابێتەوە و تەوبە ناکات، هەروەها هانی کەسانی دیکەش دەدا بۆ ئەوەی وەك خۆی گوناهی گەورە ئەنجام بدەن.[٢٩٥] جا ئەوەی ڕزگاری بوو ئەوە بە کردەوەکانی خۆی شایستەی پاداشتە، ئەو کەسەشی خەسارۆ مەندە بە هۆی کردەوەکانیەوە شایستەی ئەو سزایە دەبێت کە خودا بۆی داناوە، ئەقڵیش لەڕووی داناییەوە ئەوە دەخوازێ کەسێك چاکەی کرد پاداشت بدرێتەوە کەسێکیش گوناهی گەورەی ئەنجامدا سزا بدرێت.[٢٩٦]

لەمەوە دەردەکەوێت کە موعتەزیلە لەڕووی ئەقڵەوە دەڕواننە پاداشت و سزا، هەر کەسیش بەم شێوازە ئەقڵ بەکار بهێنێ بۆ مەسەلەکان دەگات بەهەمان دەرئەنجام کە موعتەزیلە پێی دەگات، گەر لەڕووی ئەقڵەوە لێی بڕوانی ناچێتە ئەقڵەوە کە خودا لە سزای خراپەکاران پاشگەزبێتەوە و پێغەمبەریش شەفاعەت بۆ کەسانێك بکات کە گوناهی گەورەیان ئەنجامدابێ و تەوبەیان نەکردبێ و وازیان لە گوناه نەهێنابێت، بەڵام دەبێت ئەوە بزانین کاتێك کە موعتەزیلە ئینکاری شەفاعەتی پێغەمبەریان (درودی خودای لێبێت) کردووە، تەنها بۆ کەسانێك بووە کە گوناهی گەورەیان ئەنجامداوە، بەڵام بۆ بڕوادارانیان تەسپیتکردووە، بۆیە بە ڕەهایی ئینکاری شەفاعەتیان نەکردووە، جا ئامانجی یەکەم و سەرەکی ئەم ئینکاریکردنە ڕێژەییەی موعتەزیلە سەبارەت بە شەفاعەتکردنی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) بۆ

---

[٢٩٥] ـ الإيجي ـ المواقف ـ جـ٢ ـ ل٢٥٠.

[٢٩٦] ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ ل٦٤.

دوورخستنەوەی گوناهکاران بووە، بۆ ئەوانەی کە بڕوایان وایە گرتنەبەری ڕێگای بەهەشت ئاسانە، ئایا لە گوناه دوورکەونەوە یان تەوبەبکەن یان بەردەوام بن لەسەر هەڵە و گوناهەکانیان، ئەمەش دەبێتە هۆی بلاوبوونەوەی کردەوەی نەشیا و لەناو کۆمەڵگەدا و هانی خەڵکیش دەدات پاڵدەنەوە و پشتکەنە کردەوەی باش. جا ئایا موعتەزیلە لەم خاڵەدا لەسەر هەقە؟ پرسیارێکە پێویست بەوە دەکات هەڵوێستەی لەسەر بکرێت و بیری لێ بکرێتەوە.

## بنەمای چوارەم - شوێنێك لەنێوان دوو شوێندا "المنزلة بين المنزلتين":

پێشتر ئامارەمان بەوە کرد کە بڕیاردان لەسەر ئەنجامدەری گوناهی گەورە یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کە کاریگەری زۆری هەبوو لەسەر سەرهەڵدانی بیری موعتەزیلە، بەڵکو بڕیاردان لەسەر ئەنجامدەری گوناهی گەورە بووە بنەمایەك لە بنەماکانی موعتەزیلە،[٢٩٧] هەروەها باسی ئەوەشمان کرد کە چۆن "واصل" بۆچوونی خۆی سەبارەت بە ئەنجامدەری گوناهی گەورە خستەڕوو وتی ئەوان لە شوێنکدان لەنێوان بڕوادار و بێباوەڕدا، واتە نە بڕواداری تەواون وە نە بێباوەڕی تەواو، لەسەر ئەم قسەیە لە ئەڵقەی حەسەنی بەصری جیابووەوە و خۆی دوورە پەرێز خست.[٢٩٨]

---

[٢٩٧] - بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

[٢٩٨] - بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

جا پێش ئەوەی بچینە سەر باسی ئەم بنەمایە، وایدەبینین بەسوودە گەر مەزهەبی خەواریج[299] و مەزهەبی مورجیئە[300] سەبارەت بە مەسەلەی ئەنجامدەری گوناهی گەورە بخەینەڕوو.

## • مەزهەبی خەواریج سەبارەت بە ئەنجامدەری گوناهی گەورە:

ئەزاریقەکان ـ کە یەکێکن لە گروپەکانی خەواریج ـ پێیان وایە هەر کەسێك گوناهێك لە گوناهە گەورەکان ئەنجام بدات پێی کافر دەبێت و لە ئاینی ئیسلام پێی دەچێتە دەرەوە، پاداشتەکەشی ئەوەیە لەگەڵ تێکڕای کافراندا بە هەمیشەیی لە ئاگردا دەمێنێتەوە. بەڵگەشیان بۆ ئەمە کافربوونی ئیبلیسە،

---

[299] ـ خەواریجەکان: کۆمەڵێك بوون لە هاوەڵانی عەلی کە لەجەنگی صفیندا دژ بە موعاویە دەجەنگان، پاشان لێی جیابوونەوە و لێی ڕاپەڕین، چونکە ڕازی نەبوون بە داوەرییەکەی ئەبو موسای ئەشعەری و عەمری کوڕی عاص، وتیان: بۆچی پیاوەکان حوکم و داوەریانکردووە؟ جگە لە خودا هیچ کەس بۆی نییە حوکم و داوەری بکات. گرنگترین گروپ و تاقمەکانیان بریتی بوو لە: موحەکەمە، ئەزاریقە، نەجدات، بەهیسیە، موجاردە، ثەعالبە، ئیباضیە، صەفەرییە، بڕوانە ـ الشهرستانی ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل١٢٩، ١٣٠ ـ تأريخ الخلفاء ـ للسيوطي ـ ل٢٠٧ ـ أخبار الخلفاء ـ محمد بن حيان ـ ل٣١٩، ٣٢٠.

[300] ـ مورجیئە: بەهۆی یەکێك لەم دوو مانایەوە ئەو ناوەیان لێنراوە: یەکەمیان: "إرجاء" بە مانای دواخستن دێت لەڕووی زمانەوە یان بە مانای ئومێد پێدان. هەرچی مانای یەکەمە ئەوەیە هەر کردارێك کە دەیکەیت ئەوا لەسەر نییەتەکەی پاداشت وەردەگریت، مانای دووەمیش لەبەر ئەوە بووە کە ئومێد و هیوا دەبەخشێت بە کەسی گوناهکار و سەر پێچیکار و وتویانە: هیچ گوناهێك زیان نادات لە ئیمان، وەك چۆن لەگەڵ کوفردا هیچ گوێڕایەڵیەك سود و کەڵکی نییە ! !. بڕوانە ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل١٤٩.

دەڵێن ئیبلیس تەنها یەك گوناهی گەورەی ئەنجامدا، ئەویش ئەوەبوو کە خودا فەرمانی پێکرد سوژدەی ڕێز ببات بۆ ئادەم (سەلامی خودای لێبێت)، بەڵام ئەو داواکەی خودای ڕەتکردەوە و لە گوێی فەرمایشتەکەی نەکرد، ئەگەر نا خۆ ئیبلیس خودای گەورەی باش دەناسی و بڕوای بە تاقانەیی خودا گەورە هەبووە[301].

لەڕاستیدا لای خەواریجەکان ئەم حوکمە هاوڕایە لەگەڵ چەمکی باوەڕدا، ئەمەش بەو واتایەی کە کارکردن بە فەرمایشتەکانی دین وەك "نوێژ و ڕۆژو و ڕاستگۆیی و دادپەروەری" بەشێکە لە باوەڕ، باوەڕیش بیروباوەڕ نییە بە تەنها، چونکە هەر کەسێك باوەڕی وابوو کە جگە لە "الله" هیچ پەرستراوێکی تر بە حەق نییە و موحەممەدیش (درودی خودای لێبێت) پێغەمبەر و فرستادەی خودایە، ئەوجا ئەرکەکانی دینی ئەنجام نەدا و گوناهی گەورەی ئەنجامدا، ئەو کەسە کافر و بێباوەڕە[302].

## • مەزهەبی مورجیئە سەبارەت بە ئەنجامدەری گوناهی گەورە:

لەڕاستیدا مورجیئەکان حوکمی ئەنجامدەری گوناهی گەورەیان دواخستووە بۆ ڕۆژی قیامەت و هیچ حوکمێکیان لەسەر نەداوە کە ئەم کەسە ئەهلی بە هەشتە یان ئەهلی دۆزەخ، هەندێ لە مورجیئەکان لەوانە "ئەوبانیەکان" دەڵێن: ئەگەر خاوەن گوناهە گەورەکان خرانە نێو دۆزەخەوە، پاش ئەوەی

---

[301] ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل١٣٥.

[302] ـ بڕوانە ـ أحمد أمین ـ فجر الإسلام ـ ل٤١١.

لەسەر گوناهەکانیان سزایان وەرگرت لە دۆزەخ دەردەهێنرێنە دەرەوە، بەڵام مانەوەیان بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا ئەستەمە، چونکە دادپەروەری تێدا نییە کەسێك بە هۆی گوناهێکی گەورەوە بە هەمیشەیی لەدۆزەخدا بهێڵرێتەوە. هەندێکی دیکەیان پێیان وایە بڕواداری سەرپێچیکار تەنها لەسەر پردی "صراط" سزا دەدرێت کە بەسەر دۆزەخدا تێپەڕ دەبێت، تیشك و بڵێسە و گەرمایی ئاگرەکە لێی دەدات و دەیسوتێنێت، ئیتر بەو شێوەیە لەسەر ئەو پردە بە ئەندازەی گوناهەکەی ئازار دەچێژێ، پاشان دەخرێتە بەهەشتەوە، بۆ ئەمەش نموونە بە دانەوێڵە دەهێننەوە کاتێك لە نێو دەفرێکدا دەکوڵێنرێت و دواتر شتێکی هەر لێ دەمێنێتەوە[٣٠٣].

بۆیە پێمان وایە ئەم حوکمە تەواو هاوڕایە لەگەڵ چەمکی باوەڕدا لای مورجیئەکان، چونکە باوەڕ لای ئەوان بریتیە لە ناسینی خودای گەورە و باوەڕبوون بە پێغەمبەرەکەی "سەلامی خودای لێبێت" پاشان ملکەچبوون بۆ خودای گەورە و هاوبەشی دانەنان بۆی، هەر کەسێك ئەم نیشانانەی تێدا کۆبوویەوە ئەوە بڕوادارە، پاشان مورجیئە کردەوەی بە بەشێك لە باوەڕ دانەناوە، چونکە لای ئەوان ئەنجامدانی تاعەت و پەرستشەکان بەشێك نین لە ئیمان و باوەڕ، بە گشتی لای ئەوان هیچ گوناهێك زیان نادات لە ئیمان، وەك چۆن لەگەڵ کوفردا هیچ گوێڕایەڵیەك سود و کەڵکی نییە!!. بەڵکو مرۆڤی بڕوادار بەهۆی خۆشویستن و دڵسۆزبوونی بۆ خودا دەچێتە بەهەشتەوە، نەك بە هۆی کردار و ئەنجامدانی تاعەت و پەرستشەکانیەوە[٣٠٤].

---

[٣٠٣]- الملل و النحل - جـ١ - ل١٤٩، ١٥٢.

[٣٠٤]- هەمان سەرچاوەی پێشوو - ل١٤٩، ١٥٠، ١٥١.

## • مەزهەبی موعتەزیلە سەبارەت بە ئەنجامدەری گوناهی گەورە:

موعتەزیلە دەڵێ ئەنجامدەری گوناهی گەورە لە شوێنێکدایە لە نێوان دوو شوێندا، نە بڕواداری تەواوە، نە بێباوەڕی تەواو، بەڵکو فاسیقە، گەر هاتوو لە دنیا دەرچوو بەبێ تەوبە و پەشیمانی ئەوە بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە، خەڵکی - لای ئەمان - لەڕۆژی قیامەتدا دوو دەستەن: دەستەیەکیان بەهەشتیە، دەستەیەکیشیان دۆزەخیە بەڵام سزای ئەمان سووکترە لە سزای بێباوەڕان[٣٠٥].

لەڕاستیدا موعتەزیلەکان بە هۆی ئەم بۆچوونەیانەوە هەڵوێستێکی میانیان گرتەبەر لە نێوان پەڕگیری خەواریجەکان و شلگیری مورجیئەکاندا، بۆیە دەڵێن: گوناهباری گەورە نەکافری تەواوە وەك ئەوەی خەواریجەکان دەیڵێن، نە باوەڕداری تەواویشە وەك ئەوەی مورجیئەکان دەیڵێن، بەڵکو فاسیقە، ئەگەر چی لەوەدا لەگەڵ خەواریجەکاندا هاوڕان گەر هاتوو لە دنیا دەرچوو تەوبە و پەشیمانی دەرنەبڕی ئەوا بە هەمیشەیی لە دۆزەخدا دەمێنێتەوە.

لەڕاستیدا بۆچوونی موعتەزیلە سەبارەت بەم حوکمە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە ئیمان لای ئەوان بریتی یە لە کۆمەڵێك خەسڵەت و نیشانەی چاکە، هەر کەس ئەو کۆمەڵە خەسڵەت و چاکەیەی تێدا کۆبێتەوە ئەوە بڕوادارە، شایستەیە پیاهەڵدانی بۆ بکرێت، فاسیقیش لەبەر ئەوەی سیفەتە چاکەکانی تێدا کۆنەبووەتەوە شایستەی پیاهەڵدان و ستایش نییە و پێی ناوترێت

---

[٣٠٥] - هەمان سەرچاوە - ل٦٩.

بڕواداری تەواو و بە ڕەهایش پێی ناوترێت کافر و بێباوەڕە، چونکە ئینکاری لەوە ناکرێت کە شایەتیداوە و کردەوەی چاکەیشی هەیە[٣٠٦].

لەڕاستیدا بۆچوونی هەر سێ دەستەکە " خەواریج و مورجیئە و موعتەزیلە" سەبارەت بەو بڕوادارەی کە گوناهی گەورەی ئەنجامداوە، لەڕووی سیاسیەوە جۆرێك لە جۆرەکان بۆچوونێکی مەترسیداری هەیە، ئەمەش پێچەوانەی بۆچوونیانە لەسەر بەشداربووانی هەردوو جەنگی "جەمەل و صفین" کە پشت بە خودا لە بەشی داهاتوومان‌دا باسی لێوە دەکەین.

## بنەمای پێنجەم ـ فەرمان بەچاکە و ڕێگرتن لەخراپە: "الأمر بالمعروف و النهي عن المنكر"

لەڕاستیدا ئەم بنەمایە داهێنانێك نییە و موعتەزیلەکان لەخۆیانەوە دایانهێنابێت ـ گەرچی ئەوانیش قسەی تریان لەسەری هەیە ـ بەڵکو ئەوەتا کۆمەڵە ئایەت و فەرموودەیەك لەو بارەوە هاتووە کە جەخت لەوە دەکەنەوە و بە یەکێك لە پایەکانی باوەڕ ـ ئیمان ـ هەژماریان کردووە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ ٱلَّذِينَ إِن مَّكَّنَّٰهُمْ فِى ٱلْأَرْضِ أَقَامُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُا۟ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَمَرُوا۟ بِٱلْمَعْرُوفِ وَنَهَوْا۟ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۗ وَلِلَّهِ عَٰقِبَةُ ٱلْأُمُورِ ﴿٤١﴾ ﴾.[٣٠٧] واتە: (ئەوانەی کە ئەگەر پایەدارمانکردن لەزەویدا نوێژ و دروشمەکانی بە چاکی ڕادەگرن، زەکاتیش بە تەواوەتی دەدەن، فەرمان بەچاکە دەکەن، قەدەغەش لەخراپە دەکەن، سەرئەنجامی هەموو کارێکیش هەر بۆ لای خودا

---

[٣٠٦] ـ هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

[٣٠٧] ـ سورەتی ـ الحج ـ ئایەتی٤١.

دەگەڕێتەوە). هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَـٰبُنَىَّ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ وَأْمُرْ بِٱلْمَعْرُوفِ وَٱنْهَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَٱصْبِرْ عَلَىٰ مَآ أَصَابَكَ ۖ إِنَّ ذَٰلِكَ مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٧﴾﴾.[٣٠٨] واتە: (کوڕی شیرینم نوێژەکانت بە چاکی ئەنجام بدە، فەرمان بەچاکە بدە، قەدەغە لە گوناهو خراپە بکە، بە ئارامبە لەبەرامبەر ئەو ناخۆشیانەی کە تووشت دەبێت، بەڕاستی ئەوانەی کەباسکران هەندێکن لەوانەی هەر دەبێت بکرێن). لە ئایەتێکی تردا خودا دەفەرموێت: ﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ۚ وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٤﴾﴾.[٣٠٩] واتە: (پێویستە هەمیشە لەئێوە کۆمەڵ و دەستەیەك ببێت، خەڵکی بۆ ڕێی خێر و چاکە بانگ بکەن، فەرمان بدەن بە هەموو کارێکی باو و دروست، قەدەغەی هەموو نا دروستیەك بکەن، ئا ئەوانە هەر سەرفرازن).

سەبارەت بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) لەم ڕووەوە، فەرموودەی زۆر هەیە، ئەوەتا لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە کە ئەبو هورەیرە گێڕاویەتیەوە دەڵێ: پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) فەرموویەتی: (مَنْ رأى مِنْكُم مُنْكَراً فَلْيُغَيِّرُه بيَدِهِ، فَإنْ لَمْ يَسْتَطيعْ فَبِلسانهِ، فَإنْ لَمْ يَسْتَطيعْ فَبِقَلبِهِ، وَذلكَ أَضْعَفُ الإيمان) واتە: (هەر کەسێك لە ئێوە خراپەیەکی بینی ئەوا با بە دەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی ئەوا بە زمانی، ئەگەر نەیتوانی ئەوا بە دڵی، ئەوەش لاواز ترینی ئیمانە). لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە: (ئەوەی بەدڵیش پێی ناخۆش نەبێ، ئیتر ئەوە بە ئەندازەی گەردیلەیەك باوەڕ لەدڵیدا نییە)، ئیمام ئەحمەدیش لەحوذەیفەی کوڕی یەمانەوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر

---

[٣٠٨] ـ سورەتی ـ لقمان ـ ئایەتی١٧.

[٣٠٩] ـ سورەتی ـ آل عمران ـ ئایەتی١٠٤

(درودی خودای لێبێت) فەرموویەتی: (والذي نَفسي بيَدهِ لَتأمُرنّ بالمَعروفِ وَ لَتَنهونَ عَنِ المُنكَرِ أو لَيُوشِكنَ الله أن يَبعَثَ عَليكُم عِقاباً مِن عِندهِ ثُمّ لَتدعنهُ فَلا يستَجيب لَكُم).[310] واتە: (سوێند بێ بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە یان دەبێت فەرمان بەچاکە و بەرگری لە خراپە بکەن، یان لەوانەیە خودا لەلایەن خۆیەوە سزایەکتان بۆ بنێرێ ئەوجا هاواری بۆ بکەن و خوداش وەڵامتان ناداتەوە).

قازی عەبدولجەبار، لەسەر ئەم بابەتە هەندێ پێناسەمان پێشکەش دەکات بۆ ئەوەی زیاتر لە بابەتەکە تێ بگەین، دەڵێ:

ئەمر: بریتی یە لە فەرمانی کەسێك لەسەرەوە بۆ خوارەوە بۆ ئەنجامدانی کارێك.

نەهی: بریتی یە لە فەرمانی کەسێك لەسەرەوە بۆ خوارەوە بۆ نەکردنی کارێك.

المعروف: هەموو کردەوەیەکە خاوەنەکەی دەزانێ کە چاکە دەیکات، یان خۆی نایکات بەڵام ڕێنموونی خەڵکی دەکات بۆ ئەنجامدانی کردەوە چاکەکە.

المنکر: هەموو کردەوەیەکە خاوەنەکەی دەزانێ کە خراپە و ڕێنموونی خەڵکیش دەکات بۆ ئەنجامدانی کردەوە خراپەکە.

جا فەرمان بە چاکە و بەرگریکردن لە خراپە لە ڕووی نەقڵەوە "قورئان و فەرموودە و کۆڕای زانایان" واجبە.[311]

لە ڕاستیدا موعتەزیلە مەرجەکانی فەرمان بە چاکە و بەرگریکردن لە خراپەیان بۆ ڕوشنکردوینەتەوە، پێویستە یەکەمجار مەرجەکانی زانستی

---

[310] ـ بڕوانە ـ تفسير إبن كثير ـ جـ١ ـ ل٢٦٨

[311] ـ القاضي عبد الجبار ـ الأصول الخمسة ـ ل١٤١، ١٤٢.

تێدابێ بەوەی بزانێ کامە چاکەیە و کامە خراپەیە، ئەگەر نا واجب نابێ لەسەری و دڵنیا نییە لەوەی چی خراپە فەرمانی پێدەکات و چیش چاکە قەدەغەی لێدەکات، دەی ئەوەش دروست نییە، پێویستە ئەو زانینەش تەواو لێی دڵنیابێ ئەوجا فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە بکات، چونکە زاڵبوونی گومان لەم مەسەلەدا ناکاتە زانین.[٣١٢]

دووەم: دەبێت ئەو خراپەیە "منکر" بوونی هەبێت، وەك بینینی کەلوپەلی ئارەق خواردنەوە یان ئامادەسازی بۆ دانانی شوێنی تاترۆخانە. لێرەدا با گومانیشت هەبێت دەکاتە زانین و دەبێت فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە بکەیت.

سێهەم: دەبێت بزانێ کە ڕێگرتن لە خراپەکە سەر ناکێشێ بۆ خراپەیەکی گەورەتر، گەر زانی یان گومانی زۆر بوو کە ڕێگرتن لە خواردنەوەی ئارەق دەبێتە هۆی کوشتنی کۆمەڵێك موسڵمان یان سوتاندنی شوێنەکەی، ئەو کاتە ئەم فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە واجب نابێت، کاتێکیش واجب نەبێت کارێکی باشیش نییە.

چوارەم: دەبێت بزانێ کە قسەکەی کاریگەری دەبێت لەسەر بەرامبەر، ئەم مەرجەش ئەوە دەر دەخات کە موعتەزیلە حەزیان بەوە کردووە لەڕێگەی زمانەوە ڕێگری لە خراپە بکەن، ئەمەش یارمەتیدەریان بووە، چونکە توانایەکی باشیان هەبووە لە مشتومڕ و ڕووبەڕووبوونەوەدا، توانیویانە بەرامبەرەکانیان ببەزێنن.

---

[٣١٢]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

پێنجەم: دەبێت باش بزانێ کە فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە زیان بە خۆی و سامانەکەی ناگەیەنێت.[313]

لەڕاستیدا ئەم مەرجانەی موعتەزیلە ـ بە تایبەت مەرجی سێهەم و پێنجەم ـ لەگەڵ بنەما فقهیەکاندا یەکدەگرێتەوە کە دەڵێ: (لا ضَرَرَ و لا ضِرار) واتە: نابێت لە پێناو لابردنی زیانێکدا زیانێکی لەو گەورەتر بێتە ئاراوە، جا ئایا زیانەکە بۆ ئەو کەسە بێت کە دەیەوێت زیانەکە لابەرێت یان زیانەکە لەسەر کەسانی تر بکەوێتەوە، چونکە لەوانەیە ڕێگەیەکی تر هەبێت ئەو زیانە لا ببات.[314] هەروەها موعتەزیلەکان لەم مەسەلەیەدا بۆچوونیان لەگەڵ هەر یەك لە "شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیە و قوتابیەکەی ئیبن قەییمی جەوزی"دا هاوڕابووە، ئەوەتا ئیبن تەیمیە دەڵێت:

لەسەردەمی تەتارەکاندا من و چەند هاوەڵێکم بەلای کۆمەڵێکیاندا تێپەڕین کە خەریکی خواردنەوەی مەی و ئارەق بوون، ئەوانەی کە لەگەڵمدابوون کارەکەی ئەوانیان بە خراپ دانا، منیش بۆچوونی هاوەڵەکانم بە خراپ دانا، بۆیە پێم وتن: وازیان لێ بێنن، خودای گەورە کاتێ خواردنەوەی مەی و ئارەقی حەرام کردووە بۆ موسڵمانێکە چونکە لە زیکری خودا و نوێژ لایدەدا و دەبێتە بەربەست لە نێوانیاندا، بەڵام ئەمانە ئەو مەی و ئارەقە دەبێتە بەربەست و ئیتر نایان پەردەژێ خەڵك بکوژن و ماڵ و منداڵی موسڵمانان بە تاڵان بەرن و بیانکەنە کۆیلەی خۆیان.[315]

---

[313]ـ هەمان سەرچاوە.

[314]ـ بڕوانە ـ د. عبد المجيد مطلوب ـ المدخل في التعريف بالفقه الإسلامي ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٢٦٢.

[315]ـ إبن القيم الجوزية ـ أعلام الموقعين ـ جـ٢ ـ ل٥.

دەبینین هاوڕابوونێکی تەواو هەیە لەنێوان بۆچوونی ئیبن تەیمیە و بۆچوونی موعتەزیلەکاندا، تەنانەت ئەو مەرجەی کە لە مەرجی سێهەمدا وەك مەرج دایاننابوو لەگەڵ ئەم ڕیوایەتەدا یەکدەگرێتەوە.

ئیبن قەییم دەڵێت: بۆ ئەوەی خراپەیەك هەڵگریت پێویستە ڕەچاوی چوار پلەبەندی بکەیت: یەکەمیان: کاتێك خراپەیەك لادەبەیت لەجێیدا چاکەیەك دابنێیت، دووەمیان: کاتێك ویستت خراپەیەك لابەریت دەبێت خراپەکە کەمکەیتەوە، ئەگەر چی بەتەواوەتی لانەچووبێت، سێهەمیان: ئەگەر خراپەیەکت لابرد و یەکێکی تر لەبری ئەو هەمان خراپەی دانایەوە، چوارەمیان: خراپەیەکت لابرد و لە بری ئەو خراپەیە خراپترێکیان دانایەوە.

جا پلەبەندی یەکەم و دووەمیان ڕێگەپێدراوە و دروستە، هەرچی پلەبەندی سێهەمیشە هەڵوێستەی پێویستە، بەڵام چوارەمیان حەرامە و ڕێگە پێنەدراوە.[٢١٦]

دەبینین کە موعتەزیلەکان لەم بنەمایەدا لەگەڵ سەلەفیەکاندا هاوڕابوون. ئەوەشمان بینی کە چۆن موعتەزیلەکان لە پێناو ئاینی ئیسلامدا بەرگرییان کرد و هەوڵی بڵاوکردنەوەشیاندا و ڕێگریش بوون لەبەردەم هەر کەسێکدا ویستبێتی ئاینی ئیسلام لە کەدار بکات.[٢١٧]

بێگومان ئەوەشمان بینی کە موعتەزیلە ئینکاری بەنی ئومەییەیان کردووە کە لەجەنگی صفیندا دژ بە عەلی کوڕی ئەبو طالب جەنگاون، بەڵکو تەنانەت ئینکاری خودی عەلیشیان کردووە لەو جەنگەدا، ئەم بۆچوونەشیان بە پەنهانی نەوتووە، بەڵکو بە ئاشکرا و لەنێو دەمسپیانی نێو خەڵکەکەدا وتووە، چونکە

---

[٢١٦] ـ هەمان سەرچاوە ل٤.

[٢١٧] ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.

بڕوایان وابووه كه خۆیان لەسەر حەق و ڕاستین، ئەمەش حاڵی هەر كەسێكه كه خۆی به حەق بزانێت و له لۆمەی لۆمەكەرانیش ناترسێت.

بەم شێوەیه كۆتاییمان به پێنج بنەماكه هێنا كه موعتەزیلەی لەسەر بونیاد نرابوو، ئەوەبوو دواتر ئەم مەزهەبه بووه یەكێك له گرنگترین مەزهەبه كەلامیەكان و لەپاش خۆی كۆمەڵێك كلتوری فیكری و فەلسەفی بۆ به جێ هێشتین كه ناكرێت نادیده بگیرێت.

## • گرنگترین گروپەكانی موعتەزیله: (*)

لەڕاستیدا پیاوانی موعتەزیله لەسەر ئەو پێنج بنەمایەی كه پێشتر خستمانەڕوو ڕێككەوتبوون، بەڵام زۆری نەخایاند موعتەزیلەكان قوڵبوونەوه بەنێو ئەم بنەمایانەدا و زیاتر لێوەی دوان، ئەویش بەپشت بەستن به فەلسەفەی یۆنانیەكان، ئیتر ئەو كاته تێڕوانین و بیروڕا زۆر بوو.[318] بەڵام زۆری بیروڕا و تێڕوانینەكان نەبوویه مایەی ئەوەی كه یەكێك لەم بنەمایانه وەلانێن، ئەگەرچی لەڕووی بەرگریكردن له بنەماكان وەك یەك نەبوون و ڕای جیاوازیان هەبوو، ئەو جیاوازییەش كه هەبوو لەنێوانیاندا له دەرئەنجامەكەیدا نەبوو، بەڵكو جیاوازییەكەیان له پێشەكیەكەیدا بوو - به هۆی ئەم جیاوازییه ڕواڵەتیەی نێوانیانەوه - موعتەزیلەكان دابەشبوون بەسەر چەند گروپێكدا، لێرەدا ئێمەش

---

* بۆ ئاشنابوونی زیاتر سەبارەت به گروپەكانی موعتەزیله - بڕوانه - الملل و النحل للشهرستانی - جـ١ له ل٦٧ تا ل ٩٨٠، یان زهدی جار الله - المعتزلة - له ل١١٣ تا ١٥٧. لەڕاستیدا ئێمەش بۆ قسەكردن لەسەر گروپەكانی موعتەزیله پشتمان بەم سەرچاوانه بەستووه.

[318] - زهدي جار الله - ل١١٣.

باسی گرنگترین گروپەکان دەکەین و بەکورتی لێیانەوە ئەدوێن و زۆر ناچینە نێو وردەکاری گروپەکانەوە، گرنگترینیان بریتی بوون لەم گروپەکانە:

### ١ـ واصلیەکان:

هاوەڵانی ئەبو حوذەیفە "واصلی کوڕی عەطاء"ە ناسراو بە (غزّال الألثغ) لە ساڵی (٨٠ ـ ١٢١ک) ژیاوە، قوتابی حەسەنی بەصری بووە، لە سەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەڕوان و هیشامی کوڕی عەبدولمەلیکدا ژیاوە.[٣١٩]

### ٢ـ عەمرییەکان:

هاوەڵانی عەمری کوڕی بابە لەساڵی (٨٠ ـ ١٤٤ک) ژیاوە،[٣٢٠] یەکێك بووە لە هاوەڵانی واصل و هاوڕاییبوو لە هەموو قسەکانیدا، لە پاش ئەو بووە پێشەوای موعتەزیلەکان.

### ٣ـ هوذەیلیەکان:

هاوەڵانی ئەبو هوذەیلی عەللافە لەساڵی (١٣٥ ـ ٢٢٦ک) ژیاوە،[٣٢١] ئەم مەزهەبەیان لە عوسمانی کوڕی خالید (الطویل)ە وە وەرگرتووە، ئەویش لە واصلی کوڕی عەطائەوە وەریگرتووە. ئەبو هوذەیل شارەزایی باشی هەبووە لە فەلسەفەی یۆنانیدا و هەندێ شتی لێیانەوە وەرگرتووە، لەزۆربەی قسەکانیدا دیاربووە کە کاریگەری زۆری فەلسەفەی یۆنانی لەسەر بووە. یەکێك لە گرنگترین وتەکانی ئەوەیە کە دەڵێ: هەڵس و کەوت و جوڵەی بەهەشتیەکان

---

[٣١٩] ـ بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٨) ی ئەم کتێبە.

[٣٢٠] ـ بڕوانە پەراوێزی ژمارە (١٨)ی ئەم کتێبە.

[٣٢١] ـ بڕوانە پەراوێزی ژمارە (٨٨)ی ئەم کتێبە.

کۆتایی پێ دێت و جوڵەیان نامێنێ و ئەچنە حاڵەتی متبونێکی هەمیشەییەوە، هەموو چێژوو خۆشیەکان کۆدەبێتەوە لە کاتی متبوونەکەدا بۆ ئەهلی بەهەشت، هەموو ئێش و ئازارەکانیش لەو متبوونەدا کۆدەبێتەوە بۆ دۆزەخیەکان. هەروەها بۆچوونیشی سەبارەت بەو بەشەی کە بەشی لێنابێتەوە یان "جەوهەر" کە ئەو تاکەیە کە بەشی لێنابێتەوە.

## ٤ـ نەظامیەکان:

هاوەڵانی ئیبراهیمی کوڕی سەیادی کوڕی هانئ "النَّظَّام"ە کە لەساڵی ٢٣١ کۆچیدا مردووە، زۆرێك لە کتێبەکانی فەلسەفەی خوێندووەتەوە و لەگەڵ قسەکانی موعتەزیلەدا تێکەڵی کردووە، قوتابی ئەبو هوذەیلی عەللاف بووە. لەڕاستیدا "نەظام" پێچەوانەی ڕای "عەللافی" مامۆستای بووە، چونکە ئەو " نەفی ئەو بەشەی کردووە کە بەشی تری لێنابێتەوە" ئەوەبوو لەم بارەوە کتێبێکی دانا و تیایدا ئەوەی وتووە کە دەکرێت بەش دابەش بکرێت بۆ چەند بەشێکی تر.. هەتا هەتایە، هیچ بەشێك نییە ئیلا بەشێکی تری لێ دەبێتەوە، هەموو نیوێکیش نیوێکی دیکەی لێ دەبێتەوە، وە هیچ بەشێکیش نییە بەشێکی تری لێدەبێتەوە. هەروەها یەکێکی تر لە قسەکانی دەڵێ: خودا هەموو بونەوەرانی بەیەکجار دروستکردووە ئەوەی کە ئێستا هەیە لە کانزا و ڕووەك و ئاژەڵ و مرۆڤەکان، ئادەم لە پێش منداڵەکانیەوە دروست نەکراوە، بەڵکو هەموو بوونەوەر پێکەوە دروستکراوە، بەڵام ئەوەندە هەیە هەندێکیانی لەنێو هەندێکیاندا شاردووەتەوە، پێشخستن و دواخستن بەپێی شوێنەکان دەردەکەون، بەڵام لەڕووە شاراوەکەیەوە هەموو پێکەوە دروست بوون بە بێ ئەوەی ببێت یان بێتە بوونەوە.

### ٥- بیشرییەکان:

هاوەلانی بیشری کوڕی موعتەمەرە کە لە سالی ٢١٠ کۆچیدا مردووە، شەهرستانی لەبارەیەوە دەلێ: یەکێك بووە لە باشترین زانایانی موعتەزیلە، ئەو بوو لەبارەی "تولد"ەوە قسەیکرد و هێنایە ئاراوە و زیادەڕۆیشی تێدا کردووە. یەکێك لە وتەکانی ئەوەیە: هەر کەسێك تەوبەی کرد لەسەر گوناهێکی گەورە و دووبارە گەڕایەوە سەر گوناهە گەورەکەی پێشووی، ئەوا خودا سزای گوناهەکەی پێشووتریشی دەدا، چونکە بەو مەرجە تەوبەی لێوەردەگیرێت و سزا نادرێت کە جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەر ئەو گوناهەی کە پێشتر کردوویەتی.

### ٦- ثومامیەکان:

شوێنکەوتەی ثومامەی کوڕی ئەشرەسی نومەیرییە، کە لەسالی ٢١٣ کۆچی مردووە. یەکێك لە وتەکانی ئەوەیە: بێباوەڕ و موشریکەکان لەڕۆژی قیامەتدا دەبنەوە بە گل. ئەو کردەوانەی کە لەسەر دەستیان ئەنجامدراوە کەس خاوەنی نییە چونکە خاوەنەکەی بووە بە گل، ئەوەی کە ئەنجام دەدرێت کردەوەیە وەك تەواوی ئەو شتانەی کە هاتوونەتە بوونەوە.

### ٧- موعەممەرییەکان:

هاوەلانی موعەممەری کوڕی عوبادی سەلمیە. کە لەسالی ٢٢٠ کۆچی مردووە، شەهرستانی پێی وایە کە یەکێکە لەو زانایانەی زۆر بەوردی لەبارەی نەفی سیفەتەکان و قەدەرەوە دواوە. لە یەکێك لە وتەکانیدا دەلێ: خودای

گەورە هیچ شتێکی دروست نەکرووە جگە لە تەنەکان، ئەو شتانەی کە دەبینرێت لە داهێنراوەکانی تەنەکانن، یان ئەوەتا سروشتی خۆی وایە وەك ئاگر کە خۆی لە خۆیدا سوتێنەرە، یان ئەوەتا سەرپشکە وەك زیندەوەرەکان کە لەناو خۆیدا جوڵە دەکات.

### ٨ـ هیشامیەکان:

هاوەڵانی هیشامی کوڕی عەمری قوطیە کە لە ساڵی ٢٢٦ کۆچی مردووە. یەکێك لە وتەکانی دەڵێ: بەهەشت و دۆزەخ ئێستا دروست نەبوون، چونکە چ سودێکی هەیە گەر دروستکرابن لەکاتێکدا هەردووکیشیان کەسی تێدا نەبێت، کێ قازانج یان زیانی پێدەگات گەر ئێستا دروستکرابن. هەروەها دەربارەی مردن دەڵێت: ئیمان مردن دەهێنێت بەسەر کەسەکەدا کە چۆن بمرێت، هەر کەسێك ئیماندار بێت و چاکەکاربێت، بەلاّم لەویستی خودای گەورەدا کەسێکی بێباوەڕبێت با لە دونیاشدا باوەڕدار بێت هەر بە بێباوەڕی دەمرێت، هەر کەسێکیش کە بێباوەڕ و سەرگەردان بێت، بەلاّم لە عیلمی خودادا بە باوەڕداری دەمرێت و دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا، ئێستا کە هێشتا نەمردووە باوەڕدارە. خودا ڕقی دەبێتەوە لەوەی کەسێك بە بێباوەڕی دەمرێت، هاوکات پێشی خۆشە کەسێك لەدنیادا بە باوەڕداری دەمرێت، چونکە عیلم و زانستی خودا گۆڕانکاری بەسەردا نایەت.

### ٩ـ مەرداریەکان:

هاوەڵانی عیسای کوڕی صبیحە کە نازنازی "ئەبو موسا" یەو بە "مەردار" ناسراوە، لەساڵی ٢٢٦ کۆچی مردووە، پێی دەوترا "راهبی موعتەزیلە".

مەردار لەڕووی عەقیدە و بیروباوەڕەوە زۆر دەمارگیری تێدابووە بۆ موعتەزیلە، تەنانەت گەر کەسێك باوەڕی بە عەقیدەی موعتەزیلە نەبوایە کافری دەکرد.

لە یەکێك لە وتەکانیدا دەڵێ: دروستە لە یەککاتدا یەك کردار دوو کەس ئەنجام بدات.

## ١٠ـ جاحظیەکان:

هاوەڵانی عەمری کوڕی بەحر ئەبو ئەبو عوسمان "الجاحظ"ە کە لەساڵی ٢٥٥ کۆچی مردووە، شەهرستانی لە بارەیەوە وتویەتی: یەکێك بووە لە گەورە پیاوانی موعتەزیلە، نوسەر و دانەری کتێبەکانیان بووە، زۆربەی کتێبە فەلسەفیەکانی خوێندووەتەوە و تێکەڵی نوسینەکانی کردووە بە دەستەواژەی زۆر جوان و ناسك، لە سەردەمی " موعتەصەم و متوکل "دا ژیاوە.

جاحظ صەد و حەفتا و ئەوەندە کتێبی هەبووە، بەناوبانگترینیان: "الحیوان، البخلاء، البیان و التبیین، رسائل الجاحظ".

هەندێك لە وتەکانی: خەڵکی دۆزەخ بە هەمیشەیی لە ئاگردا نامێننەوە و سزا نادرێن، بەڵکو خۆشیان وەك ئاگریان لێ دێت و سروشتیان وەك سروشتی ئاگرەکەی لێدێت و هەست بە ئازار ناکەن، ئاگر هاوشێوەی خۆی ڕادەکێشێت بۆ خۆی، بە بێ ئەوەی هیچ یەکێکیان بچێتە ناو ئەوی تریانەوە و بتوێتەوە. هەروەها دەڵێ: تەواوی دروستکراوەکان ئاقڵ و ژیرن زانان بە وەی کە خودای گەورە وەدیهێنەریانە و دەشزانن کە پێویستیان بە پێغەمبەرە (درودی خودای لێبێت) و پێویستیان بەوە هەیە کە شارەزایی زیاتر پەیدا بکەن.

## ١١ـ خیاطیەکان:

هاوەڵانی ئەبولحوسەین کوڕی عەمر "الخیاط"ە کە لەساڵی ٣٠٠ کۆچی مردووە، دانەری کتێبی " الإنتصار و الرد علی إبن الراوندي الملحد"ە. "خەیاط" وتویەتی: نەبوو شتە، ئەو شتەی نییە هەیە بۆیە باسی لێوە دەکرێ، ئەوەتا دەڵێ: شت ئەوەیە نەیزانیت و هەواڵت لەسەری هەبێت، "جەوهەر"یش کە نابینرێت لە نەبووندا هەر "جەوهەرە" و بوونی هەیە، شتە بووەکان و دیارەکانیش لە نەبوونیشدا هەر بوونی هەیە، نەبوو لەکاتی نەبوونیدا شتێکە، جیاوازی لەنێوان بوون و نەبووندا لە سیفەتی بوونی شتەکەدایە، کاتێك شتێك هاتە بوون ئەوە هەبووە، کاتێکیش نەماو فەوتا ئەوە نەبووە.

بەم شێوەیە کۆتاییمان هێنا بە خستنەڕووی گرنگترین گروپ و کەسە ناودارەکانی موعتەزیلە.

# پێشەکی

ئەو کەسە خەیاڵ دەکات هەوڵی ئەوە بدات دین لە سیاسەت جیابکاتەوە، هەر سیاسیەك جا ئایا ڕاوێژکارە یان بڕیار بە دەستە ـ بڕوایان وایە کە دین و سیاسەت دوو شتی جیاوازە ـ هەمیشە بە خەیاڵی خۆیان وامان پیشان دەدەن کە هەرچی کێشەیەکی سیاسی هەیە کە دەیانەوێت چارەسەری بکەن یان بڕیارێکی لەبارەوە بدەن، کێشەیەکی سەربەخۆیە و لە دوور یان نزیك پەیوەندی بە ئاینەوە نییە، بەڵام بە تەواوی متمانەوە ئەم داڕنینەی دینە لەسیاسەت، داڕنینێکی زیادەڕەوی و ساختەکارییە، چونکە دین ڕەگو ڕیشەی زۆر لە مێژە، قوڵە، فرەیە، بۆیە زۆر ناڕەحەتە یان ـ هەر ئەستەمە ـ کەسێك بتوانێت ڕیشەکێشی بکات، هەر بۆیە ئەو ڕەگە زۆرانە وا دەکات پەل بکێشێت و بڕیار بدات لەهەموو بڕیارە سیاسیەکاندا، دیارترین نموونەش لەم سەردەمەی خۆماندا کە پیایدا گوزەر دەکەین سیاسەتی ئەمریکی ڕۆژئاوایی مەسیحیە کە " لەبەرامبەر ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستی موسڵمان "دا پەیڕەوی دەکات بەشێوەیەکی تایبەتی و بەشێوەیەکی گشتیش بەرامبەر بە "ئاینی ئیسلام"، جا گەر ئامانجی ئاشکرا لە سیاسەتیاندا لەبەرامبەر ئەم ناوچانەدا بریتی بووە لەوەی کە نابێت چەکی کۆکوش لەم ناوچانەدا هەبێت و ناوچەیەکی ئارام بێت، بەڵام ئامانجی

"ئاینی" كه شاراوەیه خۆی لەوەدا دەبینێتەوه كه نابێت هیچ جۆره كۆبوونەوەیەكی ئیسلامی بەهێز لەم ناوچانەدا دروست ببێت.

جا ئەم پێكەوەبوونەی دین و سیاسەته وای له موعتەزیله كرد، كه نەتوانێ خۆی لێ قوتار بكات، سەرەڕای ئەوەی كه سەرهەڵدانی موعتەزیله بۆ خۆی سەرهەڵدانێكی دینی ڕووت بوو، ئەوه نەبووه كه له دایكبووی ئاریشەیەكی سیاسی دیاریكراو بێت، به پێچەوانەی شیعه و خەواریجەكانەوه، بۆیه ئەوەی كه ڕوون و ئاشكرایه ڕاوبۆچوونه دینیەكانی ئەمان كاردانەوەی لەسەر زۆر كەیسی گەورە گەورەی سیاسی هەبووه، كه هەندێكیان هەر لەگەڵیدا نەژیاون، بەڵام لێیەوه نزیك بوون، ئەوەتا دەبینین لەبارەی كەسێك كه گوناهی گەورەی ئەنجام داوه بڕیاری ئەوەی بۆ دەدەن نه ئیمانداری تەواوه نه بێباوەڕی تەواو، بەڵكو له شوێنێكدایه لەنێوان دوو شوێندا، ئەمەش بۆ خۆی كاردانەوەی هەبوو لەسەر حوكمدان له بارەی هەر یەك لەوانەی بەشداربوون له فیتنەكەدا، بۆیه لەو مەسەلەدا ڕاوبۆچوونی خۆیان هەبووه سەبارەت به خەلیفه عوسمان (ڕەزای خودای لێ بێت) و بكوژەكانی، هەروەها لەبارەی هەر یەك لەبەشداربوانی هەردوو جەنگی (جەمەل و صیفین) كه پێیان وابووه ئەوانه نەباوەڕداری تەواون وه نه بێباوەڕی تەواو، بەڵكو لەشوێنێكدان لەنێوان دوو شوێندا، موعتەزیله تەنها بەمەش نەوەستا، تەنانەت هەندێكیان بەڕوونی بۆچوونی خۆی دەربڕیوه سەبارەت به هەندێ هاوەڵ (خودایان لێ ڕازی بێت)، هەندێكیشیان بۆچوونی خۆی سەبارەت به "ئیمامەت" خستووەته ڕوو ئەمه لەلایەك، لەلایەكی ترەوه بینیمان كه موعتەزیله لەڕێگەی دەسەڵاتی سیاسیەوه كاتێك كه پەیوەندیان لەگەڵ دەسەڵاتدا گرێدا له سەردەمی "خەلیفه مەئمون و موعتەصەم و واثیق"دا و بەهێزبوون، هەوڵی بڵاوكردنەوەی ڕێنماییەكانی

موعتەزیلەشیان دا، ئەمەش کە لە کتێبە مێژووییەکاندا بە ئاشکرا دیارە بەناوی میحنەتی خەلقی قورئان.

بەڵام، لەگەڵ ئەوەی کە تێکەڵبوون بە کایەی سیاسی، بەڵام ئامانجیان ئەوە نەبوو کە دەست بەسەر کاروباری دەوڵەتدا بگرن، بەڵکو ئامانجی بەرزیان بریتی بوو لە بلاّوکردنەوەی ڕێنماییەکانی موعتەزیلە لەوەی کە دەیانووت و پێیان وابوو کە ئەوە ڕاستە، بۆیە تەنها بەرگرییان لەوە دەکرد، ئێستاش بە درێژی باس لەهەموو ئەو ڕووداوانە دەکەین.

- ## بۆچوونی موعتەزیلە بەرامبەر بەوانەی لە ئاشوب و فیتنەکەدا تێوەگلابوون:

دەبینین کاتێ کە موعتەزیلە ئەم بیروبۆچوونەی وت "شوێنێك لەنێوان دوو شوێندا" ئەگەر چی چارەسەری گرفتێکی ئاینی پێکرد، بەلاّم ئەمە دەرئەنجامی کاریگەرییەکی سیاسی بوو، وەك خەواریج و مورجیئەکان، ئەوەبوو خەواریجەکان هەموو ئەو کەسانەیان کافر و بێباوەڕ کرد کە خاوەنی گوناهی گەورە بوون، بۆیە پێیان وابوو هەر یەك لە خەلیفە عوسمان و عەلی و موعاویە، تەنانەت تەواوی خەلیفەکانی بەنی ئومەییە کافر و بێباوەڕن، بەلاّم مورجیئەکان وتیان ئەو کەسەی خاوەنی گوناهی گەورەیە بڕوادارە، بۆیە وتیان هەموو ئەوانەی لە فیتنە و ئاشووبەکەدا تێوە گلابوون بڕوادارن، تەنانەت خەلیفەکانی بەنی ئومەییەش ئەگەر چی گوناهی گەورەشیان ئەنجام دابێت، بۆیە پێیان وابوو تاوان هیچ زیانێك بە باوەڕ ناگەیەنێت، ئەوەبوو جەنگ لەنێوان عەلی و خەواریجدا هەڵگیرسا و پاش ئەویش لەنێوان خەواریج و ئومەوییەکاندا هەڵگیرسا و کۆتایی پێ نە ئەهات، چونکە ڕوانینی خەواریجەکان

بۆ ئەوان وابووە کە هەموو ئەوانە کافرن و خیلافەتەکەشیان بە تاڵە. بەڵام مورجیئە بە پێچەوانەوە لەگەڵ دەسەڵاتدا دەست و پەنجەیان نەرمکرد و تەنانەت پشتگیری دەسەڵاتی سیاسیشیان کرد، پێیان وابوو ئەوان کەسانی بڕوادارن و خیلافەتەکەشیان دروستە.[322] هەرچی موعتەزیلەشە ئەوا پێی وابوو ئەو کەسەی خاوەنی گوناهی گەورەیە نە بڕواداری تەواوە، وە نەبێباوەڕی تەواویشە، بەڵکو فاسیقە، ئەحمەد ئەمین دەڵێ: ئەم بۆچوونەی موعتەزیلە کە پێی وایە نە بڕوادارە و نە کافر دەرئەنجامی مەترسیدار دەدات بەدەستەوە، هەروەك هەر دوو بۆچوونەکەی پێشوو - مەبەستی بۆچوونی خەواریج و مورجیئەکانە - لە ڕاستیدا موعتەزیلە ناچاربوو ئەم بۆچوونە جێبەجێ بکات بەسەر هەموو ئەوانەی کە تێوەگلابوون لە ئاشووب و فیتنەکەدا، لەو کاتەی کە جیاوازی کەوتە نێوان موسڵمانەکانەوە، کام یەکێك لەو تاقمە هەڵەبوون خەلیفە عوسمان یان بکوژەکانی؟ ئایا لە جەنگی "جەمەل"دا عەلی لەسەر حەق بووە یان خاتوو عائیشە؟ چۆن بڕیار لەسەر ئەو کەسانە بدەین کە جەنگی "صیفین"یان بەڕێوە دەبرد؟ کامیان گوناهی گەورەی کردووە؟ کامیان وەك فاسیق هەژمار دەکرێت؟[323]

پرسیار گەلێکی زۆر بە هۆش و بیری موعتەزیلەدا دەهات و دەچوو، زۆر بەڕاشکاوانە و بەوپەڕی بوێرییەوە وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەیان دایەوە، واصل پێی وابوو هاوەڵانی هەردوو جەنگی "جەمەل" و "صیفین"، یەکێکیان

---

[322]- بڕوانە - الشهرستاني - الملل و النحل - ل١٣٠، ١٣١، یان: أحمد أمین - فجر الإسلام - ل٤٦١- ٤٦٢- ٤٦٣.

[323]- فجر الإسلام - ل٤٦٥. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە دانەر - الشیعة النشأة السیاسیة و العقیدة الدینیة.

هەڵە بووە و فاسیقە ـ لەدین دەرچووە ـ بەڵام بە دیاریکراوی هیچ یەکێکیانی دیارینەکرد، هەروەها لەبارەی خەلیفە عوسمان و ئەوانەی کە کوشتیان و زەلیلیان کرد هەمان بۆچوونی هەبوو، پێی وابووە یەکێکیان فاسیقە هیچ گومانێکی تێدا نییە، وەك چۆن یەکێك لەو دوو کەسەی کە سوێند دەخۆن بۆ پاکانەی خۆیان نەفرینیان لێکراوە و فاسیقە و هیچ گومانێکی تێدا نییە، بەڵام هیچ یەکێك لەوانی دیاری نەکرد، ئینجا دێت فاسیق بوون دەداتە پاڵ ئەو کەسەی سوێندەکەی خواردووە بۆ پاکانەی خۆی و پێی وایە کەمترین پلەی هەردوو لا ئەوەیە شایەتیان لێوەرناگیرێت، هەروەك چۆن شایەتی هیچ یەکێك لەو دوو سوێند خۆرە وەرناگیرێت.[٣٢٤]

بەڵام عەمری کوڕی عوبێد زۆر لە واصل زیاتر ڕۆچووە لەم مەسەلەدا، بۆیە هەر دوو دەستەکە بەفاسیق و لە دین دەرچوو ناو دەبات، هەروەها پێشی وایە هیچ یەکێك لەوانە شایەتیان لێوەرناگیرێت..[٣٢٥]

جا بە پێی بۆچوونەکەی واصل، موعاویە و بەنی ئومەییە بۆی هەیە فاسیق بن و بۆیشی هەیە فاسیق نەبن، بۆیە تا ڕادەیەك بۆچوونەکەی جۆرێك لە بێلایەنی پێوە دیار بووە، چونکە دەسەڵاتی ئەو کاتەی پێ لەکەدار دەبوو، بەڵام سەبارەت بە بۆچوونەکەی عەمری کوڕی عوبێد، ئەوا موعاویە و بەنی ئومەییەی بە فاسیق ناوزەدکردووە، هاوکات عەلی و هاوەڵەکانیشی بە هەمان شێوە بە فاسیق ناوزەدکردووە، بۆیە بۆچوونەکەی زۆر توند بووە لەسەریان، باشە ئەی ئێمە ئێستا لە کوێی ئەم بوێریەداین؟!

---

[٣٢٤] ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٦٩.

[٣٢٥] ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو ـ ل٧٠.

قازی عەبدولجەبار لەبارەی موعاویەوە دەڵێ: (.. ئەبو عەلی "ڕەحمەتی خودای لێبێت" وتویەتی یەکەمین کەس کە لە بارەی جەبرەوە بە ئاشکرا قسەی کردبێ موعاویە بووە - واتە پێی وابووە مرۆڤ هیچی بەدەست نییە و هەموو کردەوەکانی خودا پێی دەکات - بۆیە وتی ئەوەی کە هاتووەتە پێش خودا هێناویەتی، بۆ ئەوەی پاکانە بۆ دەسەڵاتەکەی خۆی بکات و وای پیشان بدات کە خۆی ڕاست دەکات و پێکاویەتی. بۆیە وتی خودا منی کردووە بە ئیمام و پێشەواو کاروبارەکەی ڕا دەست کردووم. ئیتر ئەم قسەیە بڵاوەی کرد و تەواوی پادشاکانی بەنی ئومەییە ئەم قسەیان دەوتەوە).[٣٢٦]

ئەمەش ڕەخنەیەکی زۆر توند ترە کە دەیداتە پاڵ موعاویە و بەنی ئومەییە، بۆیە ئەوان بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە ناچارن هەموو ئەو کارانە بکەن، چونکە هیچی بەدەست خۆیان نییە و هەموو ئەوەی کە دەیکەن لە کردەوە و تاوانی گەورە خودا پێیانی دەکات، ئەمەش بۆ پاکانەکردنی خۆیان بوو لەهەر خراپەیەك کە ئەنجامیان دەدا، بەڵام قسەیەکی وەکو ئەمە هیچ کات هۆکارەکەی شاراوە نییە لای کەسە ژیرەکانی موعتەزیلە.

بەم شێوەیە بڕیاردان لەسەر ئەو کەسانەی کە گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن، یەکێك بوو لەو ڕێگایانەی کە وایکرد موعتەزیلە بچێتە ناو شتە شاراوەکانی سیاسەتەوە، دوای ئەوەش بۆچوونیان لەمەسەلەی ئیمامەتدا خستەڕوو.

---

[٣٢٦] ـ القاضي عبد الجبار ـ المغني ـ جـ٨ ـ ل٤.

* **بۆچوونی موعتەزیلە سەبارەت بە ئیمامەت:**

لێرەدا ئیمامەت مەبەست پێی سەرۆکایەتیکردنی دەوڵەتی ئیسلامیە، سەبارەت بە سروشتی ئیمامەت ماوەردی دەڵێ: (ئیمامەت بۆ ئەوە دانراوە تا ئەو کەسە لە جێگەی پێغەمبەر دابنیشێ، ئەویش لەپێناو دوو شتدا: پارێزگاریکردن لە دینی خودا و بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی دونیا).[٣٢٧] لەڕاستیدا موسڵمانان سەبارەت بە ئیمامەت ڕای جیاوازیان هەیە، جیاوازی سەرەکیش لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە چۆن ئیمامەت دادەمەزرێت، ئایا ئەو مەرجانە کامانەن کە دەبێت لە ئیمامەتدا بێتە دی، بەشێوەیەکی تایبەتیش مەرجی نەسەب و ڕەچەڵەکە، ئایا دەبێت ئەو ئیمامەتە لە چ ڕەچەڵەکێك بێت.

شەهرستانی پوختەی جیاوازی گروپە ئیسلامیەکان لەبارەی ئیمامەتەوە دەخاتە ڕوو دەڵێ: (جیاوازی نێوان موسڵمانان لە بارەی ئیمامەتەوە لەدوو ڕووەوەیە:

یەکەمیان: ئیمامەت لەڕێگەی هەڵبژاردن و ڕێککەوتنەوە تەسپیت دەبێت.

دووەمیان: لەڕێگەی دەقێك یان لەڕێگەی دانانەوە تەسپیت دەبێت.

ئەوەی کە دەڵێ ئیمامەت بەڕێککەوتن و هەڵبژاردن تەسپیت دەبێت، دەڵێ هەر کەس ئوممەت لەسەری ڕێککەوت ئەوە دەبێتە ئیمام، یان لەلایەن کۆمەڵێکی دیار و دەم سپی دان پێدانراوی نێو ئوممەتەوە دیاریکرا ئەوە دەبێتە ئیمام، یان بە شێوەیەکی ڕەها دادەنرێ، واتە بەبێ هیچ جۆرە نەسەب و ڕەچەڵەکێکی دیاریکراو ـ یان بەو مەرجەی دەبێت کەسەکە قورەیشی بێت،

---

[٣٢٧] ـ مختصر الأحكام السلطانية ـ للماوردي ـ مع ترجمة فرنسية لفقراته ـ د. محمد شتا ـ ل٦ ـ دار النهضة العربية ـ ١٤١٤ك ـ ١٩٩٣م.

ئەمە بە پێی بۆچوونی هەندێك، بە پێی بۆچوونی هەندێکی تریش دەبێت کەسەکە لەنەوەی هاشم بێت.

ئەوانەشی کە دەڵێن ئیمامەت دەبێت بە دەقێك دیاری بکرێت، لەپاش عەلی (خودای لێ ڕازی بێت) ڕای جیاوازیان تێدا دروستبوو، وە بەئەندازەی جیاوازیەکانیشیان گروپ و تاقمیان لێ پەیدابوو.[٣٢٨]

پێش ئەوەی بۆچوونی موعتەزیلە لەبارەی ئیمامەتەوە بخەینەڕوو، دەبێت ئاماژە بەوە بکەین کە ئیمامەت لەڕووی ئەقڵ و شەرعەوە واجبە، ئیبن تەیمیەش ئەم "واجب" بوونەی کورتکردووەتەوە و دەڵێ: (پێویستە ئەوە بزانرێت کە بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵکی یەکێکە لەگەورەترین ئەرکەکانی دین، بەڵکو دینیش دانامەزرێت گەر ئیمامەت نەبێت، بۆیە ئادەمیزاد بەرژەوەندیان لەوەدایە پێکەوە کۆببنەوە، بۆ ئەم کۆبوونەوەیەش دەبێت کەسێك سەروکاریان بکات و کارەکانیان بۆ ببات بەڕێوە، تەنانەت پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) دەفەرموێت: (گەر سێکەستان پێکەوە چوون بۆ گەشتێك با کەسێکتان بێتە ئەمیر بۆ ئەوەی کاروبارەکانتان ڕاپەڕێنێت)، پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) بۆ کارێکی کەم یان بۆ گەشتێکی کورت بە واجبی داناوە یەکێك لەو چەند کەسە کەمە کە کۆبوونەتەوە یەکێکیان ببێتە ئەمیریان، ئەمەش ئاگادارکردنەوەیەکە بۆ تەواوی کۆبوونەوەکان تا کەسێك کاروبارەکانیان بۆ ببات بەڕێوە، چونکە خودا بە واجبی داناوە فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە بکرێت، ئەمەش نایەتە دی گەر هێز و دەوڵەتێکت نەبێ، هەروەها بۆ تەواوی ئەرکەکانی تری وەك جیهاد و دادپەروەری و پاراستنی

---

[٣٢٨] ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٤٥.

سنوورەکانی خودا، دەبێت هێز یان ئەمیرێك هەبێت تا کاروبارەکانیان ڕاپەڕێنێت).[329]

قازی عەبدولجەبار هاوڕایە لەگەڵ بۆچوونەکەی ئیبن تەیمیەدا و دەڵێ: (لەڕاستیدا ئیمامەت پەیوەستە بە مەسەلەی فەرمان بەچاکە و بەرگریکردن لەخراپە، لەو ڕووەی کە پەیوەستە پێیەوە ئەوەیە زۆربەی فەرمان بە چاکە و بەرگریکردن لە خراپە بە ئیمامەت نەبێ نایەتە دی. شتێکی بۆ زیاد دەکات و دەڵێ: ئیمام پێوستی پێیەتی، چونکە زۆربەی ئەحکامە شەرعیەکان بەو دەکرێت، وەك جێبەجێکردنی حەدەکان و پاراستنی شار و بەهێزکردنی سنوورەکان و ئامادەکردنی سوپا و .. لەگەڵ هەموو ئەو شتانەی کە پەیوەستن بەم مەسەلەیەوە).[330]

سەبارەت بە دانانی ئیمامەت، هەندێ لەموعتەزیلەکان پێیان وایە ئیمامەت دانامەزرێت گەر بە دەقێك یان لەڕێگەی دامەزراندنەوە نەبێ، ئەم بۆچوونەش بۆچوونی "نەظامە"، بەلاّم زۆربەی موعتەزیلەکان و ئەهلی سوننە وای بۆ دەچن کە ئیمامەت دەبێت لەڕێگەی هەڵبژاردنەوە دیاری بکرێت، پێیان وایە ئەو کەسەی کە دەبێتە ئیمام دەبێت قورەیشی بێت، بۆیە کاتێك ئەبو بەکر لەنێو موهاجیر و ئەنصارەکەندا وتی: ئیمام دەبێت لە قورەیشیەکان بێت، کەس نکۆڵی نەکرد لە سەری.[331]

---

[329] - إبن تيمية - السياسة الشرعية في إصلاح الراعي والرعية - ل١١٤- دار المنهاج - ١٤٢٣ك - ٢٠٠٢م.

[330] - شرح الأصول الخمسة - ل٧٤٩ - ٧٥٠.

[331] - بڕوانە - الشهرستاني - الملل و النحل - جـ١ - ل٧٤، ٧٩، یان بڕوانە - القاضي عبد الجبار - شرح الأصول الخمسة - ل٧٥٣ ، ٧٥٤.

بەڵام سەبارەت بەو مەرجانەی کە پێویستە لەئیمامەتدا هەبێت، هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ئەهلی سوننەتدا نییە.

- **میحنەتی خەلقی قورئان:**

باسی ئەوەمان کرد کە موعتەزیلە بۆ پارێزگاریکردن لە یەکێك لە بنەماکانیان کە "تەوحید"ە وتیان قورئان مەخلوقە و دروستکراوە، بۆیە وتەی "خەلقی قورئان " بە بەناوبانگترین و دیارترین وتە دادەنرێت کە موعتەزیلەکان وتبێتیان، ئەم وتەیەش لە زۆربەی کتێبە مێژووییەکاندا بلاوبوویەوە، تەنانەت هەندێك ناولێنانی زانستی کەلام دەگێڕنەوە بۆ ئەم ناوە، چونکە زۆربەی مەسەلەکان تیایدا باس لە کەلامی خودا دەکات، ناوبانگی ئەم ناوەش لەکاتێکدا بوو کە موعتەزیلەکان لە ڕێگەی دەسەلاتی سیاسیەوە هەوڵی بلاوکردنەوەی ئەم وتەیان دەدا، ئەوەبوو لەڕێگەی ئەشکەنجەوە بگرە کوشتنیشەوە خەڵکیان لەسەر ئەم وتەیە دەجولاند بۆ ئەوەی بڵێن قورئان مەخلوقە، ئیتر ئەو خەڵکە سەبارەت بەو ڕووداوانەی کە ڕوویاندەدا، ناویان لێنان میحنەت ـ تاقیکردنەوە ـ میحنەتی خەلقی قورئانیش بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕی، کە بە سەردەمی خەلیفە مەئمون دەستی پێکرد و بە سەردەمی

---

* ناوی عەبدوڵلایە ناسراو بە ئەبولعەبباسی کوڕی ڕەشید، لە ساڵی ١٧٠ کۆچی لەدایکبووە ـ لەساڵی ١٩٨ کۆچی بووە بە خەلیفە و لە ساڵی ٢١٨ کۆچی مردووە، بڕوانە ـ السيوطي ـ تأريخ الخلفاء ـ ل٢٦٤، إبن حيان: ـ السيرة النبوية و أخبار الخلفاء ـ ل٢٣٩.

خەلیفە "متوەکیل"یش دوایی هات و پووکایەوە، لەمەودوا بە پێی ڕیزبەندی سەردەمی خەلیفەکان باس لەم قۆناغانە دەکەین.

## أ- میحنەت لەسەردەمی مەئموندا: (*)

مەئمون لە فیقهو زمانی عەرەبیدا کەسێکی زۆر شارەزا و لێهاتوو بووە، کاتێك کە تەمەنی گەورە بوو گرنگیدا بە کتێبەکانی فەلسەفە و زانستەکانی زانایانی پێشین و تیایاندا شارەزایی باشی پەیدا کرد، لەنێو هەموو خەلیفەکانی عەبباسیشدا باشترینی خەلیفە بووە لە ڕووی زانستەوە، بە جۆرێك لەپاش ئەو هیچ یەکێك لە خەلیفەکانی عەبباسی کە دەسەلاتیان گرتووەتە دەست لەو زاناتر نەبووە، بەوە ناسرا بوو کە کەسێکی شیعەیە و مەیلی بەلای ئەواندا هەیە، ئەمەش وایلێکرد کە موئتەمەنی برای لا ببات و لە جێی ئەو عەلی ڕەزای کوڕی موسای کاظمی کوڕی جەعفەری صادق بکاتە جێنیشینی خۆی، تەنانەت دراویشی بەناوی ئەوەوە لێدا و کچەکەی خۆیشی لێ مارەکرد، تا ئەوەبوو عەبباسیەکان هاتن و لێی ڕاپەڕین، بەلاّم عەلی ڕەزا پێش ئەو کاتە مرد بوو.[٣٣٢] مەئمون بە هۆی ئەوەی حەزی لە فەلسەفە بووە سەر قالّی ئەو زانستە ببوو، سەرباری ئەو پەیوەندییە باشەی کە لەگەلّ ثومامەی کوڕی ئەشرەسدا هەیبوو،[٣٣٣] وایکرد کە ببیت بە هەلگری بیری موعتەزیلە و هەولّی بلاّوکردنەوەی بنەماکانیشی بدات. کاتێك کە بۆچوونی خەلقی قورئانیش ئەنجامی یەك لەدوای یەکی لەسەر گرنگترین بنەماکانی موعتەزیلە پەیدا کرد، مەئمون هەولّی بلاّوکردنەوەیدا، هەموو کتێبە مێژووییەکانیش لەسەر ئەوە کۆکن کە "

---

[٣٣٢]- تأريخ الخلفاء للسيوطي - ل٣٦٤، ٣٦٥.

[٣٣٣]- الشهرستاني - الملل و النحل - جـ١ - ل٨٢.

ئەحمەدی کوڕی ئەبو دوئادی موعتەزیلی " (١٤٠ ـ ١٦٠ك) هانی مەئمونیداوە بۆ ئەوەی خەڵك تاقی بکاتەوە و تووشی ئەو میحنەتەیان بکات، ئەوەبوو لەڕێگەی "یەحیای کوڕی ئەکثەمەوە" پەیوەندی بە مەئمونەوە کرد و لە زۆربەی مەجلیسەکانی مەئمونیشدا ئامادە بووە، مەئمونیش زۆر سەرسامبوو بە قسەی جوان و ژیرییەکەی، بۆ ئەم مەبەستە لە خۆیی نزیککردەوە، تا وای لێهات بووە کەسێکی خاوەن پێگە لە دەسەلاتدا، تەنانەت لە سەردەمی موعتەصیمیشدا "ئیبن ئەبی دوئاد" پۆستی سەرۆکی قازییەکان وەردەگرێت و هێندەی تر دەسەلات و پێگەی فراوان بوو.[٣٣٤]

لە ساڵی ٢١٢ کۆچی مەئمون مەسەلەی خەلقی قورئانی ئاشکرا کرد، لە ساڵی ٢١٨ کۆچیشدا خەڵکی لەسەر مەسەلەی خەلقی قورئان تاقیکردەوە.[٣٣٥] هەر لەو ساڵەدا نامەی بۆ کاربەدەستەکەی نوسی لە بەغداد کە ناوی "ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمی خوزاعی" بوو هاوکات کوڕە مامی طاهیری کوڕی حوسەین بوو بۆ ئەوەی تاقیکردنەوەی زانایان بکات، لە نامەکەیدا هاتبوو: (لەڕاستیدا ئەمیری باوەڕداران ئاگادارە کە زۆربەی زۆری ئەم خەڵکە لەوەی کە ژێر دەستەی ئێمەیە و ـ لەوەی کە خەڵکی بازاڕییە ـ ئەوانەی کە نەزانن و خاوەنی هیچ بۆچوون و وێنایەك نین و توانای پیشاندانی ئەوەیان نییە کە بتوانن تروسکاییەك لەزانست پەیدا بکەن، ئەوانە نەفامن بەرامبەر بە خودا، کوێر و گومڕان لە ئاست زانینی حەقیقەتی دینەکەیاندا، کەمتەرخەمن لەبەرامبەر ئەوەدا کە حەقی خودای گەورە بدەن و بەرز ڕایگرن، یان بیناسن وەك ئەوەی کە شایەنی ناسینی بێت و لە نێوان خالق و دروستکراوەکانیدا

---

[٣٣٤] ـ إبن خلكان ـ وفيات الأعيان ـ جـ١ ـ ل٦٦.

[٣٣٥] ـ السيوطي ـ تأريخ الخلفاء ـ ل٣٦٦، ٣٦٧.

جیاوازی بکەن، وەك ئەوەی کە لە نێوان خودای گەورە و ئەوەی خودای گەورە هێناویەتیە خوارەوە وەك یەك لێکردووە، وایاندانەوە کە قورئان قەدیمە و خودا خەڵقی نەکردووە و وەدی نەهێناوە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾.[٢٣٦] واتە: (بێگومان ئێمە کردمان بەشێوە زمانی عەرەبی). بۆیە هەرچی خودا بە (جَعل) لە قورئاندا هێنابێتی، واتە دروستیکردووە، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَجَعَلَ ٱلظُّلُمَٰتِ وَٱلنُّورَ﴾.[٢٣٧] واتە: (تاریکاییەکان و ڕووناکیشی داهێنا). یان لەشوێنێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ﴾.[٢٣٨] واتە: (ئا بەو شێوەیە هەواڵ و داستانی "موسا"ت بۆ باس دەکەین، هەواڵ و داستانی گەلانی پێشینت ـ یەك لە دوای یەك ـ بۆ باس دەکەین). خودا هەواڵیداوە ئەمانە چیرۆك و بەسەرهاتی کاروبارێکن کە خوای گەورە دواتر هێناونیەتە بوون، یان دەفەرموێت: ﴿أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ﴾.[٢٣٩] واتە: (ئەم ئایەتەی کە لەلایەن خوداوە هاتووەتە خوارەوە پوخت و ڕێك و پێکن و هیچ دەستکارییەك ناکرێن، پاشان هەر لەلایەن خودای کاربەدەست بە جوانی حەڵاڵ و حەرامەکانی شیکراونەتەوە). لای موعتەزیلە "مُحکم کتابە و مفصلە" واتە: "خودا دروستکەر و وەدیهێنەریەتی" دواتر خۆیان بە ئەهلی سوننەت لە قەڵمداوە و وا خۆیان پیشانداوە کە ئەهلی حەق و

---

[٢٣٦] ـ سورەتی: ـ الزخرف ـ ئایەتی ٣.

[٢٣٧] ـ سورەتی: ـ الأنعام ـ ئایەتی ١.

[٢٣٨] ـ سورەتی: ـ طه ـ ئایەتی ٩٩.

[٢٣٩] ـ سورەتی: ـ هود ـ ئایەتی ١.

جەماعەتن، جگە لەخۆیان هەموو ئەهلی کوفر و خراپەن، لەمەدا زۆر لەسەری ڕۆشتن تا بەهۆیەوە خەڵکێکی نەزانیان پێ لە خشتە برد، ئیتر خەڵکێك کە لە ڕواڵەتدا دیندار بوون پێیان ڕازیبوون و پشتیان لە حەق کرد و شوێن ڕێگە هەڵەکەی ئەوان کەوتن و لەڕێگەی خودا لایاندا و کەلەبەرێکیان بۆ خۆیان دۆزییەوە و چوونە نێو گومڕاییەوە، تا ئەوەی لەنامەکەدا هاتووە دەڵێ: ئەمیری باوەڕداران پێی وایە ئەوانە خراپترینی ئەم ئوممەتەن و کەمترین پشکیان هەیە لە یەکتاپەرستیدا، ئەوانە تورەکەی جەهل و نەفامەکانن و بوونەتە مەشخەڵی درۆزنەکان، بوونە زمانحاڵی ئیبلیس بەسەر دۆستەکانیانەوە و بوونە شتێکی گەورەش بەسەر دوژمنەکانی ئیبلیسەوە، پێیان وایە غەیری خۆیان کوێرن و گومڕاترین ڕێبازیان هەیە، سوێند بە تەمەنی ئەمیری باوەڕداران، درۆزنترینی خەڵك ئەوانەن کە درۆ بەدەمی خودا و وەحیی خوداوە دەکەن، شورەی بەتاڵن، بە ڕاستی خودایان بە حەق نەناسیووە، بۆیە قازییەکان لای خۆت کۆکەرەوە و نامەکەی منیان بەسەردا بخوێنەرەوە، تاقیان بکەرەوە بزانە چی دەڵێن و ڕووی ڕاستەقینەی بیروباوەڕیان سەبارەت بە خەلقی قورئان ئاشکرا بکە، تێیان بگەیەنە لەم کارەدا پشت بە کەس نابەستێ، متمانە بە کەسیش ناکرێ گەر متمانە بە دینەکەی نەکرێ، گەر هاتوو بەمە ڕازیبوون بە دەق شاهیدیان لەسەر بگرە بە ئامادەبوونی ئەوانەی کە لەوێدان، بزانە چۆن دەڕواننە قورئان، واز لە شایەتی ئەوانە بهێنە کە دانیان نەناوە بەوەی قورئان مەخلوقە، ئەوجا لەبارەی هەموو ئەو قازیانەی دێنە لات لە نامەیەکدا ئاگادارم کەرەوە، ئەو قازییانەش کە ئیش و کاری تۆ دەبەن بەڕێوە لەم مەسەلەدا لێیان بپرسە و هەمان فەرمانیان بەسەردا جێبەجێ بکە).[٢٤٠]

---

[٢٤٠] ـ السیوطي ـ تأریخ الخلفاء ـ ل٣٦٧ ـ تأریخ الطبري ـ جـ١ ـ ل٢٨٤.

دەبینین کە مەئمون لە سەرەتای نامەکەیدا ئەوەی ڕوونکردووەتەوە کە زۆربەی خەڵکی ـ لەگەڵ کەمی زانیاری و تێڕوانینیان وتویانە قورئان قەدیمە، لەکاتێکدا کە هیچ شتێك قەدیم نییە جگە لە خودای گەورە، بە هۆی ئەم باوەڕەیانەوە یەکسانیان لەنێوان خودا و قورئاندا دروستکردووە لە ڕووی قەدیمیەوە، پاشان چەند ئایەتێك وەك بەڵگە دەهێنێتەوە ـ لە سەر ئەوەی کە قورئان مەخلوقە، بۆیە تانە دەدات لەسەر ئەوانەی کە بڕوایان وایە قورئان مەخلوق نییە، پاشان داوا لە کاربەدەستەکەی دەکات بۆ ئەوەی ڕاوبۆچوونی قازییەکان وەرگرێت لەو بارەوە و تاقیان بکاتەوە، داواشی لێکرد هەر کەسێکیان نەیووت قورئان مەخلوقە متمانەی لێوەرگرێتەوە، لەڕاستیدا بڵاوکردنەوەی ڕێنماییەکانی ئیعتیزال ـ بەم شێوەیە ـ ئامانج پێی ئەوە نەبوو کە تەنها لەنێو قازییەکاندا بڵاوی بکاتەوە، بەڵکو هاوکات ئامانجی ئەوەبوو کە لەنێو خەڵکیشدا بڵاوبێتەوە، بۆ ئەم مەبەستە مەئمون فەرمان دەدات بەو قازییانەی کە دەڵێن قورئان مەخلوقە پرسیار لەو خەڵکە بکات کە دێن بۆ شایەتیدان سەبارەت بەم مەسەلەیە بۆ ئەوەی بزانێ ئەوان چۆن دەڕواننە قورئان، گەر پێچەوانەی ئەوەیان وت ئەوا شایەتیان لێوەرنەگرێت، ئەمەش وا دەکات تا بواری زیاتر بڕەخسێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم فیکرەیە. بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کە سیوطی باسی لێوە کردووە کە مەئمون نامەیەکی دیکەی نوسیووە بۆ ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم بۆ ئەوەی "فەقیهو زانایانی فەرموودە" بۆ ئەم مەسەلەیە کۆبکاتەوە.[٢٤١]

ئەوجا فەقیهو زانایانی فەرموودەش لە مزگەوتەکاندا بە زۆربەی خەڵکەکە دەگەن و ئەمەش بۆ خۆی بواری زیاتر دەڕەخسێنێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم

---

[٢٤١]ـ تأريخ الخلفاء ـ ل٣٦٨.

فیکرەیە، بۆیە ئامانجەکە تەنها تاقیکردنەوەی زانایان و فەقیهەکان نەبوو بە تەنها تا ئیعتیزال بکەنە مەزهەب بۆ خۆیان، چونکە ئەمانە توێژ و ناوکی سەرەکیبوون لە کۆمەڵگەدا یان ئامرازی بڵاوکردنەوە بوون کە دەکرێت لە ڕێگەیانەوە ئیعتیزال بڵاو بێتەوە و ببێتە مەزهەبی سەرەکی دەوڵەت.

پاشان مەئموون نامەیەکی تری نوسی بۆ ئیسحاق و فەرمانی پێکرد ئەو کەسانە ئامادە بکات کە نەیانوتووە قورئان مەخلوقە، ئەوەبوو ئەویش کۆمەڵێك زانا و فەقیهی بانگکرد و لە نێوانیاندا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیشی تێدابوو.[٣٤٢] دوای ئەوەی ئیسحاق کۆیکردنەوە و ناوەڕۆکی نامەکەی مەئمونی خستەڕوو بۆیان، هیچ وەڵامێکیان نەدایەوە و ئینکاریشیان نەکرد، ئینجا بە بیشری کوڕی وەلیدی وت: چی دەڵێیت سەبارەت بەم نامەیە؟ وتی: ئەمیری باوەڕدارانم زیاتر لە جارێك ناسیووە، وتی: ئێستا نامەیەکی تازە لە ئەمیری باوەڕدارانەوە هاتووە، وتی: دەڵێم قورئان کەلامی خودایە، وتی: سەبارەت بەوە پرسیارم لێت نەکرد قورئان کەلامی خودایە یان نا، بەڵکو پرسیاری ئەوەم لێکردی ئایا قورئان مەخلوقە یان مەخلوق نییە؟ وتی: لەوە باشتر نازانم کە پێم وتی، بەڵێنم بە ئەمیری باوەڕداران داوە لەو بارەوە هیچ قسەیەك نەکەم.

ئەوجا وتی بە عەلی کوڕی ئەبی موقاتیل: ئەی تۆ چی دەڵێت؟ وتی: قورئان کەلامی خودایە، ئەگەر ئەمیری باوەڕدارانیش فەرمانمان پیّ بکات بە شتێك ئەوە فەرمانبەرداری دەبین و لە قسەی دەرناچین.

هەرچی ئەبو حەسانی زیادیشە ئەوا وەڵامێکی نزیك لەم وەڵامەی دایەوە.

پاشان بە ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی وت: تۆ لەم بارەوە چی دەڵێیت؟ وتی: کەلامی خودایە.

---

[٣٤٢]- هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

وتی: قورئان مەخلوقە یان نا؟ وتی: قورئان کەلامی خودایە و لەمەش زیاتر هیچی دیکە نالێم.

ئیبن بەکائی ئەکبەریش وتی: دەڵێم قورئان دانراوە و داهێنراوە بەهۆی هاتنی چەندین دەق لەو بارەوە. ئیسحاق پێی وت: دانراویش دروستکراوە؟ وتی: بەڵێ، وتی: دەی کەواتە قورئان مەخلوقە؟ وتی: نالێم قورئان مەخلوقە.[٢٤٣]

ئیسحاقیش هەموو ئەم وەڵامانەی بەنامەیەکدا ناردەوە بۆ مەئمون، مەئمونیش وەڵامی نامەکەی دایەوە و وتی: وەڵامی ئەو کەسانەمان پێگەیشت کە خۆیان وا پیشان دەدەن ئەهلی قیبلەن و بە تەمای ئەوەن سەرکردایەتییان دەستکەوێت کە شایستەی ئەوەش نین، هەرکەس وەڵامی نەدایەوە کە قورئان مەخلوقە، ڕێگری لێبکە لە فەتوا دان و ڕیوایەتکردن. هەر لە نامەکەدا هاتووە دەڵێت: سەبارەت بەوەی کە "بیشر" وتی ئەوە قسەیەکی ناڕاستە، چونکە هیچ پەیمانێك لە نێوان ئەمیری باوەڕداران و ئەودا نەبووە تەنها ئەوە نەبێ هەواڵی گەیشتووە بە ئەمیری باوەڕداران کە یەکتاپەرستبووە و باوەڕیشی بەوە هەبووە قورئان مەخلوقە. بەم شێوەی کە من پێت دەڵێم بانگی بکە، گەر تەوبەیکرد و پاشگەزبوویەوە دەنگوباسی بڵاوبکەرەوە، گەر لەسەر ئەوەش بەردەوامبوو کە قورئان بکاتە هاوبەشی خودا و ملی نەدا کە بڵێ قورئان مەخلوقە و سوور بوو لەسەر بێباوەڕییەکەی، ئەوە بدە لە گەردنی و سەرەکەیشیمان بە بەریدا بۆ بنێرە، هەرچی عەلی کوڕی ئەبو موقاتیلیشە ئەوا پێی بڵێ: ئەیا تۆ ئەو کەسە نەبووی بە ئەمیری باوەڕدارانت وت تۆ خۆت دەتوانیت شت حەڵاڵ و حەرام بکەیت؟ سەبارەت بە ئەحمەدی کوڕی

---

[٢٤٣] ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٣٦٩.

حەنبەلیش ئاگاداری بکەرەوە کە ئەمیری باوەڕداران تێگەیشتووە لە ناوەڕۆکی قسەکەی و بەڵگەیە لەسەر نەزانینی... دوای ئەوەی هەڵدەستیٚ بە ژماردنیٚ هەریەك لەوانەی کە ئیسحاق تاقی کردوونەتەوە دەڵیٚ: هەرکەس پاشگەز نەبوویەوە لەم بێباوەڕی و هاوبەشی دانانە ـ ئەوەی ناوم هێنان لەپاش بیشر و ئیبن مەهدی ـ بە قۆڵبەستکراوی ڕاپێچی سەربازگەی ئەمیری باوەڕدارانی بکە بۆ ئەوەی پرسیاریان لیٚ بکات، ئەگەر پاشگەز نەبوونەوە شیریان لیٚ هەڵکێشە.[٣٤٤]

جا کاتێك کار گەیشتە مەسەلەی کوشتار هەموویان پاشگەزبوونەوە لەوەی کە وتیان جگە لە چوار کەسیان نەبیٚ کە بریتی بوون لە: "ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، سەجادە، موحەممەدی کوڕی نوح، قەواریری"، ئەوەبوو ئیسحاق فەرمانیدا قۆڵبەستیان بکەن، پاشان لێی پرسینەوە ـ کاتێك قۆڵبەست کرابوون ـ سەجادە وەڵامی دایەوە، پاشان بۆ جاری سێهەمیش دووبارە لێی پرسینەوە، ئەمجارە قەواریی وەڵامی دایەوە، ئەوجا هەر یەك لە ئەحمەدی کوڕی حەنبەل و موحەممەدی کوڕی نوح بە ئاڕاستەی ڕۆم بران.[٣٤٥] هەواڵ گەیشتەوە بە مەئمون کە ئەوانەی وەڵامیان داوەتەوە بە هۆی فشارەوە بووە بۆیە وەڵامیان داوەتەوە، مەئمونیش تووڕە بوو فەرمانیکرد ئامادەیان بکەن و بیانهێنن بۆ لای، ئەوەبوو ڕاپێچکران بۆ لای ئەمیری باوەڕداران، بەڵام پێش ئەوەی ئەوان بگەن لای مەئمون مرد.[٣٤٦] ئەمەش بە سەرهاتی میحنەت بوو لە سەردەمی مەئموندا.

---

[٣٤٤]ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٣٦٩، ٣٧٠، بڕوانە ـ تأريخ الطبري ـ جـ٥ ـ ل٢٨٩ و دواتر.

[٣٤٥]ـ تأريخ الخلفاء ـ ل٣٧١.

[٣٤٦]ـ هەمان سەرچاوە و لاپەرە.

## ب ـ میحنەت لەسەردەمی موعتەصەمدا: (*)

لە پاش مردنی مەئمون موعتەصەمی برای بوو بە خەلیفە، ئەویش هەمان ئەو ڕێگەیەی گرتەبەر کە مەئمونی برای پیادەی کردبوو، بۆیە تا کۆتایی تەمەنی لەسەر خەلقی قورئان خەڵکی لەسەر تاقی دەکردەوە، بۆ ئەم مەبەستە نامەی نوسی بۆ کاربەدەستەکانی لە هەموو ناوچەکاندا و فەرمانیشیدا بە مامۆستاکان منداڵان لەسەر ئەم باوەڕە فێر بکەن.[٣٤٧]

لە کاتێکدا کە مەئمون خاوەنی زانستێکی زۆر بوو، وە توانای لێکدانەوە و بەڵگەهێناوەی هەبوو، دەبینین موعتەصەم بە پێچەوانەی ئەوەوە بوو، ئەوەتا صەولی دەگێڕێتەوە کە موعتەصەم غولامێکی خوێنەواری هەبووە لێیەوە فێری نوسین و خوێندنەوە دەبوو، ئەوەبوو غولامەکەی مرد، هارونە ڕەشیدی باوکی پێی وت: ئەی موحەممەد غولامەکەت مرد، ئەویش وتی: بەڵێ گەورەم ڕزگاریبوو لە وانەوتنەوە و فێرکردن، وتی: ئایا هەر ئەمەندەی پێوتویت؟ لێیگەڕێن تا کوێ گەیشتووە هیچی تری فێر مەکەن. دەڵێ: دواتر موعتەصەم

---

* ناوی موحەممەدی کوڕی هارونە، ناسراو بە ئەبو ئیسحاق ئەلموعتەصەمی برای مەئمون، دایکی ئوم وەلەد، یەکێك بووە لە کەنیزەکانی کوفە، ناوی ماریدە بووە، بە بەختترین کەسبووە لای خەلیفە ڕەشید، لەساڵی ١٨٠ کۆچی لە دایکبووە، وتراویشە لەساڵی ١٨٠ کۆچی لە دایکبووە. لە پاش مردنی براکەی بووە بە خەلیفە، ئیتر وەك خەلیفە کاروباری دەوڵەتی بەڕێوە بردووە تا ئەوەی لەساڵی ٢٢٧ کۆچی مرد. بڕوانە ـ محمد بن حیان ـ أخبار الخلفاء ـ ل٣٣٩، تأریخ الخلفاء للسیوطي ـ ل٣٩٢.

[٣٤٧] ـ تأریخ الخلفاء ـ ل٣٦٥.

دەینوسی و دەیخوێندەوە بەڵام زۆر بە لاوازی، لەگەڵ ئەوەدا یەکێك بووە لە گەورەترین و بە سامترین خەلیفەکانی عەبباسی.[٣٤٨]

جا بەردەوامبوونی موعتەصەم لەسەر ئەم میحنەتە لەسەر شارەزایی نەبووە، بەڵکو تەنها لەسەر جێبەجێکردنی ئەو پەیمانە بووە کەلەلایەن مەئمونەوە پێی ڕاسپێررا بوو کە درێژە بە تاقیکردنەوەی خەڵکی بدات و ڕێنماییەکانی موعتەزیلە بلاو بکاتەوە، لەم کارەشدا ئەحمەدی کوڕی ئەبو دوئاد ڕۆڵێکی گەورەی بینی لە بەردەوامی ئەم میحنەتەدا، بە تایبەت دوای ئەوەی پێگە و دەسەلاتی زیاتر بوو بووە سەرۆك قازی ولات، لەڕاستیدا موعتەصەم کاری کرد بەو وەسیەتەی کە مەئمونی برای بۆیکرد، لە وەسیەتەکەیدا هاتووە: (ئەبو عەبدوللا - ئەحمەدی کوڕی ئەبو دوئاد - لێت جیا نەبێتەوە و دەستبەرداری نەبیت، لە هەموو کاروبارەکانتدا ڕاوێژ و مەشوەرەتی پێ بکە).[٣٤٩]

بە هەرحاڵ موعتەصەم بەردەوامبوو لەو تاقیکردنەوە و میحنەتەی خەڵکی و خەڵکێکی زۆر لەسەر دەستی دووچاری نارەحەتی بوون بە ئەشکەنجە و زیندانیکردن، بۆیە دەبینین کە نەعیمی کوڕی حەمماد - کە یەکێکە لە زانایان و فەرموودەناسەکان - بۆ ئەم مەبەستە لە میصرەوە هێنراوە بۆ بەغداد و لەبارەی خەلقی قورئانەوە پرسیاری لێکراوە، ئەویش وەڵامی نەداونەتەوە و

---

[٣٤٨]- سەرچاوەی پێشوو - ل٣٩٣.

[٣٤٩]- بڕوانە - وفيات الأعيان لإبن خلكان - جـ١ - ل٣٢، ٦٦.

ملی بۆ شل نەکردوون، ئەوەبوو لە سامەڕا زیندانیکرا و لەوێ مایەوە بە بەردەوامی تا کۆچی دواییکرد.[٣٥٠]

لەڕاستیدا گرنگترین ڕووداویش لەم میحنەت و تاقیکردنەوەدا خۆی لە میحنەت و تاقیکردنەوەکەی "ئیمام ئەحمەد"دا دەبینێتەوە کە لەپێناویدا ناڕەحەتیەکی زۆری چەشت لەڕووی زیندانیکردن و ئەشکەنجەدانەوە، خستنەڕووی ئەمەش نێوانی ئەو ململانێی و دەرگیرییەی نێوان موعتەزیلە و نەیارەکانی دەخاتەڕوو کە چەندە گەورە و ئاڵۆز بووە.

ئیمام ئەحمەد لە زینداندا مایەوە تا دوایین ڕۆژەکانی خەلیفە مەئمون، ئەوەبوو دواتر لە زیندانەوە گوێزرایەوە بۆ ماڵی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم، موعتەصەم هەموو ڕۆژێك دوو پیاوی دەنارد بۆ لای و سەبارەت بە خەلقی قورئان مشتومڕیان لەگەڵ دەکرد، ئەویش هەر لەسەر قسەی خۆی سوور بوو، وەڵامێکی نە ئەیانەوە بەدڵی ئەوان بێت، کاتێك کە موعتەصەم داوایکرد کە ئیبن حەنبەل بەرن بۆ لای، ئیسحاق چووە لای و پێی وت: (ئەی ئەحمەد گیانی خۆت لەسەر خۆت، بێگومان موعتەصەم بە شمشێر ناتکوژێت، گەر وەڵامیشی نەدەیتەوە ئەوا بەردەوام لێدان لە دوای لێدان لێت دەدا یان دەتخاتە شوێنێکەوە کە بەچاوی سەر ڕووناکی نەبینی، ئایا خودا نەیفەرمووە: ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾.[٣٥١] واتە: (بێگومان ئێمە کردمان بە خوێندنەوەیەکی شێوە زمانی عەرەبی). ئایا هەرچی "مَجعول" بێ " مەخلوق نییە" ئیمام

---

[٣٥٠]- بڕوانە - إبن جوزي - مناقب الإمام أحمد بن حنبل - ل٣٩٧ - مطبعة السعادة - ١٣٤٩ك، یان - تأریخ الخلفاء للسیوطي - ل٣٩٥، یان زهدي جار الله - المعتزلة - ل١٧٢.

[٣٥١]- سورەتی - الزخرف - ئایەتی ٣.

ئەحمەدیش وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ: خودا دەفەرموێت: ﴿فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ ۝﴾.[352] واتە: (سەرئەنجام وەکو پوش و پەڵاش و کای خوراوی لێکردن). ئایا لێرەدا " جَعل " بە واتای دروستکرن دێت، ئیتر فەرمانیکرد بیبەن بۆ لای موعتەصەم).[353]

بە هەرحاڵ چەندین دیدار و مشتومڕ لەبەردەم موعتەصەمدا ڕوویدا و ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش جار لە دوای جار لەسەر قسەکەی خۆی سوور بوو دانی نە ئەنا بەوەی کە بڵێ قورئان دروستکراوی خودایە، هەندێك وا باس دەکەن بە قامچی لێیدراوە تا ئەوەی لە هۆش خۆی چووە، بەشێوەیەکی گشتی ئەوەی کە لایەنگری ئیمام ئەحمەدە زیادەڕەوییان کردووە لەو میحنەت و ناڕەحەتیەی کە تووشی بووە، تا ئەوەی "زهدی جار الله" دەڵێ خاوەنی کتێبی "مناقب الإمام أحمد" کە " ئیبن جەوزییە" دەڵێت: لایەنگری ئیمام ئەحمەد دەکات بە تایبەت لە بەرامبەر موعتەصەمدا کە هەستاوە بە لێدانی،[354] کاتێك کە موعتەصەم بێ هیوا بوو لە ملنەدانی، فەرمانیکرد ئازادیکەن، ئەوەبوو بۆ ماوەی بیست و هەشت مانگ لە زینداندا مایەوە.[355]

بۆ زیاتر سوودمەندبوون هەندێ لەو دیدار و مشتومڕانە دەخەینە ڕوو کە بە ئامادەبوونی موعتەصەم ئەنجامدراون:

---

[352]- سورەتی ـ الفيل ـ ئایەتی ٥.

[353]- إبن الجوزي ـ الإمام أحمد ـ ل٣١٩، ٣٢٠، بڕوانە ـ زهدي جار الله ـ المعتزلة ـ ل١٧٢، ١٧٣.

[354]- مناقب الإمام أحمد ـ ل٣٢٥، ٣٣٠ ـ یان ـ زهدي جار الله ـ ل١٧٤.

[355]- مناقب الإمام أحمد ـ ٣٣٨.

**دیداری ژماره١:**

پرسیار: خودا فەرموویەتی: ﴿مَا يَأْتِيهِم مِّن ذِكْرٍ مِّن رَّبِّهِم مُّحْدَثٍ﴾.[٣٥٦] واتە: (هیچ یاداوەرییەکی تازەیان لەلایەن پەروەردگارییانەوە بۆ نایەت). ئایا شتێکی تازە و داهێنراو مەخلوق نییە.

ئیبن حەنبەل لە وەلآمدا وتی: ﴿وَٱلْقُرْءَانِ ذِى ٱلذِّكْرِ﴾.[٣٥٧] واتە: (سوێند بەم قورئانە کە خاوەنی ئامۆژگاری و قەدر و ڕێزە). لەم ئایەتەدا " ٱلذِّكْر " مەبەست پێی قورئانی پیرۆزە بەلآم لەو ئایەتەی سەرەوەدا مەبەست پێی قورئان نییە، چونکە " ئەلیف و لامی لەگەڵدا نەهاتووە".

پرسیار: ئایا خودای گەورە لەم ئایەتەدا نافەرموێت: ﴿خَٰلِقُ كُلِّ شَىْءٍ﴾.[٣٥٨] واتە: (ئەو خودایە بەدیهێنەری هەموو شتێکە).

ئیبن حەنبەل ولآمی دایەوە: خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿تُدَمِّرُ كُلَّ شَىْءٍۭ بِأَمْرِ رَبِّهَا﴾.[٣٥٩] واتە: (ئەو ڕەشەبایە، هەموو شتێك و هەموو شوێنێك کاول دەکات بە فەرمانی پەروەردگاری). ئایا خودا هەموو شتێکی کاولکردووە کە دروستیکردووە؟

---

[٣٥٦] - سورەتی - الأنبیاء - ئایەتی ٢.

[٣٥٧] - سورەتی - ص - ئایەتی ١.

[٣٥٨] - سورەتی - الأنعام - ئایەتی ١٠٢.

[٣٥٩] - سورەتی - الأحقاف - ئایەتی ٢٥.

پرسیار: چی دەڵێیت سەبارەت بەو فەرموودەی کە عیمرانی کوڕی حوصەین دەیگێڕێتەوە و دەڵێ: " إن الله خَلقَ الذِكر" واتە: (خودا قورئانی دروستکردووە؟)

ئیبن حەنبەل لە وەڵامدا وتی: هەڵەیە. ڕیوایەتەکە دەڵێ: "إن الله كَتبَ الذِكر".[٢٦٠] واتە: (خودا قورئانی نوسیوەتەوە).

ئەم دیدار و مشتومڕەی کە باسمان لێوەکرد تیایدا پشت بە بەڵگەی نەقڵی بەسترا بوو، ئێستاش چەند دیدار و مشتومڕێك دەهێنینەوە کە تیایدا پشت بە بەڵگەی ئەقڵی دەبەسترێت.

## دیداری ژمارە ٢:

ئیبن ئەبی دوئاد: ئایا هەرچی کە هەیە شتێکی نوێیە یان قەدیم و کۆنە؟

ئیبن حەنبەل: بەڵێ.

ئیبن ئەبی دوئاد: ئایا قورئانیش شتێك نییە؟

ئیبن حەنبەل: بەڵێ.

ئیبن ئەبی دوئاد: ئایا هەر خودای گەورە قەدیم نییە؟

ئیبن حەنبەل: بەڵێ.

ئیبن ئەبی دوئاد: کەواتە قورئان تازەیە و قەدیم نییە؟

ئیبن حەنبەل: من ئەهلی کەلام نیم تا بەو جۆرە بڵێم.

---

[٢٦٠]- أبو نعيم الأصبهاني - حلية الأولياء و طبقات الأصفياء - جـ٩ - ل١٩٨ - مطبعة السعادة - ١٣٥٨ك - ١٩٢٢م.

## دیداری ژمارە ٣:

ئیبن حەنبەل: حوکمی کەلامی خودا وەك حوکمی زانستەکەی وایە. هەروەك چۆن دروست نییە بوترێ زانستی خودا تازە و نوێیە، هەر بەوشێوەیەش دروست نییە بوترێت کەلامەکەی تازەیە و دروستکراوە.

ئیبن ئەبی دوئاد: ئایا خودا توانای ئەوەی نییە کە ئایەتێك لابدات و ئایەتێکی دیکە بێنێت، یان ئایەتێك بسڕێتەوە و ئایەتێکی تر لە شوێنێدا دابنێ، یان هەموو قورئان لابدات و لەشوێنیدا شتێکی تر بێنێ، ئایا هەموو ئەمانە لە قورئاندا نە نوسراونەتەوە؟

ئیبن حەنبەل: بەڵێ.

ئیبن ئەبی دوئاد: ئایا ئەمە دروستە لە زانستدا؟ ئایا دروستە خودا ئەمە لە زانستی خۆیدا بگۆڕێ و شتێکی تر لە بری ئەو بێنێ؟

ئیبن حەنبەل: نەخێر

لێرەدا ئیبن ئەبی دوئاد ئیبن حەنبەل بە هەڵە دەزانێ لەوەدا کە کەلامی خودا و زانستەکەی وەکو یەك پیشانداوە.

## دیداری ژمارە ٤:

ئیبن ئەبی دوئاد: ئایا وا دادەنێیت کە خودای گەورە خودای قورئانە؟

ئیبن حەنبەل: ئەگەر بیستبێتم کەسێك پێش من ئەوەی وتووە منیش دەموت.

ئیبن ئەبی دوئاد: ئایا هەرگیز ئەو قسەیەت لە ژیانتدا نەبیستووە، لەوانەی کە پێچەوانەی ڕای تۆن یان پرسیاریان لێوە کردبێ یان لە چیرۆکخوان و شیعرنووس و فەرموودەکانەوە وترابێ؟

ئیبن حەنبەل: بێدەنگ دەبێت و وەڵام ناداتەوە.

"جاحظ" سەبارەت بە دیداری چوارەم دەڵێ ئیبن ئەبی دوئاد لای خەلیفە ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی بە درۆزن دانا، چونکە لەوانەیە بیستبێتی کە خەڵکی وتویانە: "رب القرآن، رب یسن، رب طه". بەڵام هەڵوێستی لەمەڕ دیداری دووەم و سێهەم ئەوەی پیشانداوە بۆ خەلیفە کە ئەو کەسێکی ئینکارە و نایەوێت لەوەی کە بڕوای پێیەتی کۆڵ بدات و دژایەتی دەکات، چونکە وەڵامی هەموو ئەو پرسیارانەی دەدایەوە کە ئیبن دوئاد لێی دەپرسی، تا گەیشتە ئەوەی ئەوەندە نارەحەتیان کرد خەریکبوو بمرێت، تا ئەو ساتەش وشەیەکی پێچەوانەی لێوە بوترایە، ئەوا هاوەڵەکانی بێبەری دەبوون لێی.

بۆیە وتی: من ئەهلی کەلام نیم.

ئەو لەسەرەتای ژیانیدا نەیوتووە: من لە زانستی کەلام دەزانم، ئەو کاتەش دەستیکردووە بە قسەکردن و بووە بە زانا، بە هەمان شێوە هەر نەیوتووە شارەزام لە زانستی کەلامدا، کاتێکیش قسەکانی بە بەڵگە هێنراونەتەوە لای خەڵکی، هەر نەیوتووە زانستی کەلام دەزانم[٣٦١].

---

[٣٦١] - الفصول المختارة للجاحظ - وەرگیراوە لە کتێبی - المعتزلة - زهدي جار الله - ل١٧٥، ١٧٦.

* ناوی هارونی کوڕی موحەممەدە، ناسراو بە ئەبو ئیسحاق ئەلموعتەصەم کوڕی ڕەشیدە، نازناوی "واثیق"ی دراوەتە پاڵ لە ساڵی ١٩٦ کۆچی لەدایکبووە - دایکی ئوم وەلەدە نازناوی "قەراطیس" بووە، لەپاش مردنی باوکی لەساڵی ٢٢٧ کۆچیدا ئەم بووە بە خەلیفە، لە ساڵی ٢٣٢ کۆچیشدا مردووە. بڕوانە - تأریخ الخلفاء للسیوطي - ل٤٠٠، یان - السیرة النبویة و أخبار الخلفاء لمحمد بن حیان - ل٣٤٠.

## جـ میحنەت لەسەردەمی خەلیفە "واثیق"دا: (*)

لە پاش مردنی موعتەصەم "واثیق" بوو بە خەلیفە، لە کاتێکدا کە موعتەصەم زانستێکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام "واثیق" لەبەر شارەزایی لە زانستدا ناسرابوو بە مەئمونی بچووك.[٣٦٢]

"واثیق" یش لە مەسەلەی میحنەتدا زۆر توند بووە، دەگێڕنەوە کە ئەحمەدی کوڕی ئەبی دوئاد زاڵبووە بەسەر "واثیق" دا و هانیداوە لەم مەسەلەیدا توووند بێت.[٣٦٣]

لە ساڵی ٢٣١ کۆچیدا نامەیەکی "واثیق" هاتووە بۆ ئەمیری بەصرە و فەرمانی پێکردووە زانایان و بانگبێژەکان لەسەر مەسەلەی خەلقی قورئان تاقی بکاتەوە،[٣٦٤] لە سەردەمی"واثیق"دا ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل ڕۆڵێکی ئەو تۆی نەبینیووە کە شیاوی باسکردن بێت لە مەسەلەی میحنەتی خەلقی قورئاندا، هەرچی "واثیق"یشە ڕووبەڕووی نەبووەتەوە و ئازاری نەداوە، ئەمەش دیارە بەهۆی ئەو پێگە و ئاستە بووە کە ئیبن حەنبەل لەنێو دڵی خەڵکیدا هەیبووە لەو دەمەدا، سەرباری ئەو هەڵوێستە توندەش کە ئیبن حەنبەل هەیبوو لەسەردەمی هەر یەك لە مەئمون و موعتەصەمدا، بۆیە "واثیق" پێی وابوو فشار و ناڕەحەتی هیچ سوودێکی نابێ لەسەر ئیبن حەنبەل، ئەوەبوو خەلیفە نامەی بۆ ئیبن حەنبەل نووسی و پێی وت: لەو شوێنەی منی تێدا نیشتەجێیە تیایدا دامەنیشە، ئیتر ئیبن حەنبەل بەدرێژایی ژیانی خەلیفە "واثیق" خۆی لێ بەدوور دەگرت، تەنانەت بۆ نوێژ و غەیری

---

[٣٦٢] ـ تأریخ الخلفاء ـ ل٤٠٢.

[٣٦٣] ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٤٠١.

[٣٦٤] ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٤٠٠.

نوێژیش نەدەچووە دەرەوە.[٣٦٥] یەکێکی تر لە ڕواڵەتە توندەکانی"واثیق" لە مەسەلەی خەلقی قورئاندا ئەوەبوو کە هەزار و شەش صەد ئەمیری موسڵمان لای ڕۆمەکان دەست بەسەر بوو، خەلیفە کۆمەڵێك پیاوی نارده لای ڕۆمەکان تا لە ڕێگەی فیدیەوە ئەو دیلانە ئازاد بکات، ئەوجا هەموو ئەو دیلانەیان لەوێ تاقی دەکردەوە لەسەر مەسەلەی خەلقی قورئان، هەر دیلێکیان بیوتایە قورئان مەخلوقە ئەوە دەستبەجێ ئازاد دەکرا و لەبەرامبەریشدا دوو دیناری وەك پاداشت پێ دەدرا، هەر دیلێکیش ملەجەڕێی بکردایە و نەیوتایە قورئان مەخلوقە ئەوا بە دیلی دەیانهێشتەوە لای ڕۆمەکان و ئازادیان نەدەکرد.[٣٦٦]

بە هۆی توند و تیژی "واثیق" لە مەسەلەی خەلقی قورئاندا، خەڵکی تەواو بێزار ببوو بە هۆی ئەو ئاسەوارە خراپەی کە دووچاریان دەبوویەوە، ئەوەبوو فیتنە و ئاشووب بڵاوەیکرد تا گەیشتە ئەوەی "ئەحمەدی کوڕی نەصری خوزاعی" ـ کە یەکێك بوو لەپیاوە دیارەکانی نێو بەغداد ـ لە هیچ کۆڕ و کۆبوونەوەیەکدا سڵی لە "واثیق" نەدەکردەوە و هێرشی توندی دەکردە سەر و دەیووت: ئەم بەرازە، ئەم کافرە، تەنانەت پیلانێکی گێڕا بۆ لابردنی "واثیق" لەسەر دەسەڵات، بەڵام پیلانەکەی سەری نەگرت و بەهۆیەوە دەستیگیر کرا و ڕاپێچیان کرد بۆ لای "واثیق".[٣٦٧]

کاتێك کە ئەحمەدی کوڕی نەصریان لەبەغداوە بە قۆڵبەستکراوی هێنا بۆ بەغداد، "واثیق" لەبارەی قورئانەوە پرسیاری لێکرد، لەوەڵامدا وتی: قورئان مەخلوق نییە، سەبارەت بە بینینی خوداش لە ڕۆژی قیامەتدا لێی پرسی، وتی:

---

[٣٦٥] ـ إبن الجوزي ـ مناقب الإمام أحمد ـ ل٣٤٨.

[٣٦٦] ـ السيوطي ـ تأريخ الخلفاء ـ ل٤٠١.

[٣٦٧] ـ بروانە ـ تأريخ الطبري ـ جـ٩ ـ ل١٣٥، ١٣٨.

هەر بەو شێوەیە کە هاتووە، ئیتر ئەو فەرموودەی بۆ گێڕایەوە لەبارەی بینینی خودا، "واثیق" پێی وت: ئایا درۆ دەکەیت، بە "واثیق"ی وت: بەڵکو تۆ درۆ دەکەیت، وتی: هاوار بۆ تۆ ئایا پێت وایە خودا وەك کەسێکی دیاریکراو و تەندار دەبینرێ وەك چۆن تەنێك لە شوێنێکدا ببینرێ؟ لەڕاستیدا من باوەڕم بەخودایەك نییە بەو سیفەتانەی کە ئێوە باسی لێوە دەکەن. داوای شمشێری کرد و وتی: گەر هەستام بۆی کەس لەگەڵمدا هەڵنەستێ، من دەمەوێت هەنگاوەکانم بژمێرم بۆ لای ئەم بێباوەڕە کە خودایەك دەپەرستێ ئێمە ناپەرستین و بەو سیفەتانەش نایناسین کە ئەو باسی لێوە دەکات، ئەوەبوو دای لە گەردنی و سەری لەلاشەی جیاکردەوە، ئینجا فەرمانیکرد سەرەکەی هەڵگرن و بیبەن بۆ بەغداد، ئیتر لەوێ سەرەکەی هەڵواسرا، نوسراوێکیشیان هەڵواسی بە گوێچکەیەوە و تیایدا نوسرابوو: ئەمە سەری ئەحمەدی کوڕی نەصری کوڕی مالیکە، خەلیفە بانگی کردووە دان بنێ بەوەدا کە قورئان مەخلوقە و نەفی هاوشێوەش بکات بۆ خودای گەورە، بەلاّم ئەو ملەجەڕێی کردووە و پشتی لە داواکەی خەلیفە کردووە، بۆیە خودای گەورە ئەجەلەکەی پێش خستووە بۆ ئاگری دۆزەخ.[٣٦٨]

سیوطی دەڵێ: لەڕاستیدا خەلیفە واثیق لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا پاشگەزبوویەوە لەو بۆچوونەی کە هەیبوو سەبارەت بە مەسەلەی خەلقی قورئان.[٣٦٩] ئەو ڕووداوەش باس دەکات کە وای لە واثیق کرد لە کارەکانی ڕابردووی پاشگەزبێتەوە، تەنانەت پاشگەزبێتەوە لە بەردەوامیدان بە مەسەلەی میحنەتی خەلقی قورئان، بۆیە دەڵێ: جارێکیان پیاوێکیان بە کۆت و

[٣٦٨] ـ السيوطي ـ تأريخ الخلفاء ـ ل٤٠٠، ٤٠١.

[٣٦٩] ـ هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

بەندی زنجیرەوە لەولاتی خۆیەوە هێنرا بۆ لای واثیق،[٣٧٠] کاتێك هاتە لای ـ ئیبن ئەبی دوئادیش لەوێ ئامادەبوو ـ پیاوە کۆت و بەند کراوەکە وتی: پێم بڵێن ئەم بۆچوونەی کە ئێوە بانگی خەڵکی بۆ دەکەن، ئایا کاتی خۆی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) شارەزایی لەبارەیەوە هەبووە و خەڵکی بۆ بانگ نەکردووە، یان ئەوەتا شتێکە و هەر نەیزانیووە؟ ئیبن ئەبی دوئاد وتی: بەڵێ بەڵکو زانیویەتی. وتی: ئایا پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) ناتوانێ خەڵکی بۆ بانگ بکات و بێدەنگ بووە لێی، بەلام ئێوە خەڵکی بۆ بانگ دەکەن؟ هەموان بێدەنگ بوون بەسەرسامی پیاوەکە، خەلیفە واثیق پێکەنی، دەستی بە دەمی خۆیەوە گرت و وتی: پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) لە توانایدا هەبووە قسە بکات کەچی بێدەنگیش بوو لەم مەسەلەیەدا، بەلام ئێمە تواناماں نییە و هەر دەبێت قسەی تێدا بکەین، فەرمانیکرد سێ صەد دیناری بدەنێ و ڕەوانەی ولاتەکەی خۆیشی بکەنەوە، ئیتر لەپاش ئەو پیاوە کەسی لەسەر مەسەلەی خەلقی قورئان تاقی نەکردەوە، وە لەو ڕۆژە بەدواوە ڕقی لە ئیبن ئەبی دوئادیش هەستا[٣٧١].

---

[٣٧٠] ـ سیوطی باسی ئەوەی کردووە کە ئەم پیاوە ئەبو عەبدولڕەحمانە، ناوی عەبدوڵلای کوڕی موحەممەدی ئەذرەمیە، مامۆستای ئەبو داود و نەسائی بووە.

[٣٧١] ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٤٠١، ٤٠٢.

* ناوی جەعفەری کوڕی هارونە، دایکی ئوم وەلەدە ناوی شوجاعە، لەساڵی ٢٠٥ یان ٢٠٧ لە دایکبووە، لەساڵی ٢٣٢ کۆچی بووە بە خەلیفە پاش ئەوەی "واثیق"ی برای ئەسپەردەی خاککرد، ئیتر وەك خەلیفە مایەوە تا ئەو کاتەی "منتصر"ی کوڕی لێی ڕاپەڕی و لەساڵی ٢٤٧ کۆچی کوشتی. بڕوانە ـ تأریخ الخلفاء للسیوطي ـ ل٤٠٦، محمد بن حیان ـ أخبار الخلفاء ـ ل٣٤٠.

### د- كۆتایی میحنەت لەسەردەمی خەلیفە "متوەكیل" دا: (*)

لە كۆتایی تەمەنی "واثیق"دا دەنگی میحنەتی قورئان نزمبوویەوە، پاش ئەو سەردەمی "متوەكیل"ی برای هاتە ئاراوە، بە پێچەوانەی خەلیفەكانی پێش خۆی خەلیفە متوەكیل دوژمنایەتی خۆی بۆ باوەڕی ئیعتیزال و شوێنكەوتوانی دەربڕی، فەرمانیكرد بە زیندووكردنەوەی سوننەت و سەرخستنی پەیڕەوانی ئەهلی سوننەت، بۆ ئەم مەبەستەش نامەی نووسی بۆ تەواوی ناوچەكان و فەرموودەناسەكانیشی بانگكرد بۆ سامەڕا، لەوێ خەلاَتی پێدان و ڕێزی لێگرتن، ئەوجا فەرمانی پێكردن كە گرنگی بەو فەرموودانە بدەن كە باس لە سیفەتەكانی خودا و بینینی خودا دەكات، زۆربەی خەڵكیش لەسەر ئەم هەڵوێستانە دوعای خێری زۆریان بۆ متوەكیل دەكرد، هەروەها لە ڕێگەی شیعر و هۆنراوەشەوە ستایشی زۆریان دەكرد، تەنانەت یەكێكیان وتویەتی: خەلیفەكان سیانن: ئەبو بەكری صدیق "خودای لێ ڕازی بێ" لە كوشتنی هەڵگەڕاوەكاندا، عومەری كوڕی عەبدولعەزیز لە گێڕانەوەی مافەكان بۆ خاوەنەكانیان، متوەكلیش لە زیندووكردنەوەی سوننەت و مراندنی بیری جەهەمیەكاندا، لەم بارەوە "ئەبو بەكری كوڕی خەببازە" شیعرێكی هۆنیوەتەوە بەسەر خەلیفەدا و تیایدا دەڵێ:

وبَعدُ، فإن السُّنة اليوم أصبحت ... مُعززة حتى كأن لم تذلل

تصول و تسطو إذ أقيم منارها ... وحُط منار الإفك و الزور من عَلِ

وولى أخو الإبداع في الدين هاربا ... إلى النار يهوى مُدبراً غير مقبل

شفى الله منهم بالخليفة جعفر ... خليفته ذي السنة المتوكل

خليفة ربي و ابن عم نبيه ... و خير بني العباس من منهم ولي

و جامع شمل الدين بعد تشتت ... رؤس المارقين بُمنصُلِ

أطـال لنـا رب العبـاد بقـاءه سليمـاً مـن الأهـوالِ غير مـبدل
و بَـوّره بالنصـر للديـن جنـة يُـجاور في روضاتها خـير مرسل.[272]

واتە: (لەمەو دوا سوننەت وایلێهاتووە سەربەرزە وەك ئەوەی هەرگیز زەلیل نەکرابێ، دێت و دەڕوا و دەسەڵاتی هەیە، چونکە پایەکانی بونیادنراوە، هێماکانی درۆ و بوختان لەسەرەوە تێکشکێنراوە و خراونەتە خوارەوە، ئەوانەی بیدعەیان داهێنا پشتیان هەڵکرد و هەڵهاتن ڕووە و ئاگر و بە پشت هەڵکراوی بێ ئەوەی جارێکی تر بگەڕێتەوە، خودا شیفای خەڵکیدا بە خەلیفە جەعفەر، ئەو خەلیفەیەی خاوەنی سوننەتە کە متوەکیلە، خەلیفەی خودایە و کوڕە مامی پێغەمبەرە، باشترینی نەوەکانی عەبباسیشە کە دەسەڵاتی گرتووەتە دەست، کۆکەرەوەی بەیداخ و کاروباری دینە پاش پەرژ و بڵاوکردنەوەی سەری لە سنوور دەرچووەکان بە شمشێر، خودا تەمەنی ئەومان بۆ درێژ بکاتەوە لە هەموو نەهامەتیەکاندا و بۆمان بپارێزێ و بۆمان نەگۆڕێ لەوەدا کە ئەمیکرد بە قەڵغان بۆ پاراستن و سەرخستنی دینەکەی، وە لە دوا ڕۆژیشدا باشترین کەس دەبێت بە دراوسێی کە باشترین نێرراوە لەلایەن خوداوە).

کاتێك متوەکیل هەموو ئەم پشتگیرییانەی بینی، بەردەوامبوو لەڕاوەدونانی موعتەزیلەکان و بەتوندترین و خراپترین شێوە دژایەتی دەکردن، لەساڵی ٢٣٧ کۆچی نامەی نارد بۆ کاربەدەستەکەی لە میصر و داوای لێکرد ڕیشی سەرۆك قازیەکانی میصر بتاشێ "ئەبو بەکر موحەممەدی کوڕی ئەبو لەیث" ـ کە لەسەر مەزهەبی موعتەزیلە بوو ـ لێیبدا و لەسەر گوێدرێژیش بەنێو شاردا بیگەڕێ، کاربەدەستەکەشی ئەوەی لێی داواکرابوو ئەنجامیدا، وە لەبری

---

[272] ـ السیوطي ـ تأریخ الخلفاء ـ ل٤٠٦، ٤٠٧.

ئەویشدا "ئیبن مسکین"ی وەك سەرۆکی قازییەکانی میصر دانا، کە یەکێك بوو لە هاوەڵانی ئیمام مالیك ـ ئەوەبوو لەسەردەمی مەئموندا زیندانی کرابوو لەبەر ئەوەی نەیوتبوو قورئان مەخلوقە، بەڵام متوەکیل ئەوی ئازاد کرد ـ پاشان وەك سوکایەتی پێکردن بە قازییە دوورخراوەکە، ڕۆژانە بیست قامچی لێدەدرا[٣٧٣].

دواتر "خەلیفە متوەکیل" بانگهێشتی ئیمام ئەحمەدی کرد بۆ بەغدا و لەخۆیی نزیککردەوە، تەنانەت هیچ کەسێکی وەك کاربەدەست دیاری نەدەکرد هەتا پرس و ڕاوێژی بە ئیمام ئەحمەد نەکردایە.[٣٧٤] متوەکیل بەم کارانەی دەیویست تەواوی شوێنەوارەکانی سەردەمی میحنەت بسڕێتەوە، بە گشتی بەم شێوەیە میحنەتی لەناوبرد و هەموو موعتەزیلەکانیشی لە کایەی سیاسی دوورخستەوە، هەروەها لەسەر دەستی فەرموودەناسەکانیش تووشی ناڕەحەتی بوونەوە چ بە قسە یان بە کردەوە، تەنانەت ژمارەی نەیارەکانیان هێندە زۆربوون زۆرجار قسە و قسەڵۆکیشیان دەدایە پاڵ موعتەزیلە کە ئەوان نەیانوتبوون، ئەمەش سەرەتای کۆتایی کپبوونی دەنگی ئیعتیزال بوو.

---

[٣٧٣] ـ سەرچاوەی پێشوو ـ ل٤٠٨

[٣٧٤] ـ إبن الجوزي ـ مناقب الإمام أحمد ـ ل٣٥٨.

# پێشەکی

بێگومان چی مەزهەبێکی فیکری هەیە بەدەر نییە لەکەموکورتی و ڕاست و هەڵەی هەیە، ئەمەش حاڵی ئەقڵی تەواوی مرۆڤەکانە هەر لەو ساتەی کە خودای گەورە دروستی کردووە و زەوی بۆ فەراهەم هێناوە و کردویەتی بە میراتگری زەوی تا ئەو کاتەی کۆتایی پێ دێت، چونکە کەماڵ و بێ خەوشی تەنها بۆ خودای تاك و تەنهایە.

جا گەر هەموو مەزهەبێك خەوش و ناتەواوی لەخۆ بگرێت، ئیتر چۆن دەتوانین بڕیار لە ڕاست و ناڕاستی هەر مەزهەبێك بدەین؟ لەڕاستیدا ناتوانین بڕیارێکی لەو جۆرە بدەین و ڕاست و دروستی هەر مەزهەبێك دیاری بکەین تا تەواو شارەزایی پەیدا نەکەین سەبارەت بە ئامانج و ئەو مەبەستەی کە هەوڵی بۆ دەدات، ئەم تێگەیشتن و شارەزاییەش نایەتەدی تا تەواو شۆڕ نەبیتەوە بەنێو بنەما و ڕێساکانی ئەو مەزهەبەی کە لەسەری بونیاد نراوە، بۆ ئەوەی تەواو دڵنیابینەوە لە ئامانجە ڕاستەقینەکەی، چونکە زۆر مەزهەب بووە کە سەرەتا سەری هەڵداوە بۆ هێنانەدی چەند ئامانجێکی باش بووە، بەڵام پاش لێکۆڵینەوەی ورد بۆمان ڕوون بووەتەوە لەژێر ئەم ئامانجانەدا چەندین ئامانجی خراپی حەشار داوە، بۆیە کاتێك ڕەواج پەیدا دەکات هەوڵ دەدات ئەو ئامانجە خراپانە جێبەجێ بکات.

بە هەرحاڵ دەکرێت ئامانجەکانی هەر مەزهەبێك لەگەڵ شەرعدا یەکبگرێتەوە و لەگەڵیدا هاوڕا بێت، هاوکات دەکرێت هەندێ جاریش هاوڕا نەبێت و لەگەڵیدا یەکنەگرێتەوە.

جا گەر ئامانجی مەزهەبەکە لەگەڵ شەرعدا یەکیگرتەوە و هاوڕا بوو، ئەوا واجب نییە بە ڕەهایی خۆمان ڕادەستی ئەو مەزهەبە بکەین و وەری بگرین، بەڵام ئەوەی واجبە لەسەرمان ئەوەیە کە لەسەرخۆ و هێدی هێدی سەرنجی مەزهەبەکە بدەین، تا ئەوەی ڕاست و دروستە لێی وەرگرین و ئەوەشی خراپە خۆمانی لێ بەدوور بگرین.

بەڵام گەر هاتوو ئامانجەکانی پێچەوانەی شەرع بوو، ئەوا دیسانەوە نابێت بەڕەهایی ڕەتیکەینەوە، چونکە دەکرێت ئەو مەزهەبە لەناوەوە هەندێ سودی تێدا بێت ڕەنگە پاش لێکۆڵینەوە و قوڵبوونەوە بۆمان ئاشکرا ببێت، تەنانەت گەر ئەو سودەش لە هەندێ شێوازدا کورت بووبێتەوە کە جێی مەترسی نییە بۆمان، چونکە زۆرجار ئەوە بە باشە دەشکێتەوە بە سەرماندا.

پاش ئەم پێشەکیە دەکرێت بۆ هەڵسەنگاندنی مەزهەبی ئیعتیزال ئەم ڕێبازە بەکاربهێنین، بەڵکو بتوانین بە شێوەیەکی بابەتیانە هەڵسەنگاندنی بۆ بکەین دوور لەهەر هەوا و ئارەزوویەك، تا لەڕێگەی شیکردنەوەی هەندێ بابەتەوە ڕووی ڕاست و کەموکوڕییەکانمان بۆ ئاشکرا ببێت، جا چ ئەوەی کە موعتەزیلەکان دەیڵێن، چ ئەوەی نەیارەکانیان لەبەرامبەریاندا دەیڵێن.

## • موعتەزیلە و دیراسەکردنی فەلسەفە:

زۆرێك لەنەیارەکانی موعتەزیلە ئەوەیان بە عەیبە داناوە کە موعتەزیلەکان دیراسەی فەلسەفەیان کردووە و هەوڵیانداوە جیایکەنەوە لە دین، بۆیە

لەزۆربەی ڕەخنەکانیاندا کە لەموعتەزیلەی دەگرن دەڵێن موعتەزیلەکان لەم خاڵەدا بۆچوونی فەیلەسوفەکان بە نموونە دەهێننەوە، بۆیە وەك عەیبەیەك وایە و نابێت لێی نزیك بێتەوە.

کەمێك لەمەوبەر باسی ئەوەمان کرد کە ئامانج و بنەما و ڕێسای هەر مەزهەبێك گەر پێچەوانەش بوو لەگەڵ شەرعدا، نابێت بەشێوەیەکی گشتی ئەو مەزهەبە ڕەتکەینەوە، بەڵکو پێویستە دیراسەی بکەین و لێی بکۆڵینەوە، چونکە لەوانەیە هەندێ سودی تێدا بێت کە ئێمە لێی بێ ئاگابین، ڕێك وەك ئەوەی کە موعتەزیلە ئەنجامیدا، ئەوەبوو دیراسەی فەلسەفە و ڕێبازی فەلسەفەیان کرد، لەگەڵ ئەوەی کە هەندێ بۆچوون و فیکری فەلسەفی هەیە لەگەڵ بیروبۆچوونی ئیسلامدا یەکناگرێتەوە، بەڵام توانیان لەڕێگەی ئەم فەلسەفەوە هەندێ خاڵ بدۆزنەوە بۆ ئەوەی وەك چەکێك لە بەرامبەر نەیارانی ئیسلامدا بەکاری بهێنن تا ئاینی پاکی ئیسلام لەکەدار نەبێت. ئەوەبوو شارەزای هونەری مشتومڕ و دیداری ئەقڵانی و بیرکردنەوەی مەنتیقی دروست بوون، کە لە ڕێگەیەوە توانیان زۆرێك لەبیر و بۆچوونەکانی ناحەزانی ئیسلام و نەیاری مەزهەبەکەیان پووچەڵبکەنەوە، بگرە پاشگەزیشیان کردنەوە و هاتنە نێو ئاینی ئیسلامەوە، پێشتر باسی ئەوەمان کرد کە چۆن لەسەر دەستی "ئەبو عەللاف و واصلی کوڕی عەطاء" زۆرێك لە هەڵگرانی "مەجوسیەت و ئەنەویە" بوونە موسڵمان بەهۆی ئەو دیدارانەی کە لەنێوانیاندا ڕوویدەدا کە تیایدا هەموو بەڵگەی نەیارەکانیان هەڵدەوەشاندەوە.

ئەم جۆرە چەکەش بەهۆی دیراسەکردنی فەلسەفەوە دەستیان کەوت، کە توانیان لەو ڕێگەیەوە زاڵبن بەسەر تەواوی نەیارەکانیاندا و ئاینەکەشیان بڵاوبکەنەوە، ئەم چەکەش کە بە دەستیان هێنا وایکرد کە خودی فەلسەفەیان

خۆشبوێت، تەنانەت هەوڵیشیانداوە پەیوندی لەنێوان ئاین و فەلسەفەدا بێتە ئاراوە، بۆیە جاروبار هەندێ لەبیروبۆچوونی فەلسەفی وایکردووە لەهەندێ بابەتی وەك عەقیدەدا زێدەڕۆیی بکرێت، بەڵام ئەم زێدەڕۆیی و پەرگیرییەش هەموو پیاوانی موعتەزیلەی نەگرتووەتەوە و پشکی هەموویانی تێدا نەبووە، سەرەڕای ئەوە بۆ خۆی ئەوانە کەمینەیەك بوون، دەی خۆ ناکرێت بۆچوونی کەمینەیەکیش گشتگیر بکرێت بەسەر بۆچوونی هەموو موعتەزیلەکاندا و بڵێین هەموویان بەو شێوەیە بیریان کردوەتەوە، چونکە واجب نییە لەسەرمان لەسەر بۆچوونی هەندێ لە موعتەزیلە بڕیاری دژ لەبەرامبەر موعتەزیلەدا دەر بکەین.

## • نەفی سیفەتەکانی خودا و بۆچوونیان سەبارەت بە خەلقی قورئان:

ئەهلی سوننە ناوی "معطلة" شیان بڕیوە بە باڵای موعتەزیلەکاندا، لەبەر ئەوەی سیفەتەکانیان لە خودا دارنیەوە و لە کاریانخستووە، لەڕاستیدا زاراوەی نەفی سیفاتیش لەڕواڵەتدا وا پیشان دەدات کە ئەوان سیفەتەکانیان لە کارخستووە، بەڵام لەگەڵ قوڵبوونەوە بەنێو فیکری موعتەزیلەدا، دەبینین مەبەستیان پێی ئەو مانایە نەبووە بە تەواوەتی، چونکە ئەوان نەفی سیفەتەکان ناکەن وەك ئیعتیباراتی ئەقڵی بۆ زاتی یەك خودا، بەو مانایەی ئەوان نەفی ئەوە ناکەن کە خودا زاتێکە بە توانایە، زانایە، زیندووە، بۆیە گەر لەڕووی ڕوواڵەتەوە نەفی سیفاتەکان وەربگرین، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خودا زاتێکە نە بە توانایە، نە زانایە، نە زیندووشە - بەرز و بڵندیش بۆ خودا گەر وابێت - بەڵام ئەوەی کە موعتەزیلە نەفی دەکات ئەوەیە ئیسپاتی سیفەتەکانە

که هەر لە ئەزەلەوە هەبوون و هەربووە، وەك هەربوویەکی جیاواز کە ناکرێت لە خودا جیابکرێتەوە، هەبوو گەلێك بوون کە لەپاڵ زاتی خودادا جیاواز نەبوون لەخودا و لەگەڵیدابوون، بۆیە دەبینین هەندێکیان وتویانە خودا زانایە بە زانست و زانستەکەش خودی خۆیەتی، هەندێکی تریشیان ئیسپاتی ئەوەیان کردووە کە سیفەتەکان هیچ نییە جگە لەوە نەبێ کە یان "حاڵەتە یان مانایە" ئەمەش بۆ ئەوەی لە بەهاکانیان کەمکاتەوە، چونکە سیفەتەکان بەهاکەیان دەرناکەوێت مەگەر کاتێك کە پەیوەست بێت بە زاتی پەروەردگارەوە، گەر خۆیان بە تەنهابوون ئەو کاتە ناتوانن دەرکەون و گرنگیەکی ئەوتۆیان نییە.

بینیمان ئەوەی کە وای لەموعتەزیلە کرد ئەم ڕێگایە بگرێتە بەر لە مەسەلەی سیفەتەکاندا، قەدەغەکردنی هەر بنەڕەتێك بوو کە - بە تێپەڕبوونی کات - سەر بکێشێت بۆ فرە قەدیمی و دواجار بکەوێتە نێو هەمان ئەو هەڵەیەی کە گاورەکان تێی کەوتن، ئەوەبوو وتیان خودا لەڕووی جەوهەرەوە تەنهایە، بەڵام لەڕووی سیفاتەوە سیانە، مەبەست پێی سێ کوچکەی سیفەتەکانی "وجود، حیاة، علم"ە کە ناویان لێناوە (الأب، الأبن، روح القدس).

هەروەها کاتێك کە موعتەزیلە دەڵێ قورئان مەخلوقە و دروستکراوە، بەهۆی هەمان هۆکارەوە بوو کە پێشتر باسمان لێوە کرد، چونکە بڕوایان وابوو گەر نەڵێین قورئان مەخلوقە و دروستکراوە، ئەوا دەبێتە هۆی ئەوەی کە بڵێین قورئان "قەدیم"ە کۆنە و هەربووە لەگەڵ خودادا، ئەمەش دەبێتە هۆی فرە قەدیمی، جا ئامانجی موعتەزیلەش لەهەموو ئەمانەدا پاراستنی بیروباوەڕی یەکتاپەرستی بووە لەهەر گومانێك کە خاڵی بکاتەوە لە ناوەڕۆکی ئەو بیروباوەڕە.

## • بۆچوونیان سەبارەت بە قەدەر:

لای موعتەزیلە ئەوە ئاشکرابوو سەبارەت بەو کەسانەی کە پێیان وایە مرۆڤ لەو کردەوانەی کە دەیکات هیچ ویستێکی خۆی تێدانیە و ناچارە ئەنجامیان بدات، جا ئایا ئەو کردەوانە کردەوەی چاکەبن یان کردەوەی خراپە، هەرچی موعتەزیلەشە ئەوا بینی گەر ئەم بۆچوونە بەردەوام بێت ئەوە بێگومان وا لە مرۆڤەکان دەکات هەموو پاڵدەنەوە و پشتی لێ بکەنەوە، جا گەر لەهەموو شتێکدا ناچاریم ئەو کردەوە بکەم، ئیتر بۆچی کردەوەی چاکە دەکەم؟ ئەی گەر کردەوەی خراپەم بکردایە چی دەبوو؟ بەڵکو ئەی بۆچی هەموو ئەو کردەوانە دەکەم؟ لەکاتێکدا هەموو ئەمانە بەزۆر پێم کراوە.

بەڵام موعتەزیلە هات وتی مرۆڤ لە کردەوەکانیدا ئازادە و بڕیار بەدەستە، ئازادە لە ئەنجامدانی هەر کردەوەیەك کە دەیکات، ئەوەیان ڕوونکردەوە کە بۆچی خودا لێپرسینەوە و سزا و پاداشتی داناوە، بۆیە هیچ بەرپرسیاریەتیەکت لەسەرشان نییە گەر تۆ هیچ کردەوەیەکی خراپ نەکەیت کە لەسەری لێپرسینەوەت لەگەڵدا بکرێت، بۆیە کاربکە و خۆت بە دوور بگرە لە پشتکردنەوە و پاڵدانەوە، چونکە تۆ بەرهەمی ئەوە وەردەگریتەوە کە چاندووتە.

ئەوەبوو نەیارەکانی موعتەزیلە ئەم بۆچوونەیان بەدڵ نەبوو، بۆیە وەسفیانکردن بەوەی کە ئەوانە قەدەرییەن، چونکە نەفی قەدەریان لەخودا کردوەتەوە و خستوویانەتە پاڵی خۆیان.

جا ئایا ـ بەڕاستی ـ موعتەزیلەکان نەفی قەدەریان لە خودا کردووەتەوە؟

لەڕاستیدا دەبینین کە موعتەزیلە لەچوارچێوەی ئازادی مرۆڤەکاندا لەو کردەوانە دەرچوون کە دەسەڵاتمان تیایدا نییە، وەك نەخۆشی و مردن و ژیان، چونکە هەموو ئەمانە ویست و ئیرادەی خودای لەسەرە و مرۆڤ هیچ ویستێکی تێدا نییە، بۆیە تێڕوانینیان سەبارەت بە قەدەر خۆی لە چوارچێوەی کردارە تەکلیفیەکاندا دەبینێتەوە، خودا بۆ ویستی مرۆڤەکانی جێهێشتووە، چونکە ناچێتە ئەقڵەوە خودا داوامان لێ بکات کردەوەیەك ئەنجام بدەین یان ڕێگریمان لێ بکات لە کردەوەیەك، لەکاتێکدا هیچ دەسەڵاتێکمان تیایدا نەبێت، بۆیە ئەمە هەرگیز هاوڕانیە لەگەڵ عەدل و دادگەری خودای گەورەدا، کەواتە کردەوەی تەکلیفی "ئەرك" تەوەری ئازادی و ویستی مرۆڤەکانە، لەگەڵ ئەوەشدا موعتەزیلە نەیان وتووە کە مرۆڤ خۆی بۆ خۆی بەرەهایی خوڵقێنەری هەموو کردەوەکانیەتی، بەڵکو وتویانە ئەو کردەوەی کە مرۆڤ ئەنجامی دەدا ویست و ئیرادەی خودای تێدایە، هەروەها لەگەڵ ئەوەی کە باوەڕیان بە ـ ئازادی و ویستی مرۆڤەکان ـ هەبووە لەکردەوەکانیاندا، بەڵام هیچ کات نەفی زانست و عیلمی خودایان نەکردووە، چونکە خودا عیلمی هەیە چی ڕوودەدا و چی دەبێت، بۆیە عیلمی خودا هەرگیز لەگەڵ ئازادی مرۆڤەکاندا ناکۆك نییە.

- ## هەڵوێستیان لە بارەی سوننەت و شەفاعەتەوە:

یەکێك لەو عەیبانەی کە زۆربەی ئەهلی سوننە لەموعتەزیلەی دەگرن ئەوەیە کە نەفی زۆربەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) دەکەن، بەجۆرێك وەسفیان دەکەن کە ئەمانە نەفی سوننەت دەکەن، بەڵام ئایا تا چەند ئەم قسەیە ڕاستە؟

ئەوەی کە زانراوە زۆربەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) فەرموودەی "ئاحاد"ن، بۆیە دەبینین کە "ئەبو حەنیفە" زۆر توندبووە لە وەرگرتن و قەبوڵکردنی فەرموودەکاندا، هیچ فەرموودەیەکی وەرنەدەگرت گەر فەرموودەکە "متواتر" یان "مشهور" نەبوایە، بەڵام ئەو فەرموودانەی کە "ئاحاد"بوون دەبوو ڕاویەکەی جێگەی متمانە بوایە ئەوجا وەریدەگرت، یان هەندێ مەرجی دانابوو کە دەبوو لە ڕاویەکەدا هەبوایە ئەوجا فەرموودەکەی لێوەردەگرت و کاری پێدەکرد، بۆیە دەبینین حەڤدە فەرموودەی بە "صەحیح" داناوە و وەریگرتووە، جا ئایا ئەبو حەنیفە سوننەتی ڕەتکردووەتەوە و نکوڵی لێکردووە؟!

ئەوەتا لە موسنەدی ئیمام ئەحمەدیشدا دەبینین کە چل هەزار و ئەوەندە فەرموودەی تێدایە، ئەمە لەکاتێکدا صەحیحی بوخاری تەنها چوار هەزار فەرموودەی تێدایە، بەهەمان شێوە لە "موطأ" ئیمام مالیك لە هەزار فەرموودە تێناپەڕێت، ئایا ئەمە ئینکاریکردنی سوننەتە؟! لەڕاستیدا زانا و فەقیهەکان ڕای جیاوازیان هەیە سەبارەت بە دانانی مەرج لەسەر وەرگرتنی فەرموودە تا لەڕێگەیەوە بڕیار لەسەر ڕاست و دروست و لاوازی فەرموودە بدەن، بۆیە هەر کاتێ مەرجەکان توند بوایە ژمارەی فەرموودە صەحیحەکان کەمتر دەبوو وەك ئەوەی لای ئیمام ئەبو حەنیفە ڕوویدا، هەر کاتێکیش مەرجەکان کەمبوونایە ژمارەی فەرموودە صەحیحەکان زیادیدەکرد، کەواتە مەسەلەکە مەسەلەیەکی جیاوازییە بۆیە هاوڕانین لەسەر فەرموودەکان، جا موعتەزیلە لەم مەسەلەیەدا حاڵیان وەك حاڵی فەقیهو زاناکانی تر وابووە، مافی خۆیانە بڕیار لەسەر ڕاست و دروست و لاوازی فەرموودە بدەن، یان فەرموودەیەك وەربگرن و کاری پێ بکەن یان بە پێچەوانەوە ڕەتیکەنەوە.

هەرچی مەسەلەی شەفاعەتیشە "تکاکاری" ئەوا لقێکە لە مەسەلەکەی پێشوو، بۆیە دەبینین موعتەزیلە کاریان بە فەرموودەی "شەفاعەت" نەکردووە و وەریان نەگرتووە، کاتێکیش دان دەنێن بە شەفاعەتدا وتویانە تەنها شەفاعەت بۆ کەسانی بڕوادارە بۆ ئەوەی نیعمەتەکانیان بۆ زیاد بکرێت نەك بۆ ئەوەی بەهۆی شەفاعەتەوە پێی بچێتە بەهەشتەوە، لەبەر ئەوە پێیان وایە شەفاعەت بۆ کەسێك نییە کە گوناهی گەورەی ئەنجام دابێت، گەر ئەمە وابێت ئەوا پاداشت و سزا هیچ بەهایەکی نامێنێت و پوچەڵ دەبێتەوە، دەی ئەمەش لای ئەوان دروست نییە، سەرباری ئەوەش گەر شەفاعەتی پێغەمبەر (درودی خودای لێبێت) ئەو کەسانە بگرێتەوە کە گوناهی گەورە ئەنجام دەدەن، ئەوە دەبێتە مایەی ئەوەی خەڵکی پاڵی لێدەدەنەوە و تاوانی تریش ئەنجام دەدەن، جا ئەو کاتە دەڵێن چوونە نێو بەهەشتیش هەر بە شەفاعەتە.

## ● ئەقڵ و نەقڵ:

گومانی تێدانیە کە موعتەزیلە ئەهلی عەقڵن و زۆربەی بیروباوەڕە ئاینیەکانیشیان لە ئەقڵەوە سەرچاوە دەگرێت و ئەقڵ تیایدا ڕۆڵێکی گەورەی تێدا بینیووە کە ناکرێت نکۆڵی لەوە بکرێت، تەنانەت زۆرێك لە توێژەرانی ئەو بوارە پێیان وایە موعتەزیلە عەقڵیان پێش دەق خستووە، بە جۆرێك گەر دژایەتیش لەنێوانیاندا هەبێت ئەوا تەئویلی دەقەکەیان کردووە تا پێك بێتەوە لەگەڵ ئەوەدا کە ئەقڵ پێی گەیشتووە، موعتەزیلە خۆیان دەڵێن بەڵگەی ئەقڵی سەرەکیە و هەرچی لە ئەقڵ تێپەڕیکرد ئەوە لاوەکیە.

بەڵام ئەم قسەیە کەمێك وردەکاری تێدا نییە، چونکە خاڵی دەستپێك لای کەلامیەکان لە نەقڵدا خۆی دەبینێتەوە، ئەوەش لە دیندا وەك بیروباوەڕ

سەلماوە، بە پێچەوانەی فەیلەسوفەکانەوە کە خاڵی دەسپێك لایان خۆی لە ئەقڵدا دەبینێتەوە، ئەو بڕوای بەشتێك هەیە کە ئەقڵ پێی دەکات.[٣٧٥]

موعتەزیلەش بەو پێیەی کە یەکێکە لە گروپەکانی ئەهلی کەلام، خاڵی دەستپێکیان بریتی بووە لە نەقڵ، ڕێبازەکەشیان لەو بارەوە ئەوەیە کە نەقڵیان دابەشکردووە بەسەر "مُحکم و مُتشابه"دا ئەوجا ئایەتە "مُتشابه"ەکانیان واز لێهێناوە بۆ ئەو ئایەتانەی کە "مُحکم"ن، گەر جیاوازییەکیش ببینن لەنێوان ئایەتەکانی "مُحکم و مُتشابه"دا ئەوا ئایەتە (مُتشابه) کەیان تەئویل کردووە بۆ ئایەتە (مُحکم)ە کە.

بۆ نموونە ئەوان لە ڕێبازەکەیاندا بۆ دانانی بنەمای یەکەم کە بنەمای یەکتاپەرستیە ـ التوحید ـ خاڵی دەستپێکیان ئەم ئایەتە پیرۆزەیە کە خودا دەفەرموێت: ﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَيْءٌ﴾.[٣٧٦] واتە: (هیچ شتێك نییە لە وێنەی ئەو خودایە ـ نە لە زاتیا، نە لە سیفاتیا، نە لە کرداریدا). بەم پێیە ـ ئەم ئایەتە لای ئەوان یەکێکە لە ئایەتە (مُحکم)ەکان ـ ئیتر لێرەوە بنەماکانیان داناوە لەسەر سیفاتەکانی خودا و وتویانە قورئان مەخلوقە و دروستکراوە، بۆیە هەموو ئەو ئایەتانەی کە ئاماژەی تەشبیهی خودا دەکات بە دروستکراوەکانی تەئویلیان کردووە و نەفی بینینی خوداشیان کردووە، پاڵنەری هەموو ئەمانەش نەقڵ بووە نەوەك ئەقڵ.

هەروەها سەبارەت بە عەقیدەی "أصلح" چاکتر ئەوەیە کە دەڵێن ئەو منداڵانەی کە خودا دەزانێ گەر بمانایە بڕوادار دەبوون، یان ئەو فاسیقانەی

---

[٣٧٥] ـ بڕوانە پەراوێزی ژمارە ٦٤ لەم کتێبەدا.

[٣٧٦] ـ سورەتی ـ الشوری ـ ئایەتی ١١.

گەر بمانایا لەژیاندا تەوبەیان دەکرد، ئەوە خودا پێش ئەوە نەیدەمراندن.[٣٧٧]
بە سەرنجدان لەو وتەی ڕابردوو ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە موعتەزیلە کاتێك لەبارەی عەقیدەی چاکترینەوە بۆچوونیان دەربڕیووە، ئەوە لەڕوانگەی ئەقڵی ڕووتەوە نەیان وتووە، بەڵکو لە قورئانەوە وەریانگرتووە، ئەوەتا خودا بۆ خۆی لە باسی چیرۆکی موسا پێغەمبەر (سەلامی خودای لێبێت) لەگەڵ "خضر"دا دەفەرموێت: ﴿فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَـٰمًا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾﴾.[٣٧٨] واتە: (ڕۆیشتن کەوتنەڕێ، هەتا گەیشتنە منداڵێك، زاناکە گرتی و کوشتی، موسا وتی: سەیرە، ئەوە بۆچی کەسێکی بێ گوناهت کوشت بێ ئەوەی ئەو تاوانێکی وای کردبێت و ـ شایستەی کوشتن بێت ـ سوێند بەخودا بەڕاستی کارێکی ناپەسەند و ناڕەوات ئەنجامدا!!). پاشان خودا دەفەرموێت: ﴿وَأَمَّا ٱلْغُلَـٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَـٰنًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾﴾.[٣٧٩] واتە: (سەبارەت بەو منداڵەی ـ کە کوشتم ـ دایك و باوکێکی ئیمانداری هەبوو، ترساین لەوەی کە بەسەرکەشی و بێ دینی و خوا نەناسی هیلاك و ماندوویان بکات ـ چونکە هەر لە ئێستاوە سەرکەشی و لاساری پێوە دیاربوو، ـ بەو کارەمان ـ ویستمان کە پەروەردگاری

---

[٣٧٧] ـ بڕوانە سەرچاوەی پێشوو.
[٣٧٨] ـ سورەتی ـ الكهف ـ ئایەتی ٧٤.
[٣٧٩] ـ سورەتی ـ الكهف ـ ئایەتی ٨٠ ، ٨١.

ـ لەجیاتی ئەو ـ پاکتر و چاکتریان پێ ببەخشێت و بە منداڵێکی خاوەن بەزەیی و میهرەبانتر بەهرەوەریان بکات ـ منداڵەکەش بەهەشتی بێت ـ).

لە تەفسیری "ئیبن کەثیر"دا هاتووە پێغەمبەر (درودی خوای لێبێت) فەرموویەتی: (ئەو منداڵەی کە "خضر" کوشتی خودا مۆری کافری لە دڵدابوو کە بە کافری لە دایك دەبێ، واتە ئەو ڕۆژەی خودا بڕیاری لەبارەیەوە داوە بەکافری بڕیاری لەسەرداوە)، قەتادەش دەڵێ: کاتێك دایك و باوکی منداڵەکەیان پەیدا بوو زۆر پێی دڵخۆش بوون، کاتێکیش کوژرا پێی خەمبار بوون، بۆیە گەر بمایە دەبوویە مایەی تیاچوونی باوك و دایکی، کەواتە باشتر وایە مرۆڤ ڕازی بێت بە قەزا و قەدەری خودا ـ چونکە قەزای خودا لە شتێکدا کە بڕوادارەکە پێی ناخۆشە باشترە لە قەزایەك کە بەلایەوە پێی خۆشە، ڕاستی ئەوەش لە فەرموودەدا هاتووە: (هەر قەزایەك لەلایەن خوداوە بۆ بڕوادار بێتە پێش خێری تێدایە بۆی).[٣٨٠]

جا کەواتە دەگەینە ئەوەی کە "نەقل" خاڵی دەستپێکە لە عەقیدە و بیروباوەڕی " أصلح"دا، نموونەی سێهەمیش بە پێی بۆچوونی "نەظام" ئەوەیە کە خودا دروستکردنی ئادەمی لە پێش منداڵەکانیەوە پێش نەخستووە، بەڵکو خودا هەندێکیانی لە هەندێکیاندا شاردووەتەوە، بۆیە پێش خستن و دواخستنی لە دەرکەوتنەکەیدایە کە شاراوەیە، بەڵام کاتی دەرکەوتنیان جیاوازە.[٣٨١]

شەهرستانی ڕەخنە لەو بۆچوونەی پێشوو دەگرێت و دەڵێت: (لەڕاستیدا "نەظام" ئەم دەقەی لەو کەسانەوە هێناوە کە پێیان وایە "هەموو بوونەوەر

---

[٣٨٠]ـ تفسیر القرآن العظیم ـ جـ٣ ـ ل٩٦.

[٣٨١]ـ بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، بڕوانە ـ شەهرستانی ـ الملل و النحل ـ ل١٧٤.

لەناو یەکدایە بەشاراوەیی و دواتر لێی جیادەبێتەوە"، هەرچی فەیلەسوفەکانیشە ئەوا بۆچوونی ئاشکرایان ئەوەیە کە زیاتر سروشتیەکانیان بەلاوە لەپێشترە نەك ئەوانەی دینی بیر دەکەنەوە).[٣٨٢]

جا لێرەدا دەبینین کە "نەظام" لە قسەکەی پێشویدا بەڵگەی بە نەقڵ هێناوەتەوە، کە خودا دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ أَخَذَ رَبُّكَ مِنۢ بَنِىٓ ءَادَمَ مِن ظُهُورِهِمْ ذُرِّيَّتَهُمْ وَأَشْهَدَهُمْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ أَلَسْتُ بِرَبِّكُمْ ۖ قَالُوا۟ بَلَىٰ ۛ شَهِدْنَآ ۛ أَن تَقُولُوا۟ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ إِنَّا كُنَّا عَنْ هَـٰذَا غَـٰفِلِينَ ﴿١٧٢﴾ أَوْ تَقُولُوٓا۟ إِنَّمَآ أَشْرَكَ ءَابَآؤُنَا مِن قَبْلُ وَكُنَّا ذُرِّيَّةً مِّنۢ بَعْدِهِمْ ۖ أَفَتُهْلِكُنَا بِمَا فَعَلَ ٱلْمُبْطِلُونَ﴾.[٣٨٣]

واتە: (ئەو کاتە وەبیر بێنە کە پەروەردگارت لەپشتی نەوەکانی ئادەم وەچە و نەوەی وە دەرهێنا و پەیمانی لێوەرگرتن و کردنی بە شایەت لەسەر خۆیان بۆ یەك خوداپەرستی، ئەوجا فەرمووی: ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم؟! هەموو وتیان: بەڵێ، ئێمە شایەتی دەدەین کە تۆ خودای ئێمەیت. ئەمەش بۆ ئەوەی نەبادا لەرۆژی قیامەتدا بڵێن: بەڕاستی ئێمە لەم یەکتاپەرستیە بێ ئاگا و غافڵ بووین. یان نەوەك بڵێن باو و باپیرانمان ـ لە پێش ئێمەوە ـ هاوەڵانیان بۆ خودا دانا، ئەوسا ئێمەش چاومان لێکردن، ئەگینا وانەبووین، ئێمە نەوەیەك بووین دوای ئەوان هاتین و چاومان لەوان کرد، ئاگامان لە هیچ شتێك نەبوو، ئایا ـ خودایا ـ دەتەوێ ئێستا بەهۆی کار و کرداری ناهەق بێژان و بەتاڵکارانەوە لە ناومان ببەیت؟!).

---

[٣٨٢] ـ هەمان سەرچاوە و لاپەڕەی پێشوو.

[٣٨٣] ـ سورەتی ـ الأعراف ـ ئایەتی ١٧٢، ١٧٣.

شێخ موحەممەد متەوەلی شەعراوی لە تەفسیری ئەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا دەڵێت: (.. خودا ژیانی هەموو بەیەك جار دروستکردووە و خستوویەتیە پشتی ئادەمەوە.. لە پاش ئەوە ئەڕوات بەو "شیفرەدا"[٣٨٤] کە یەکەمین تۆوی ژیانی وە دیهێناوە. ئەو کاتە ئەم "شیفرەیە" هەموو جۆرەکانی ئەو ژیانەی کە ئێمە دەیبینین پیشانمان دەدا، هەتا ئەو کاتەی ئەو "شیفرەیە" کە خودا لەپشتی ئادەمدا وەدیهێناوە کۆتایی دێت و ژیانیش کۆتایی دێت، واتە: "هەتا مرۆڤەکان بمێنن ئەم شیفرەیە لەپشتی ئادەمدا کۆتایی نایێ و دەمێنێت" بۆیە سەبارەت بە پێناسەی ژیان وتراوە: ژیان کۆمەڵێك کاروبارە کە خودای گەورە نیشانی ئەدا و کەسی تر ناتوانێ وەك خودای گەورە نیشانی بدا، واتە: وردە وردە خودا ئەو شتانەمان بۆ دەردەخات و بەشێوازی قۆناغ بە قۆناغ دێنە بوونەوەرەوە، بەلاَم بەدیهێنەری یەکەمیان خودایە و ئەو سەرەتا دروستیکردووە).[٣٨٥]

ئەمەش تەفسیری شێخ موحەممەد متوەلی شەعراویە کە خەریکە لەگەڵ ئەو بۆچوونەی کە "نەظام" وتی هاوڕابێتەوە، جا ئایا "نەظام" لەسەر حەق بووە یان ئەوەتا شێخ شعراوی ئەم دەقەی لەو کەسانەوە وەرگرتووە کە پێیان وایە "هەموو بوونەوەر لەناو یەکدایە بەشاراوەیی و دواتر لێی جیابووەتەوە" و زیاتر مەیلی بە لای ڕێبازی سروشتیەکانەوە بووە و بۆچوونی ئەوانی لە پێشتر گرتووە؟!!

لەمەی پێشوودا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە خاڵی دەرچوون لای موعتەزیلەکان کە دەستیان پێکرد و بنەماکانیان لە سەر بونیادنا خۆی لە"نەقڵ"دا دەبینێتەوە، وە هەر لەڕێگەی نەقڵیشەوە ڕێسا گشتیەکانیان

---

[٣٨٤] ـ مەبەست پێی ئەو شوێنەیە کە ئاوی پیاوی تێدا کۆبووەتەوە.

[٣٨٥] ـ سلسلة معجزة القرآن ـ جـ١٢ ـ ل٥.

بونیادنا بۆ مەزهەبەکەیان، بۆیە مەزهەبەکەیان بریتی یە لە مەزهەبێکی ئەقلانی و سەرەتا و کۆتایی هەر لە ئەقڵەوە سەرچاوە دەگرێت.

## • موعتەزیلە و میحنەتی خەلقی قورئان:

هیچ کەس نکۆڵی لەوە ناکات کەموعتەزیلە لەمەسەلەی میحنەتی خەلقی قورئاندا هەڵەی کردووە، جا هەڵەی موعتەزیلەش لێرەدا هەڵەیەکی عەقائیدی نەبووە لە ناوەڕۆکدا، بەڵکو هەڵەکەیان کەوتووەتە سەر شێوازی گەیاندنی ئەو مەزهەبەی کە بڕوایان پێی بووە، لەڕاستیدا ئەوان بڕوایان وابووە گەر بگەنە دەسەلأت لەڕێگەی هێزەوە دەتوانن زەمانەتی ئەوە دەست بخەن مەزهەبەکەیان بلأوببێتەوە، ئەو کاتە خەڵکیش لەڕێگەی ئەم فشارەوە مەزهەبەکەیان وەردەگرێت و بڕوایان پێ دێنن، بەلأم ئەوەی ڕوویدا پێچەوانەی ئەوەبوو کە چاوەڕوانیان دەکرد، ئەوەبوو بە هۆی ئەم کارەیانەوە خەڵکی لە موعتەزیلە و هاوەڵەکانیان بێزار بوون و حەقیقەتی ئەوانیان بۆ دەرکەوت، پاش ئەوەی موعتەزیلە پشتگیری دەسەلأتیان لەدەستدا، فەرموودەناس و ئەشعەرییەکان لەهەموو لایەکەوە بەرامبەریان بوونەوە و تانەیان لە هەموو قسەکانیان دەدا، تا وای لێهات مەزهەبەکەیان کەنارکەوت و پووکایەوە.

لەڕاستیدا لێرەدا هەڵەکە هەڵەی موعتەزیلە نەبوو بە تەنها، بەڵکو دەسەلأتیش لەو هەڵەیەدا پشکی گەورەی تیادا هەبوو، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت گەر دەسەلأت پشتگیری هەر مەزهەبێکی دیاریکراوی کرد، ئەوا ئیتر دەبێت ئەو خەڵکە هەموو پابەندبن پێیەوە و بچنە سەر ئەو مەزهەبە، چونکە مرۆڤ ئازادە لەوەی قەبوڵی چ مەزهەبێك دەکات یان چ مەزهەبێك ڕەت دەکاتەوە، ئەوەتا

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِ﴾. [٢٨٦] واتە: (لە دینی ئیسلامدا داسەپاندن و ناچار کردن و زەبر و زەنگ نییە بۆ دینداری و وەرگرتنی ئاینی ئیسلام). بە باوەڕی من گەر موعتەزیلە ئەم جۆرە شێوازەیان نەگرتبایەتە بەر، ئەوا مەزهەبەکەیان بڵاوەی دەکرد و دەمایەوە، چونکە مەزهەبێکی وەکو ئەمە کە ئەقڵی مرۆڤی بە گەورە گرتووە و بەرگری لە ئازادی مرۆڤەکان کردەوە، شایان بوو خەڵکی شوێنی بکەوێت نەك بخرێتە گۆشەیەکەوە و بپوکێتەوە.

## • ئامانجەکانی موعتەزیلە:

بە دیراسەکردنمان بۆ ئەم چەند لاپەڕەی کتێبە کە تیایدا موعتەزیلە باس لە بنەما و ڕیساکان دەکات، کۆتایمان بە هەندێ مەسەلە هێنا کە فیکری موعتەزیلە دەستی بۆ بردووە، پاش ئەوە ئیتر ئامادەین بۆ ئەوەی ئەو ئامانجانەی کە موعتەزیلە هەوڵی بەدیهێنانی دەدا هەڵیان گۆزین، تا ڕێگە بە خۆمان بدەین کە لەبارەی مەزهەبەکەیانەوە بڕیار بدەین.

یەکێك لە گرنگترین ئەمانجەکانی موعتەزیلە بەرگریکردن بوو لە عەدالەتی خودا و یەکتاپەرستی، تەنانەت خۆشەویسترین ناو کە بۆ خۆیان هەڵبژارد بوو "ئەهلی عەدل و تەوحید" بوو، جا بە هۆی بەرگریکردنیان لە بنەمای "عەدل و تەحید" دووچاری ئازار و ناڕەحەتی بوونەوە لەلایەن نەیارەکانیانەوە، تەنانەت شتانێکیان دراوەتە پاڵ کە شایانی ئەوان نەبووە، ئەوەتا خاوەنی کتێبی "فضیحة المعتزلة"ی ئیبن راوەندی پێی وایە و هاوکات "خەیاط"یش وەڵامی

---

[٢٨٦] - سورەتی - البقرة - ئایەتی: ٢٥٦.

داوەتەوە لە کتێبە بەناوبانگەکەیدا "الإنتصار و الرد علی إبن الراوندي الملحد"، ئیبن راوەندی دەگێڕێتەوە کە "جاحظ" وتویەتی: قورئان لاشەی هەیە دەکرێت جارێك بچێتە سەر شێوەی پیاوێك و جارێکیش بچێتە سەر شێوەی ئاژەڵ![287] جا نەك "جاحظ" تەنانەت بگرە چ موسڵمانێك دەچێت بە ئەقڵیدا قسەیەکی لەو جۆرە بکات، بەڵام وا دەردەکەوێت ئیبن راوەندی گاڵتە بە موعتەزیلەکان دەکات لەبارەی ئەوەی کە دەڵێن قورئان مەخلوقە و دروستکراوە.

شەهرستانی باس دەکات کە "ئەحمەدی کوڕی خابط و فەضلی حدثی" کە یارانی نەظام بوون ـ بڕیارێك لە بڕیارە خوداییەکانی مەسیحیان (سەلامی خودای لێبێت) سەلماندووە، لەمەشدا لەگەڵ گاورەکاندا هاوڕان کە بڕوایان وایە مەسیح لەڕۆژی دواییدا لێپرسینەوە لە خەڵکی دەکات، ئەم ئایەتە پیرۆزە دەکەنە بەڵگە بۆ قسەکانیان کە خودا دەفەرموێت: ﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ٢٢﴾.[288] واتە: (لەو ڕۆژەدا پەروەردگارت هات بە هاتنێك کە شیاوی خۆی بێت، فریشتەکانیش لەگەڵی ڕیز ڕیز). هاتنەکەش وەك پەڵە هەورێك وایە کەدێن، کە بەم ئایەتە مانای دەکەن ﴿ أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ ﴾.[289] واتە: (یان پەروەردگارت لە وێستگەی قیامەتدا بێتە لایان بێ چەند و چوون؟). "ئەحمەدی کوڕی خابط" بڕوای وایە کە مەسیح لەو ڕۆژەدا خۆی زرێپۆش کردووە، کە ئەمەش وشەیەکی کۆنە و گاورەکان ئەمەیان وتووە.[290]

---

[287]ـ الشهرستاني ـ الملل و النحل ـ ص٩٢.

[288]ـ سورەتی ـ الفجر ـ ئایەتی: ٢٢.

[289]ـ سورەتی ـ الأنعام ـ ئایەتی: ١٥٨.

[290]ـ الملل و النحل ـ جـ١ ـ ل٧٩ ، ٨٠.

لێرەدا زۆر بەئاسانی دەتوانین تەواوی درۆکانی ئەم ڕیوایەتە بخەینەڕوو لەوەی کە داویانەتە پاڵ موعتەزیلە، چونکە کاتێك موعتەزیلە نەفی سیفەتەکانی خودایانکردووە ـ کە پێشتر لەم کتێبەدا بە درێژی باسمان لێوەکرد ـ ئامانجی سەرەکیان دوورکەوتنەوە بوو لەفرە قەدیمی و ڕەتکردنەوەی هەر گومانێکیش کە ئاماژەی تیدا بێت و سەر بکێشێت بۆ ئەم فرە قەدیمیە، کاتێکیش کە وتویانە قورئان مەخلوقە و کەلامی خودا نییە، بۆ ئەوە بووە نەفی قەدیمی قورئان بکەن، بۆ ئەوەی نەکەونە ناو ئەوەی کە گاورەکان تێی کەوتن و وتیان مەسیحی کوڕی مەریەم قەدیمە، ئیتر چۆن ئەوان بەرگری لە "تەوحید و یەکتاپەرستی" دەکەن بەم شێوەیە و بڕوا بەم شتانە دەکەن ـ گەر ئەمانە ڕاست بێت ـ لە ئیسلام پێی دەر دەچنە دەرەوە. لەڕاستیدا بەڵگە بەهێزەکانی موعتەزیلە و شکست پێهێنانی نەیارەکانیان لە ڕێگەی زۆرێك لەو دیدارانەی کە دەیانبەست، هەموو ئەمانە بوونە هۆی ئەوەی نەیارەکانیان شتانێکیان بۆ هەڵبەستن کە لەواندا نەبووە، بەلأم تەنها ویستوویانە وێنای ئەمانی پێ بشێوێنن.

بۆیە موعتەزیلە گەیشتبوویە ئەو قەناعەتەی مرۆڤ کە زانی ناچارە لەبەرامبەر ئەو کردەوەی کە دەیکات و بە هۆی شەفاعەت و تکای پێغەمبەریشەوە (درودی خودای لێبێت) دەچێتە بەهەشتەوە، ئەو کاتە زیاتر پشتوێنی لێ شل دەکات و پاڵی لێدەداتەوە، ئیتر بۆچی کار بکات و بۆچی کار نەکات؟ بۆیە موعتەزیلە هات و وتی مرۆڤ ئازادە و بە دەست خۆیەتی ئەو کردەوەی دەیەوێت ئەنجامی بدات، هەروەها لەبارەی شەفاعەتیشەوە تێڕوانینیان خستووەتە ڕوو ـ وەك ئەوەی کە بینیمان ـ بۆ ئەوەی ڕێ بگرێت لەم

پاڵدانەوەیە کە ئەگەر ئەم پاڵدانەوەیە دووچاری بەهێزترین کۆمەڵگاش ببێتەوە، ئەوا بەرەو لەناوچوونی دەبات.

بینیمان کە موعتەزیلەکان بەردەوام بانگەشەیان کردووە بۆ ئەوەی ڕووانینە ئەقڵیەکان کار پێ بکرێت، ئەوەشمان بینی کە چۆن لەڕێگەی ئەم ڕوانینەوە بەڵگەیان دەهێنایەوە بۆ بوونی خودا، قورئانی پیرۆزیش خەڵکی بانگ دەکات بۆ بیرکردنەوە و بەگەڕخستنی ئەقڵ، وەك دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِى مَدَّ ٱلْأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَٰسِىَ وَأَنْهَـٰرًا ۖ وَمِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ جَعَلَ فِيهَا زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ ۖ يُغْشِى ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ ۚ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ۝٣﴾.[291] واتە: (خودا ئەو زاتەیە کە زەوی بەهەموو بارێکا ڕاکێشاوە و فراوان ڕایخستووە بۆتان، بەشێوەیەك کە بە کەڵکی ژیان بێت، وە چەند شاخ و کێوێکی تێدا دامەزراندووە تا زەوی پێدامرکێت و لەرە لەر نەکات و ئێوەش بتوانن بەسەرییەوە بژین، هەروەها چەند ڕووبارێکی ڕەوانیشی تێدا بەدیهێناوە، تا بۆ سوود و قازانجی خۆتان بەکاریان بهێنن، وە لەهەموو جۆری میوەکاندا دوو جووتی تێدا دروستکردووە ـ ترش و شیرین، ڕەش و سپی، گەورە و بچووك، یان نێر و مێیی بەدیهێناوە بۆ متوربە کردنی یەکتر بۆ ئێوە ـ بە تاریکی شەو ڕۆژ دادەپۆشێ، بێگومان لەو گشت ئاڵ و گۆڕانەدا چەندین ئایەت و نیشانەی گەورە و مەزن هەیە لەسەر بوون و تاك و تەنیایی، دەسەڵاتی بێ سنووری خودا بۆ گەلێك ڕادەمێنن و بیردەکەنەوە و کوێرانە بەسەر ئەم بوونەوەرەدا ناچن). هەروەها لەئایەتێکی تردا خودا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ

[291] ـ سورەتی ـ الرعد ـ ئایەتی: ٣.

﴿لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿٤﴾﴾.[٣٩٢] واته: (بەڕاستی لەو شتانەی کە باسکران، گەلێ بەڵگە و نیشانە هەیە بۆ ئەوانەی کە بە وردی بیر دەکەنەوە لە دەسەڵات و توانای خودای گەورە و ئاوەزی خۆیان دەخەنە گەڕ).

لەگەڵ ئەوەی کە موعتەزیلەکان پشتیان بە تێڕوانینە ئەقڵیەکان بەستووە، دەبینین خاڵی دەسپێك لای ئەوان سەرەتا لە نەقڵەوە سەرچاوە دەگرێت، چونکە ئەوان پێش هەر شتێك موسڵمانبوون، ئەوجا ئەوان بیردەکەنەوە و شکۆ بۆ ئەقڵی مرۆڤایەتی دادەنێن و ڕێزی لێدەگرن، ئەو نیعمەتەی کە خودا بە بەندەکانی بەخشیووە تا شتی چاك و خراپی پێ جیا بکەنەوە و بیر لە مەلەکوتی خوداش بکەنەوە، بۆ ئەوەی باوەڕ و ئیمانیان پێ زیاد ببێت.

ئامانجەکانی موعتەزیلەش بریتیە لە: بەرگریکردن لە عەدالەت و یەکتاپەرستی خودا، بەرگریکردن لە ئازادی مرۆڤایەتی و کۆتایی هێنان بە "تواکل" پاڵدانەوە، بانگەوازکردن بۆ تێڕوانینی ئەقڵی و وەرنەگرتنی هەموو شتێك بەو پێیەی کە ئەمانە بەڵگە نەویستن و نەگۆڕن و ناکرێت قسەی تێدا بکرێت.

ئایا ئەم ئامانجانە لەگەڵ شەرعدا یەکدەگرێتەوە یان پێچەوانەن لەگەڵ شەرعدا؟

ئەوەی کە لێرەدا ڕوونە ئەوەیە ئەم ئامانجانە لەگەڵ شەرعی خودادا یەکدەگرێتەوە، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە بە ڕەهایی خۆمان ڕادەستی بیر و بۆچوونەکانیان بکەین، بەڵکو پێویستە سەر لە نوێ نەرم نەرم و بە وردی لێی بکۆڵینەوە و دوور بکەینەوە لەهەر قسەیەك کە زیادەڕەوی تێدایە، ئەم

---

[٣٩٢] ـ سورەتی ـ الرعد ـ ئایەتی: ٤.

قسەیەش گەر شتێکی زیادەڕەوی تێدابوو ئەوە حاڵەتێکی تایبەتە و لەئامانجە گەورەکەی کەم ناکاتەوە کە لەپێناویدا ئەم مەزهەبە بونیاد نراوە.

ئەوانە موعتەزیلەکانن کە لەسەردەمێکدا هاتن تیایدا یاساکان وشك هەڵهاتبوو، لەسەردەمێکدا کە بیروباوەڕی پێشینەکان لە شتە بەڵگە نەویست و نەگۆڕەکان بوو، ئەوەی قسەی تێدا کردبێت بۆ زانینی ڕاستی و دروستیان، ئەوە بە کەسێکی بێباوەڕ و کافر ناو زەتدەکرا، جا ئایا "ئەهلی عەدل و تەوحید" بەو شێوەیە بوون، یان ئەوەتا دەستە و تاقمێك بوون و درۆیان بە دەمەوە هەڵبەستراوە؟! جا بەر لەوەی بڕیار لەسەر هەر شتێك بدەیت بە باشی لەبارەیەوە بخوێنەرەوە.

کۆتاییم بە وەرگێڕانی ئەمە کتێبە هێنا لە

٢٠ / ٨ / ٢٠١٧

# سەرچاوەکان

## یەکەم: سەرچاوە کۆنەکان:


١- الإسفراييني (أبو المظفر - ت٤٧١هـ) التبصير في الدين و تمييز الفرقة الناجية عن فرق الهالكين - تحقيق محمد زاهد الكوثري - القاهرة - ١٣٥٦هـ - ١٩٤٠م.

٢- الأشعري (أبو الحسن علي بن إسماعيل الأشعري - ت ٣٣٠هـ) مقالات الإسلاميين واختلاف المصلين - تحقيق محمد محيي الدين عبد الحميد - مكتبة النهضة المصرية - ١٩٥٠م الإبانة في أصول الديانة - مطبعة الجمل المصرية - ١٣٤٨هـ.

٣- الأصفهاني (أبو الفرج علي بن الحسين بن أحمد - ت ٣٥٦هـ) الأغاني ٢١ جزءاً - القاهرة - ١٩٢٩م.

٤- البغدادي (عبدالقاهرة بن طاهر - ت ٤٢٩هـ) الفرق بين الفرق - دار الآفاق الجديدة - بيروت - ١٩٧٣م.

٥- إبن تيمية (تقي الدين أحمد بن عبدالحليم - ت ٧٢٨هـ) السياسة الشرعية في إصلاح الراعي والرعية - دار المنهاج - ٢٠٠٢م.

٦- الجاحظ (أبو عثمان عمرو بن بحر - ت ٢٥٥هـ) البيان والتبيين - تحقيق عبد السلام هارون - مكتبة الخانجي - القاهرة - ١٩٤٨ الحيوان - تحقيق عبد السلام هارون - مطبعة الحلبى - ١٩٦٥م - رسائل الجاحظ - تحقيق عبد السلام هارون - مكتبة الخانجي - ١٩٦٤م.

٧- إبن الجوزي (أبو الفرج بن علي بن محمد - ت ٥٩٧هـ) مناقب الإمام أحمد بن حنبل - مطبعة السعادة - القاهرة - ٣١٣٤٩

٨ـ إبن حزم (أبو محمد علي بن محمد ـ ت ٤٥٦هـ) الفصل في الملل والأهواء والنحل ـ القاهرة ـ ١٣٤٨هـ).

٩ـ إبن حيان (محمد بن حيان بن أحمد التميمي ـ ت ٣٥٤هـ) السيرة النبوية و أخبار الخلفاء ـ تحقيق سعد كريم الفقى ـ دار إبن خلدون ـ د. ت.

١٠ـ إبن خلكان (شمس الدين أبو العباس ـ ت٦٨١هـ) ـ وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان ـ القاهرة ١٣١٠هـ.

١١ـ الخياط (أبو الحسن عبد الرحيم ـ ت ٣٠٠هـ) الإنتصار والرد على إبن الراوندي الملحد ـ تحقيق نيبرج ١٩٢٥م.

١٢ـ الزمخشري (أبو القاسم جار الله محمود بن عمر الزمخشري ـ ت ٥٣٨ هـ ـ تفسير الكشاف ـ القاهرة ـ ١٩٦٦م.

١٣ـ السيوطي (جلال الدين عبد الرحمن بن أبي بكر ـ ت ٩١١هـ) ـ تأريخ الخلفاء ـ دار الجيل ـ بيروت ـ ١٩٩٧م.

١٤ـ الشهرستاني (أبي الفتح محمد بن عبدالكريم ـ ت ٥٤٨هـ) الملل والنحل ـ تحقيق محمد فريد ـ المكتبة التوفيقية ـ د.ت ـ نهاية الإقدام في علم الكلام ـ أكسفورد ـ ١٣٥٢هـ ـ ١٩٣٤م.

١٥ـ الطبري (أبو جعفر محمد بن جرير ـ ت ٣١٠هـ) ـ تأريخ الأمم والملوك: تحقيق محمد أبو الفضل إبراهيم ـ دار المعارف ـ ١٩٧٦م.

١٦ـ طاش كبرى زاده (أحمد بن محمد بن مصطفى ـ ت ٩٦٨هـ) ـ مفتاح السعادة ومصباح السيادة: تحقيق كامل بكري، عبد الوهاب أبو النور ـ دار الكتب الحديثة ـ القاهرة ـ ١٩٦٨م.

١٧ـ القاضي عبد الجبار (عبد الجبار بن أحمد ـ ت ٤١٥هـ)

ـ طبقات المعتزلة ـ تحقيق د. علي سامي النشار، عصام الدين محمد، طبعة مصر الأولى ـ ١٩٧٢م.

ـ شرح الأصول الخمسة ـ تحقيق د. عبد الكريم عثمان، طبعة مصر الأولى ١٩٦٥م.

ـ المحيط بالتكليف ـ تحقيق عمر عزمي ـ الدار المصرية للتأليف والترجمة ويحتوي على الأجزاء الآتية:

ج٤ (رؤية الباري) ـ تحقيق أبو الوفا الغنيمي.

ج٥ (الفرق غير الإسلامية) ـ تحقيق د. محمود محمد الخضيري.

ج٦: قسم ١ (التعديل والتجويد) ـ تحقيق د. فؤاد الأهواني.

ج٦: قسم ٢ (الإدارة) ـ تحقيق الأب جورج شحاتة.

ج٧ (خلق القرآن) ـ تحقيق إبراهيم الإبياري.

ج٨ (المخلوق) ـ تحقيق د. توفيق الطويل وسعد زايد.

ج٩ (التوليد) ـ تحقيق د. توفيق الطويل وسعد زايد.

ج١١ (التكليف) ـ تحقيق د. محمد علي النجار و عبد الحليم النجار.

ج١٢ (النظر والمعارف) ـ تحقيق د. إبراهيم مدكور.

ج١٣ (اللطف) ـ تحقيق د. أبو العلا عفيفي.

ج١٤ (الصلاح والأصلح) ـ تحقيق د. مصطفى السقا.

ج١٥ (النبوءات والمعجزات) ـ تحقيق د. محمود الخضرى، د. محمود قاسم.

ج١٦ (إعجاز القرآن) ـ تحقيق أمين الخولي.

ج١٧ (التبرعات) ـ تحقيق أمين الخولي.

ج٢٠ (في الإمامة) ـ تحقيق د. عبد الحليم محمود، د. سليمان دنيا.

١٨ـ إبن العماد الحنبلي (أبو الفلاح عبد الحي ـ ت ١٠٩٨هـ) ـ شذرات الذهب في أخبار من ذهب ـ القاهرة ـ ١٣٥٠.

١٩ـ إبن القيم الجوزية (أبو عبد الله محمد بن أبي بكر الدمشقي ـ ت ٧٥١هـ) ـ أعلام الموقعين عن رب العالمين ـ تحقيق رضوان جامع رضوان ـ مكتبة الإيمان ـ المنصورة ـ ١٤١٤هـ ـ ١٩٩٩م.

٢٠ـ إبن كثير: (عماد الدين أبو الفدا إسماعيل ـ ت ٧٧٤هـ) ـ تفسير القرآن العظيم ـ ج٤ أجزاء ـ دار الحديث ـ القاهرة ـ ١٤١٥هـ ـ ١٩٩٤م.

٢١ـ إبن المرتضى (أحمد بن يحيى ـ ت ٨٤٠هـ) ـ المنية والأمل في شرح كتاب الملل والنحل ـ طبعة حيدر آباد ـ ١٩٠٢م.

٢٢ـ المسعودي (أبو الحسن علي بن الحسين ـ ت ٣٤٦هـ) ـ مروج الذهب ومعادن الجواهر ـ تحقيق محمد محي الدين ـ دار الصاوي للطبع والنشر ـ القاهرة ـ ١٣٥٧هـ ـ ١٩٣٨م.

٢٣ـ التهانوي (محمد علي الفاروق) ـ كشاف إصطلاحات الفنون ـ الهيئة المصرية العامة للكتاب ـ ١٩٧٢م.

٢٤ـ المقريزي (تقي الدين أحمد بن علي ـ ت ٨٤٥ هـ) ـ المواعظ والإعتبار بذكر الخطط والآثار ـ طبعة بولاق ـ ١٢٧٠هـ.

٢٥ـ إبن حنبل (أبو عبد الله بن محمد بن حنبل ـ ت ٢٤١هـ) ـ الرد على الزنادقة والجهمية ـ منشأة المعارف ـ الإسكندرية ـ ١٩٧١م.

٢٦ـ مختصر الأحكام السلطانية ـ للماوردي ـ مع ترجمة فرنسية ـ د. محمد شتا ـ دار النهضة العربية ـ القاهرة ـ ١٤١٤هـ ـ ١٩٩٣م.

٢٧ـ أبو نعيم الأصفباني (أحمد بن عبدالله ـ ت ٤٢٠هـ) ـ حلية الأولياء وطبقات الأصفياء ـ طبعة الأولى ـ مطبعة السعادة ـ ١٣٥١هـ ـ ١٩٣٢م.

## دووەم: سەرچاوە تازەکان:

١ـ أحمد أمين: ـ فجر الإسلام ـ دار النهضة المصرية ـ القاهرة ـ ١٩٧٨م ـ ضحى الإسلام ـ دار النهضة المصرية ـ القاهرة ١٩٧٨م.

٢ـ أبو الوفا الغنيمي التفتازاني ـ علم الكلام وبعض مشكلاته ـ دار الثقافة الجامعية للطباعة والنشر ـ القاهرة ١٩٧٩م.

٣ـ محمد صالح الزركاني (فخر الدين الرازي وآراؤه الكلامية والفلسفية) ـ دار الفكر العربي ـ بيروت ـ ١٩٦٣م.

٤ـ جمال الدين القاسمي ـ تأريخ الجهمية والمعتزلة ـ مؤسسة الرسالة ـ بيروت ـ ١٩٨٥م.

٥ـ زهدي حسن جار الله ـ المعتزلة ـ مطبعة مصر ـ القاهرة ـ ١٩٤٧م.

٦ـ د. محمود القاسم ـ (إبن رشد الفيلسوف المفترى عليه) ـ مكتبة الأنجلو المصرية ـ د. ت.

٧ـ د. محمد أبو زهرة (أبو حنفية) ـ دار الفكر العربي ـ ط٢ ـ ١٩٤٧م.

٨ـ د. محمد بدر (الديمقراطية الأتينية وسادة القانون في التوراة والإنجيل والقرآن) ـ القاهرة ـ ١٩٩٥م.

٩ـ د. عبد المجيد محمود مطلوب (المدخل في التعريف بالفقه الإسلامي) ـ دار النهضة العربية ـ القاهرة ـ ١٤١٥هـ ـ ١٩٩٥م.

١٠ـ د. محمد فرحات ـ أصول الفقه ـ دار النهضة العربية ـ القاهرة ـ ١٩٩٨م.

# The Mu'tazila

**Salah Abu Saud**

دەستە و تاقمێکی ئیسلامییە بە دید و فیکرێکی نوێوە هاتە مەیدان.. لەپێناو عەدالەت و یەکتاپەرستی خودای گەورەدا بەرگریکرد. بەم دید و فیکرەوە کەوتە مشت و مڕ لەگەڵ نەیارەکانی ئیسلامدا و بەڵگەکانیان پوچەڵکردنەوە و ئاینی ئیسلامیشیان لەسەر ڕووی زەویدا بڵاوکردەوە، سەرباری ئەوە، بڕیار درا بەسەریاندا کە ئەوانە تاقمێکی بیدعەچی و گومڕان.. لەم کتێبەدا بە بیروباوەڕەکانی موعتەزیلە ئاشنا دەبیت، بۆ ئەوەی ببینیت و بزانیت ئایا ئەو بڕیارەی پێشوو دروست و ڕاستە یان ئەوەتا گروپێك بوون و پڕوپاگەندەیان بە دەمەوە هەڵبەستراوە؟!





لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما